# دادوەری هاوەڵان

## لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا

نووسینی
أحمد ملا قادر بوعیز

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع

ناوی کتێب: دادوەری هاوەڵان لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا

نووسینی: أحمد ملا فائق سعید

ژمارەی لاپەڕە: ٢٥٩ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٧ X ٢٤ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٥٤)ی ساڵی ٢٠١٧ی زایینی پێدراوە





چاپی یەکەم

١٤٣٨ هـ




کتێبخانەی صلاح الدين

هەولێر | فلکەی شێخ محمود | باڵەخانەی سید بهاء الدين

٠٦٦٢٢٥٤٠٢٧٦

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ [النساء: ١].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

**«أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»**(١).

وَبَعْدُ:

**لەپاش هاتنەخوارەوەی وەحی بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بە تاك و تەنیا بۆ گەیاندنی ئەو دینە لە مەککەدا، یەك بەیەکی ئەوانەی کە بوونە هاوەڵی دوارِۆژی؛ باوەڕیان پێهێنا و پشتیوانی شەو و ڕۆژی بوون بۆ گەیاندنی دینەکە، خۆیان خستە بەر لێشاوی دژایەتی و ئەشکەنجە و ئازاردانی**

---

(١) أخرجه مسلم (٨٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وابن ماجه (٤٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٠)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٧٨٥)، وأحمد في "المسند" (١٤٩٨٤)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٣١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٥٨٠٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢٤)، والمروزي في "السنة" (٧٣)، وغيرهم، وانظر "خطبة الحاجة" للألباني.

کەسوکار و قوڕەیش، تا گەیشتە ئەو ئاستەی هەڵهاتن بۆ حەبەشە و پاشان شاری مەدینە، بەو هەموو غەریبی و کەمدەستییە و دوور لە شوێن و هەموو کەس، ژیانی شاری مەدینەشیان پڕ لە ئازار و دوژمنی زۆرتر و بەرۆکگرتنی شەڕی بەدر و شەهیدبوونی حەفتا بە حەفتای شەڕی ئوحود و (بئر المعونة) و هەڵسانی هەموو دونیای ئەو سەردەمە بوو لێیان، هەر لە بێبڕواکانی قورەیش و بتپەرستەکانی چواردەور و جوولەکە ڕقلەدڵەکان بۆ لەناوبردنی هاوەڵان بە یەك دەست لە شەڕی (الأحزاب)دا ژیانی تازەیان بوو، لەلایەکی تریشەوە پیلانی دوژمنکاری دووڕووەکان و جوولەکەکانی ناو شاری مەدینە لە قەیران دروستکردنی یەك لەسەر یەك لە (حديث الإفك) و (مسجد الضرار) و سیخوڕیکردن بۆ دوژمنە دەرەکییەکان؛ کاری شەو و ڕۆژیان بوو دژ بە هاوەڵان، سەرباری نەبوونی و کەمدەستی و بێلانەییان ... .

لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ڕووداوی هەڵگەڕانەوەی هەموو شوێنێك لەو دینە دەستی پێکرد، بێجگە لە شاری مەککە و مەدینە نەبێت، وە ئەرکی ئەم قۆناغە هەستیارەش کەوتە ئەستۆیان، بەڵام بە کاملی خۆیان و ئیمان و بەرنامەی تەواویان؛ توانیان زاڵ بن بەسەریاندا و بۆ جارێکی تر ئەو بەربەستانە بشکێننەوە کە لە ڕێی گەیاندنی ئەم دینەدا بۆیان دروست بوو.

لەگەڵ فراوانبوونی ڕووبەر و پانتایی ئیسلام بە (فتوحات)ەکانیان و هاتنەناوەوەی هەموو جۆرە گەلێکی دونیا بۆ ئەم دینە، بەدوای خۆیدا کۆمەڵێك کێشە و ڕووداو و بیروڕای جیاوازی هێنایە ڕێی هاوەڵان، کە بوونە هۆی قوربانیدان و شەهیدبوونیان لەسەر دەستی دوژمانیان، هەر لە (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه بە دەستی (أبو لؤلؤة المجوسي) و (عثمان بن عفان) رضي الله عنه بە پیلانی (عبد الله بن سبأ اليهودي) و (علي بن أبي طالب) رضي الله عنه بە دەستی (ابن ملجم الخوارجي) و هەتا دوایی.

وە تەنانەت لە سەردەمی نەوەکانیشیاندا شاری پایتەختی هاوەڵان و گۆڕەکانیان لە (بقيع)دا و چەند صەحابەیەکی بەتەمەن؛ پارێزراو نەبوون لە ستەمی (حەجاج)ی خوێنڕێژ، کە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کوشتوبڕی کرد لە مەدینەدا، لەو کاتەدا (جابر بن عبد الله) رضي الله عنه لە کۆتایی تەمەنیدا نابینا بوو، هەواڵی پرسی کە کێیە ئەم کارە دەکات، پاشان وتی: «سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: " مَنْ أَخَافَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ، فَقَدْ أَخَافَ مَا بَيْنَ جَنْبَيَّ " »[1].

(١) رواه أحمد في "المسند" (١٤٨١٨)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٣٠٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٩٧٨)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (١٢١٣).

واتە: بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی شاری مەدینە بترسێنێت، ئەوا ئەوەی کە لە نێوان دووشانەی مندایە ترساندوویەتی، (واتە: دڵی پێغەمبەری ﷺ ترساندووە).

بەڵکوو (عبد الله بن الزبیر) ﷺ و (سعید بن الجبیر)یشی ﷺ شەهید کرد و بە دەسیسەی ئەویش (عبد الله بن عمر) رضي الله عنهما بریندار کرا تا وەفاتی کرد.

لەپاش نەمانی هاوەڵان لەسەر ڕووی دونیادا، دەرگای تاقم و فیرەقە گومڕاکان کرایەوە و یەکەم کاریان لێدانی کەسایەتی هاوەڵان بوو، پاشان بەرنامە و کاریان لەسەری.

هەر لە خەوارج و ڕافیزەکانەوە بەناوی (الإیمان والکفر، الکبار الذنوب ...) بڕیاری هەڵگەڕانەوەیان دا بەسەر هاوەڵاندا و ستەم و زوڵم و تاوانە گەورەکانیان خستە ئەستۆیان و بەم هۆکارەشەوە لە ئیمان دەریان کردن.

وە فیرەقە کەلامییەکانیش وەکوو موعتەزیلە و قەدەرییەکان، لەژێر ناونیشانی (منزلة بین منزلتین)، کە یەکێکە لە بنەما دینییەکانیان، بڕیاری (کەوتنە نێوان ئیمان و کوفر)یان دا بەسەریاندا، کە پێی دەوترێت (الفسوق)، واتە تاوانباربوون، کە ئەمەش ئاستێکە نەك شایستەی ئەوە نین کە دینیان لێ وەربگیرێت؛ بەڵکوو شایەتی دونیاییشیان لێ وەرناگیرێت، وەك (عمرو بن عبید)ی سەرانی موعتەزیلە کە دەیوت: «لَوْ شَهِدَ عِنْدِي عَلِيٌّ وَعُثْمَانُ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ عَلَى شِرَاكِ نَعْلٍ؛ مَا أَجْزَتُ شَهَادَتَهُمْ»[١].

واتە: ئەگەر (علي وعثمان وطلحة والزبیر) شایەتی لای من بدەن لەسەر پاژنەی نەعلێك، شایەتییان لێ وەرناگرم.

وە تەنانەت هاوەڵانیان بە کەسانی نەخوێندەوار و دەشتەکی ناو دەبرد، وەکوو (عمرو بن عبید) دەیوت: «كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ حَشْوِيًّا»[٢].

واتە: (عبداللە ی کوڕی عومەر) رضي الله عنهما ڕەشۆکییە، واتە بە سەرزارەکی لە دین گەیشتوون و

---

(١) "الاعتصام" للشاطبي (١/ ١٥٨)، و "المنتظم" لابن الجوزي (٨/ ٦٢)، و "الكامل في ضعفاء" لابن عدي (٦/ ١٨٠)، و "تأريخ بغداد" للبغدادي (١٤/ ٧٧)، و "ميزان الاعتدال" للذهبي (٣/ ٢٧٥).

(٢) "بيان تلبيس الجهمية" لابن تيمية (٢/ ١٢٨)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٢/ ١٧٦)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٥٢٠)، و "شذرات الذهب" لابن العماد الحنبلي (١/ ٢١١)، و "معجم المناهي اللفظية" لبكر أبو زيد ص٢٢٨.

هیچ زانیارییەکیان پێنییە.

ئەمە لە ڕووی کەسایەتییانەوە، وە لە ڕووی بەرنامەیانەوە سەردێڕێکی پێناسەیی بەناو زانستییان تۆمار کرد بۆیان بەناوی «طَرِيقَةَ السَّلَفِ أَسْلَمُ، وَطَرِيقَةَ الْخَلَفِ أَعْلَمُ وَأَحْكَمُ»[(١)].

واتە: بەرنامە و ڕێگە زانستییەکانی هاوەڵان هۆکاری سەلامەتییە، بەڵام ڕێگە و بەرنامەی پاشکۆی ئەوان زانستیتر و تۆکمەترە.

واتە هاوەڵان زانست و زانیاری و شارەزایی قووڵ و تەواویان نەبووە لە دیندا، بە ڕووکەش و سەرزارەکی وەریان گرتووە، بۆیە ئەم شێوازە مایەی سەلامەتییە، بەڵام تێگەیشتن و زانستی تاقم و فیرەقە کەلامییە گومڕاکان زانستیترە.

وە بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو بە ناونیشانی (خبر الآحاد) ڕێگەیەکی تریان هێنایە دی بۆ لێدانی هاوەڵان و گومان دروستکردن لەسەریان، بەڵێ زۆر ڕاستە (توحيد وعقيدة)ی هاوەڵان بووە (عقيدة المعتزلة والجهمية والأشعري والماتريدي ...)، وە ڕێڕەوی فیقهی هاوەڵان بووە مەزهەبی ئیمامەکان، وە ئاداب و سلوکیات و عیبادەت و زوهدی هاوەڵان بووە (طريقة النقشبندي وقادری وبدوي وسهروردي ...)، وە تەفسیری هاوەڵان بووە (إسرائيليات) و ڕاوبۆچوونی عەقڵی ڕیوایەتە (موضوع)ەکان، وە کاری بانگخوازی و (دعوة)ی دینداری هاوەڵان بووە گرووپ و تاقم و حیزبایەتی جیاجیا ...، بەڵام قسەی فەیلەسووف و ئیمامەکانیان و ناودارەکانیان (خبر الآحاد) نییە، بەڵکوو شوێنی دڵنیایی و متمانە و بنەمای تەواوی ئەو دینەیە، کە دەبێت دەقەکان لەسەریان وەربگیرێت و شیبکرێتەوە، کەواتە یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی کۆدەنگی کۆی فیرەقە گومڕاکان لێدانی هاوەڵانە و شێواندنی بەرنامەیانە، بۆیە ناونیشانی ئەهلی سوننەت وەکوو ئیمامی (البربهاري) رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ دەڵێت: «إذا رأيت الرجل يحب أبا هريرة وأنس بن مالك وأسيد بن حضير، فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله»[(٢)].

واتە: خۆشەویستی هاوەڵانی وەك: (ئەبو هورەیرە و ئەنەس ...) نیشانەی خاوەن ڕێڕەوی

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٥/٨)، و "درء تعارض العقل والنقل" لابن تيمية (٥/٣٧٨)، "لوامع الأنوار البهية" للسفاريني (١/ ٢٥)، و "فتح رب البرية" للعثيمين ص٢٤.

(٢) "شرح السنة" للبربهاري (١٣٣).

سوننەت و گەیشتنەوەیە بە پێغەمبەر ﷺ.

هاوەڵان: زانایانی ئەم ئوممەتەن و شاهیدحاڵی هاتنەخوارەوەی وەحی و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی پێغەمبەرەکەین ﷺ، خاوەن قەریحە و ڕەوانبێژی و زمانپاراوی تایبەتی شێوازی قورئان و فەرموودەن، بە شێوەیەك هیچ چینێکی دوای خۆیان ناگەنە ئاستی ئەوان.

هاوەڵان: هۆکار و شایەتی گەیاندنی قورئان و فەرموودەن، تانەدان لێیان؛ تانەدانە لە بنەماکانی دین و مەبەست بەتاڵکردنەوەیەتی، وەکوو (أبو زرعة الدمشقي) رحمه الله دەڵێت: «وَإِنَّمَا أَدَّى إِلَيْنَا هَذَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَنَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَإِنَّمَا يُرِيدُونَ أَنْ يُجَرِّحُوا شُهُودَنَا لِيُبْطِلُوا الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ»(١).

واتە: ئەوەی کە قورئان و فەرموودەی پێگەیاندووین هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، وە مەبەستیش لە بریندارکردنی شایەتەکانمان؛ بۆ ئەوەیە کە قورئان و فەرموودە بەتاڵ کەنەوە.

وە شایەتی ڕاستی ئەم قسەیەش دانپیانانی یەکێکە لە سەرانی گومڕایان، بەناوی ( "شاکر" رأس الزنادقة) کە دەڵێت: «فإنا نريد الطعن على الناقلة، فإذا بطلت الناقلة أو شك أن نبطل المنقول»(٢).

واتە: مەبەستی تانەدانی ئێمە لە هەڵگرانی بۆ ئەوەیە کە ئەوەی پێیانە لە قورئان و فەرموودە بەتاڵ بێتەوە.

وە هاوەڵان شایەت و (إقامة الحجة)ی گەیاندنی ئەو دینەن بۆ دوای خۆیان، گەر کەسایەتی ئەوەیان تیادا نەبێت؛ ئەوا گەیاندنی دین شوێنی گومانە و نەگەیەندراوە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ شاهیدحاڵی سەر ئەوانە، کە خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێت: ﴿وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ٤١﴾ [النساء: ٤١]، ئەوا ئەوانیش شاهیدحاڵی سەر ئەم ئوممەتەن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص٤٩، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣٨/ ٣٣)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (١٩/ ٩٦)، و "الإصابة" لابن حجر (١/ ٢٢).

(٢) "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (٥/ ٥٠٤) برقم (٢٣٦٦).

پێیان دەفەرموێت: «أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الغَائِبَ»(١).

وە قسەوتن پێیان قسە وتنە بە پێغەمبەر ﷺ، وەکوو ئیمامی (مالك) رحمه الله دەڵێت: «إِنَّمَا طَعَنُوا فِي أَصْحَابِهِ لِيَقُولَ الْقَائِلُ رَجُلُ سُوءٍ كَانَ لَهُ أَصْحَابُ سُوءٍ، وَلَوْ كَانَ رَجُلًا صَالِحًا لَكَانَ أَصْحَابُهُ صَالِحِينَ»(٢).

واتە: ویستی ئەوانە لێدانی پێغەمبەر ﷺ بوو، بەڵام بۆیان نەکرا، قسەیان بە هاوەڵانی وت، بۆ ئەوەی بڵێن: کەسێکی خراپ بوو، گەر کەسێکی چاك بوایە ئەوا هاوەڵەکانی چاك دەبوون، «الْمَرْءُ عَلَى دِيْنِ خَلِيْلِهِ».

هاوەڵان: تا کۆتا کەسیان لەسەر دەستیان کەمترین (شرك وبدعة) و لادان و گرووپ و دووبەرەکایەتی دینی دروست نەبووە، پاش ئەوان ئەو هەموو فیرەق و بیدعە و گومڕاییانە دروست بوون، لەسەر وادەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: «وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي»(٣).

واتە: مانەوەی هاوەڵانم نیشانەی سەلامەتی و پارێزراوی گەلەکەمە.

وە هیچ پێغەمبەرێك نییە کە خاوەنی وەها هاوەڵانێك بێت بەو چۆنییەتییەی هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، لەڕووی خۆبەخشین و جیهادکردن لەپێناوی گەیاندنی ئەو دینە، هەموو هاوەڵانی (نوح ولوط وعیسی ...) عليهم السلام ئاشکرایە کە تەنها بەشیان خۆپاراستن و ڕزگاربوون بووە لە

---

(١) رواه البخاري (١٠٥)، ومسلم (١٦٧٩)، والنسائي في "الكبرى" (٤/ ١٨٩)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٢٩٧٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٨٤٨)، وأحمد في "المسند" (٢٠٣٦)، والدارمي في "سننه" (١٩٥)، والحاكم في "المستدرك" (٥٩٨٢)، والبزار في "المسند" (٣٦١٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٥٨٩)، والطبراني في "الكبير" (٣٥٧٢)، وفي "الأوسط" (٩٦٣)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٢٦٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٩٦١٤)، وفي "الشعب" (٥١٠٢)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١٠٥٢)، والبغوي في "شرح السنة" (١٩٦٥).

(٢) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٨٠، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٤٢٩)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٧/ ٤٥٩)، و "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٤/ ١٤٠٥).

(٣) رواه مسلم (٢٥٣١)، وأحمد في "المسند" (١٩٥٦٦)، وأبوبكر بن الخلال في "السنة" (٧٧٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٤٩)، والبزار في "المسند" (٣١٠٢)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٦١)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣١٨، والآجري في "الشريعة" (١١٥٥).

بێبڕوایان، تەنانەت هاوەڵانی (موسا) عليه السلام کە ژمارەیان زۆر بووە دەیانوت: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ [المائدة: ٢٤].

واتە: ئەی (موسا) بڕۆ خۆت و خوای خۆت لەگەڵیان بجەنگێن.

بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەیانوت: «لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لَأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا»[(١)]، وفي رواية: «وَاللهِ لَا نَكُونُ كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ لِمُوسَى: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾»[(٢)].

واتە: سوێند بە خوا ئێمە وەکوو (بەنی ئیسرائیل) ناکەین کە بە (موسا)یان وت: بڕۆ خۆت و خواکەت شەڕ بکەن، ئەگەر فەرمانمان پێبدەیت بدەین بە دەریادا، پیایدا دەدەین، وە گەر فەرمانمان پێبکەیت بە بیاباندا؛ دەگەینە (برك الغماد)، کە شوێنێکە لە ئەوپەڕی یەمەنە.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ داواکاری و گەڕانەوەیان نەبووە بۆ هاوبەش بڕیاردان وەکوو هاوەڵانی (موسا) عليه السلام، کە وتیان: ﴿قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ﴾ [الأعراف: ١٣٨]، ئەوە بوو لە کۆتاییشدا تا (موسا) عليه السلام لەدوای چل ڕۆژەی کێوی (طور) گەڕایەوە: ﴿وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِن بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ﴾ [الأعراف: ١٤٨].

واتە: وتیان خوایەکمان بۆ دروست بکە وەکوو چۆن ئەوان هەیانە، وە لەپاش خۆی گوێرەکەیەکیان دروست کرد و دەیانپەرست.

یاخود وەکوو حەوارییەکانی (عیسا) عليه السلام داواکاری تایبەتیان هەبێت بۆ دڵنیابوون و ڕەوینەوەی گومان: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ ۖ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا

---

(١) رواه مسلم (١٧٧٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٢٢)، وأحمد في "المسند" (١٣٢٩٦)، والحاكم في "المستدرك" (٥١٠٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٧٠٨).

(٢) رواه النسائي في "الكبرى" (٨٣٤٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٢١)، وأحمد في "المسند" (١٢٠٢٢)، وفي "فضائل الصحابة" (١٤٣٨)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، ورواه أبو يعلى في "مسنده" (٣٧٦٦).

﴿وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣﴾ [المائدة : ١١٢، ١١٣].

واته: حەوارییەکانی (عیسا) ﵇ وتیان: ئایا خواکەت سفرە و خوانێکمان بۆ دێنێتە خوارەوە تا لێی بخۆین و دڵنیایی دڵیمان بۆ دروست بێت و ڕاستی ئەوەی کە بۆت هاتووە بۆمان دەرکەوێت و ببینە شایەتدەر بۆ دوای خۆت!

وە تەنانەت گەلەکەیان ئینجیل و تەوراتیان کردە چەندەها جۆر و ناوی خۆشیانیان لێنا، وەکوو (إنجیل لوقا، إنجیل متی ویوحنا ...).

بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ خاوەنی بەرزترین پلەی متمانە و دڵسۆزی و ئیمانی تەواو بوون لە خزمەتی ئەو دینەدا، بۆیە خوای گەورە وەسفیان دەکات بە ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران : ١١٠]. باشترین گەلانن لەناو خەڵکیدا.

وە لەبەر نەبوونی هاوەڵانێکی وەکوو هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، هیچ پێغەمبەرێك خاوەنی فەرموودە و مانەوەی کار و کردەوەکانی نییە لەناو گەلانیدا، وەکوو پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کە هەردەم زیندووە و لە ژیاندایە لەگەڵ ئوممەتەکەی، بە هۆکاری گواستنەوە و گێڕانەوەی وورد و درشتی کار و کردەوە و فەرموودەکانی، لە بچووکترین کارییەوە تا گەورەترین کار و گوفتاری، هیچ شتێکی لە گەلەکەی ون نەبووە، ئەوەش بە هۆکاری هاوەڵانی پایەبەرزییەوەیە.

بۆیە بەرنامە و جۆری تێگەیشتنی دینی هاوەڵان پاش خۆیان بووە ناونیشانێکی ڕەسەنی تایبەتی دینی بۆ دوور لە هەموو لادان و گومڕایی و تێکەڵبوونی هەواوئارەزوویەکی ئادەمیزادی، وە گەیشتنەوە سەر مەبەستە تەواو و دروستەکانی قورئان و فەرموودە، بە هۆکاری وەرگرتنی ڕاستەوخۆی هاوەڵان لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەو بەرنامەیەش لەناو زانایاندا ناسراوە بە (منهج السلف الصالح)، کە پاش خۆیان بووە ڕێڕەوێك و قوتابخانەیەك چیناوچین دەگوازرایەوە بۆ دوای خۆیان، وەکوو پشتاوپشتێکی نەپچڕاو بۆ گەیشتنەوە بە هاوەڵان و لەوانیشەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

تێڕوانین و بەرنامەی ئەهلی سوننەت سەبارەت بە هاوەڵان دوورە لە هەموو زیادەڕەوی و کەمڕەوییەك، لەبەر بوونی بنەما و بەرنامەیەکی پڕ زانستی و لەخۆگری دادوەری لە هەموو شیکاری و بوارێکی دینیدا، بۆیە کە بە کەسانێکی ئاسایی و سادە سەیرناکرێن و زیادەڕەوییشیان تیادا ناکرێت، بەجۆرێك کە بگەیەنرێنە پلەی (معصوم)بوون، واتە بێ هەڵە و کەم و کورتی،

بەڵكوو پلەوپایە دینییە زانستییەكەیان دەیانخاتە ئاستێك كە پێیان دەوترێت دادوەری هاوەڵان (عدالة الصحابة)، واتە بە پلەی زانا و ساڵحە كامڵەكانی ئەم ئوممەتە هەژمار دەكرێن لەپاش پێغەمبەر ﷺ، كە هیچ كەسێك ناگاتە ئاستیان.

وەك (ابن تیمیة) رحمه الله دەڵێت: «وَهُمْ مَعَ ذَلِكَ لَا يَعْتَقِدُونَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْ الصَّحَابَةِ مَعْصُومٌ عَنْ كَبَائِرِ الْإِثْمِ وَصَغَائِرِهِ؛ بَلْ تَجُوزُ عَلَيْهِمْ الذُّنُوبُ فِي الْجُمْلَةِ وَلَهُمْ مِنْ السَّوَابِقِ وَالْفَضَائِلِ مَا يُوجِبُ مَغْفِرَةَ مَا يَصْدُرُ مِنْهُمْ إنْ صَدَرَ حَتَّى إنَّهُ يُغْفَرُ لَهُمْ مِنْ السَّيِّئَاتِ مَا لَا يُغْفَرُ لِمَنْ بَعْدَهُمْ لِأَنَّ لَهُمْ مِنْ الْحَسَنَاتِ الَّتِي تَمْحُو السَّيِّئَاتِ مَا لَيْسَ لِمَنْ بَعْدَهُمْ وَقَدْ ثَبَتَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ "إنَّهُمْ خَيْرُ الْقُرُونِ" ، "وَإِنَّ الْمُدَّ مِنْ أَحَدِهِمْ إذَا تَصَدَّقَ بِهِ كَانَ أَفْضَلَ مِنْ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا مِمَّنْ بَعْدَهُمْ" ، ثُمَّ إذَا كَانَ قَدْ صَدَرَ مِنْ أَحَدِهِمْ ذَنْبٌ فَيَكُونُ قَدْ تَابَ مِنْهُ أَوْ أَتَى بِحَسَنَاتِ تَمْحُوهُ أَوْ غُفِرَ لَهُ بِفَضْلِ سَابِقَتِهِ أَوْ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي هُمْ أَحَقُّ النَّاسِ بِشَفَاعَتِهِ أَوْ اُبْتُلِيَ بِبَلَاءِ فِي الدُّنْيَا كَفَّرَ بِهِ عَنْهُ. فَإِذَا كَانَ هَذَا فِي الذُّنُوبِ الْمُحَقَّقَةِ فَكَيْفَ بِالْأُمُورِ الَّتِي كَانُوا فِيهَا مُجْتَهِدِينَ: إنْ أَصَابُوا فَلَهُمْ أَجْرَانِ وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَهُمْ أَجْرٌ وَاحِدٌ وَالْخَطَأُ مَغْفُورٌ لَهُمْ؟ ثُمَّ الْقَدْرُ الَّذِي يُنْكَرُ مِنْ فِعْلِ بَعْضِهِمْ قَلِيلٌ نَزْرٌ مَغْمُورٌ فِي جَنْبِ فَضَائِلِ الْقَوْمِ وَمَحَاسِنِهِمْ مِنْ الْإِيمَانِ بِاَللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ وَالْهِجْرَةِ وَالنُّصْرَةِ وَالْعِلْمِ النَّافِعِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ وَمَنْ نَظَرَ فِي سِيرَةِ الْقَوْمِ بِعِلْمِ وَبَصِيرَةٍ وَمَا مَنَّ اللهُ بِهِ عَلَيْهِمْ مِنْ الْفَضَائِلِ عَلِمَ يَقِينًا أَنَّهُمْ خَيْرُ الْخَلْقِ بَعْدَ الْأَنْبِيَاءِ لَا كَانَ وَلَا يَكُونُ مِثْلُهُمْ وَأَنَّهُمْ هُمْ الصَّفْوَةُ مِنْ قُرُونِ هَذِهِ الْأُمَّةِ الَّتِي هِيَ خَيْرُ الْأُمَمِ وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ تَعَالَى»[1].

واتە: ئەهلی سوننەت لەگەڵ ئەوەی كە باوەڕیان وانییە هەریەكێك لە هاوەڵان پارێزراو بن لە تاوانی گەورە و بچووك، بەڵكوو دەشێت بە گشتی تووشی تاوان بن، لەگەڵ ئەوەشدا پێشینەیەكی پڕ چاكە و خێریان هەیە، كە دەبێتە هۆكاری سڕینەوەی ئەو شتانەی گەر لەسەریان كەوتبێت، وە ئەو كارانەشیان كە بووەتە ڕەخنە لەسەر هەندێكیان زۆر كەمە و نقوم بووە لە چاكە

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ١٥٥، ١٥٦).

و ئیمانی تەواویان بە خوا و پێغەمبەرەکەی و جیهادکردن و کۆچکردن و سەرخستنی دینەکەی و زانست و کردەوەی چاکەیان، ئەو کەسەی کە بە چاوێکی زانستی و کراوەوە بڕوانێتە ژیاننامەیان؛ دڵنیا دەبێت لە پلەوپایەی بەرزیان، کە باشترین کەسانی پاش پێغەمبەرانن و نەبووە و نابێتەوە هاوشێوەیان، وە هەڵبژێردراوی پوختی سەدەکانی ئەم ئوممەتە پڕخێر و بەرێزەی لای خوان.

ڕەخنەگرتن و تانەدان لێیان بە هەڵگرتنی ئەو کارانەی کە سروشتی ئادەمیزادە لە هاوەڵاندا، بەبێ هیچ خوێندنەوە و پەیوەستبوونێکی سنوورداری یاسا دینییەکان و دەقە شەرعییەکان؛ ئەوە: «التعويل على البحث العلمي بدون قيود وضوابط هي طريقة المستشرقين الذين لا يلتزمون بدين»[(١)].

واتە: شێوازی بەناو توێژینەوە زانستییەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکانە، کە هیچ پابەندبوون و پەیوەستبوونێکیان نییە، وە خۆشیان خاوەنی هیچ دینێك نین.

وە قسەپێوتنیان هیچ زیانێك بەوان ناگەیەنێت، بەڵکوو بە خاوەنەکەی دەگەیەنێت، لەبەر بەریبوونیان لەو توانج و تۆمەتانە.

وە گەر پایەبەرز نەبوونایە بەڵاکانیان قورس نەدەبوو، کە بە درێژایی چەندەها سەدەیە قسە و تانەیان لێ دەدرێت، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «أَشَدُّ النَّاسِ بَلَاءً الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ»[(٢)].

واتە: خاوەن قورسترین بەڵا پێغەمبەرانن، پاشان هاوشێوەکانیان.

---

(١) "الانتصار للصحابة الأخيار" لعبد المحسن العباد ص١٢٤.

(٢) رواه أحمد في "المسند" (١٤٨١)، والدارمي في "السنن" (٢٨٢٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٩٠١)، والطيالسي في "مسنده" (٢١٢)، والحاكم في "المستدرك" (١٢١)، وابن نصر في "المنتخب" (١٤٦)، والشاشي في "المسند" (٦٩)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤٣٤)، والبيهقي في "الشعب" (٩٣١٨)، وفي "السنن الكبرى" (٦٥٣٤)، و"الآداب" (٧٣٠)، وضياء الدين في "المختارة" (١٠٥٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/٣٦٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٢٠٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٤٣)، و"صحيح الجامع الصغير" (٩٩٢)، و"صحيح الترغيب والترهيب" (٣٤٠٢).

وە خوای پەروەردگار ویستی وایە ئەوان کە لە دونیا دەرچوون بەڵام پاداشتیان لە دونیا نەپچڕێت: «فَلَمْ يُحِبَّ اللهُ أَنْ يَقْطَعَ عَنْهُمُ الأَجْرَ»[١]. بەردەوام توێشووی دوارِۆژیان زیاد بێت.

وە بەڵای قورسیش شایستەی پایەبەرز و بڵندەکانە، وەکوو ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت:

وَفِي السَّمَاءِ نُجُومٌ لاَ عَدادَ لَهَا ... وَلَيْسَ يكسف إلاَّ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ[٢]

واتە: لە ئاسماندا ئەستێرەکان بێ ژمارەن، لەگەڵ ئەوەشدا خۆر و مانگ نەبێت ناگیرێن.

اللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ

  



أحمد ملا فائق سعيد

١٩ / رَجَب / ١٤٣٨ هـ

١٦ / ٤ / ٢٠١٧ م - الأحد

سلێمانی

---

(١) "مسند عائشة" للسيوطي ص١٦٤، و "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (١٣/ ١٥١) برقم (٦٠٠٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٤/ ٣٨٧)، و "جامع الأصول" (٩/ ٤٠٨)، و "المشيخة البغدادية" للأصبهاني (٥٢).

(٢) "ديوان الشافعي" ص٢٨٧.

# بەشی یەکەم

## ئایەتە قورئانییەکان لەسەر دادوەری هاوەڵان

## (الآيات القرآنية على عدالة الصحابة)

**ئایەتی یەکەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ [الفتح: ١٨].

واتە: خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات بە پلەوپایە و بەزەیی خۆی، بەوەی ڕازی بووە لەو ئیماندارانەی کە پەیمانیان داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵیدا شەڕ بکەن دژ بە موشریکەکان تاوەکوو مردن، کە بەم پەیمانە دەوترێت (بيعة الرضوان) یان (بيعة الشجرة)، واتە: پەیمانی ڕازیبوون[1].

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەم خاڵە گرنگانە:

یەکەم: موژدەی ڕازیبوونی تەواو (رضي الله) لە لایەن خواوە بۆ کەسانێکە کە متمانەی "مانەوە لە ڕازیبوونی خوایی و دەرنەچوون لێی" تا کۆتایی تەمەن بێت.

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «والرضى من الله صفة قديمة، فلا يرضى إلا عن عبد علم أنه يوافقه على موجبات الرضى، ومن رضي الله عنه لم يسخط عليه أبدا ... وقد ثبت في الصحيح عن النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم أنه قال: "لا يدخل النار أحد بايع تحت الشجرة" ... وأيضا فكل من أخبر الله أنه رضي عنه فإنه من أهل الجنة، وإن كان رضاه عنه بعد إيمانه وعمله الصالح، فإنه يذكر ذلك في معرض الثناء عليه والمدح له، فلو علم أنه يتعقب ذلك ما يسخط

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٩٣.

الرب لم يكن من أهل ذلك»[١].

واتە: سیفەتی ڕازیبوون (الرضى) بۆ خوا ﷻ بەردەوامییە و ئەزەلییە، وە خوای پەروەردگار ڕازی نابێت لە بەندەیەك مەگەر خۆی زانا بێت بەسەریدا کە هەموو پێویستییەکانی ڕازیبوونی تێدا بێت و تووڕەبوون بە هیچ شێوەیەك نەیگرێتەوە ... وە هەرکەسێك خوای پەروەردگار هەواڵی دا کە لێی ڕازییە؛ ئەوە بەهەشتی یە، گەرچی ڕازیبوونەکە دەکەوێتە پاش ئیمانهێنان و کردەوەی چاکەوە، وە هەواڵدانیش پێی لە ئاست و شوێنی وەسفدایە، وە زانایە بەوەی گەر بەندەیەك دوای وەسفکردنەکەی کارێك دەکات کە لە ڕازیبوونی خوا دەردەچێت؛ ئەوا وەسفی نەدەکرد بە ڕازیبوون لێی، کەواتە خوای پەروەردگار زانا بووە بەوەی ئەو هاوەڵانە چی دەکەن و چۆن دەبن تا مردن، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لێیان ڕازییە، وە لە ڕازیبوون دەرناچن، ئەمە کۆتا وەسفی کامڵیانە و هەرچی دەربارەیان بڵێن و وترابێت ئەوا لەکەدارکردنیان بەو شێوەیە نەبووە و شیا و نییە بۆیان بە (تزكية)ی ئەم ئایەتە.

هەر بۆ ئەم هەواڵەیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا يَدْخُلُ النَّارَ، إِنْ شَاءَ اللهُ، مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَحَدٌ، الَّذِينَ بَايَعُوا تَحْتَهَا»[٢].

واتە: ناچنە ئاگرەوە بە ویستی خوا، ئەوانەی پەیمانیان دا لەژێر درەختەکەدا.

(ابن القيم) ﷺ دەڵێت: «أَن هَذَا خطاب لقوم قد علم الله سُبْحَانَهُ أَنّهم لَا يفارقون دينهم بل يموتون على الْإِسْلَام»[٣].

واتە: ئەم جۆرە دەربڕینە بۆ کەسانێکە خوای پەروەردگار زانایە بەسەریاندا کە لە دینەکەیان جیا نابنەوە تا مردن.

واتە کارێك ناکەن پێی دەرچن لە ئیسلام، ئەمە بۆ ئەوان متمانەی خواییەو پاراستنی تایبەتییە.

هاوەڵان لە دونیادا پێیان دراوە، بەڵام موسوڵمانان بە گشتی لە بەهەشتدا پێیان دەدرێت.

---

(١) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٧٢ – ٥٧٣.

(٢) رواه مسلم (٢٤٩٦)، والنسائي في "الكبرى" (١١٢٥٩)، وأحمد في "المسند" (٢٧٣٦٢)، والطبراني في "الكبير" (٢٦٩)، والفاكهي في "أخبار مكة" (٢٨٧٣).

(٣) "الفوائد" لابن القيم ص١٦.

لە پاش هەموو شتێك خوای پەروەردگار لە فەرموودەیەكی قودسیدا دەفەرموێت: «... أَلاَ أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، فَيَقُولُونَ: يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ، فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا»(١).

واتە: ئایا لە بەهەشت باشترتان بدەمێ؟ وتیان: چ شتێك هەیە لەو باشتر؟ خوای پەروەردگار فەرمووی: پێبەخشینی ڕازیبوونی من، كە بە هیچ شێوەیەك لە پاش ڕازیبوون لێیان توورە نەبم.

وە پێغەمبەریش ﷺ یەكێك لە دوعاكانی فەرموویەتی: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سُخْطِكَ»(٢).

واتە: خوای پەروەردگار پەنا ئەگرم بە ڕازیبوونی تۆ لە توورەبوونت.

وە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾ [التوبة: ٧٢].

واتە: ڕازیبوونی خوا ﷻ لە هەموو شتێك گەورەترە.

دووەم: وەسفكردنیان بە ئیماندار (مؤمن)، كە ئەمە بۆخۆی وەسفێكی ئیمانییە و لەپاش پلەی یەكەمەوە دێت كە ئەویش موسوڵمان (مسلم) بوونە، كە بریتییە لە (شهادتین و نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەكات).

وە ئیمانیش بریتییە لە: «أَنْ تُؤْمِنَ بِالله، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»(٣).

---

(١) رواه البخاري (٦٥٤٩، ٧٥١٨)، ومسلم (٢٨٢٩)، والنسائي في "الكبرى" (٧٧٠٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٤٤٠)، وابن منده في "الإيمان" (٨١٩)، وابن مبارك في "الزهد" (٢/ ١٢٩).

(٢) رواه مسلم (٤٨٦)، وأبو داود (١٤٢٧) واللفظ له، والترمذي (٣٥٦٦)، والنسائي في "الكبرى" (١٥٨)، وابن ماجه (١١٧٩)، وأحمد في "المسند" (٧٥١)، وابن خزيمة في "صحيحه" (٦٥٥)، وابن حبان في "صحيحه" (١٩٣٣)، ومالك في "الموطأ" (٣١)، والدارقطني في "السنن" (٥١٥)، والحاكم في "المستدرك" (١١٥٠)، والبزار في "المسند" (٢٠٩٢)، والبيهقي في "الشعب" (٣٥٥٧).

(٣) رواه مسلم (٨)، وأبو داود (٤٦٩٥)، والترمذي (٢٦١٠)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨٥٢)، وابن ماجه (٦٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٦٨)، والبزار في "المسند" (١٦٩)، والطبراني في "الكبير" (١٣٥٨١)، وابن بطة في "الإبانة" (٨٢٧)، =

باوەڕبوون بە بوارە غەیبییەکان و دامەزراوی لەسەری.

وەکوو عەرەبە لادێییەکان هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ، وا دەریان دەبڕی کە ئیماندارن، خوای پەروەردگار بەرپەرچی دانەوە و فەرمووی: ﴿قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤﴾ [الحجرات: ١٤].

واتە: عەرەبە لادێییەکان دەڵێن ئیمانمان هێناوە، پێیان بڵێ ئیمانتان نەهێناوە، بەڵکوو موسوڵمان بوون، هێشتا ئیمان نەچووەتە دڵتانەوە ... .

ئەمە لە ئایەتەکەدا هێمایە بۆ ئەوەی: من بۆیە لێیان ڕازیم لەبەر ئەوەی ئیماندارن و دامەزراون و شایستەی ئەو ڕازیبوونەن.

سێیەم: ﴿إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ ئەم ڕازیبوون و وەسفکردنە ئیمانییە تایبەتە بە خاوەنی ئەو ڕووداوەوە کە ڕێککەوتننامەی حودەیبییە (صلح الحديبية)ی لێکەوتەوە، کە ئەوانیش ژمارەیان وەکوو (جابری کوڕی عبدالله) ﷺ دەڵێت: «كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ»[(١)].

واتە: ئێمە لە ڕۆژی حودەیبییەدا هەزار و چوارسەد کەس بووین.

وە کۆی هاوەڵان و ناودارەکان و (خلفاء الراشدين) و (المهاجر والأنصار) کۆچەرییەکان و مەدینەییەکانی تێدایە، ئەوانەی کە ڕافیزە و خەواریج و موعتەزیلەکان قسەیان پێ دەڵێن.

چوارەم: وەسفی ناوەڕۆك و دڵییان دەکرێت (تزكية الباطن)، کە ئەمە بۆخۆی بەس خوا ﷻ دەتوانێت ئەم وەسفە بکات، کە دەفەرمویت: ﴿فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾.

---

= والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٨٧١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٧٢)، والآجري في "الشريعة" (٢٠٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٣٣٢)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٢٤٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٢) كتاب الإيمان.

(١) رواه البخاري (٤٨٨٠)، ومسلم (١٨٥٦)، والنسائي في "الكبرى" (١١٤٤٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٨٧٥)، ومالك في "الموطأ" (٦/ ٣٩)، وأحمد في "المسند" (١٤٣١٣)، والدارمي في "السنن" (٢٤٩٨)، وابن أبي شيبة في "مصنفه" (٣٦٨٤٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٥٨٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٠٢٠١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٩٩٥).

واتە: زانایە بەوەی کە لە دڵیاندایە.

ئەمە ئاماژەیەکە بۆ تەواوی ئیمان و دامەزراندنی دەروونی لەسەر ئیسلام، ئەم وەسفە ناوەڕۆکییە کەسێك زانا نییە بەسەریدا بێجگە لە خوا، هەموومان بە ڕووکەش زۆر کار دەزانین، بەڵام ئەو کار و ویستانەی لە دڵدایە بەس خوای گەورە ﷻ زانایە بەسەریدا.

بۆیە تەنانەت وەسف و باسی خۆت و یەکتری حەرامە، لەبەر نەزانینمان، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ [النجم: ٣٢].

واتە: وەسفی خۆتان مەکەن، خوا زاناترە بەسەرتانەوە.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ فُلاَنًا، وَاللهُ حَسِيبُهُ، وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَدًا أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ»[(١)].

واتە: هەر کەسێکتان وەسفی برایەکی کرد با بڵێت: وا گومان دەبەم وا بێت، بڕیاری پاکی نادەم بە کەس بەسەر زانایی خوادا، وا گومان دەبەم وا بێت.

وە تەنانەت لە ناوناندا ڕێگە پێدراو نییە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناوی ئافرەتێکی گۆڕی بۆ (زەینەب) کە ناوی (برة) بوو، واتە: چاکەکار: «فَقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْنَبَ»[(٢)].

وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، قَالَ: «نَهَانَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُسَمِّيَ رَقِيقَنَا بِأَرْبَعَةِ أَسْمَاءٍ: أَفْلَحَ، وَرَبَاحٍ، وَيَسَارٍ، وَنَافِعٍ»[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (٢٦٦٢، ٦١١٢)، ومسلم (٣٠٠٠)، وأبو داود (٤٨٠٥)، والنسائي في "الكبرى" (٩٩٩٧)، وابن ماجه (٣٧٤٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٧٦٦)، وأحمد في "المسند" (٢٠٤٦٢)، والطيالسي في "مسنده" (٩٠٣)، والبيهقي في"السنن الكبرى" (٢١١٣٥)، وفي "الشعب" (٤٥٢٧).

(٢) رواه البخاري (٦١٩٢) كتاب الآداب، باب تحويل الاسم إلى اسم أحسن منه، ومسلم (٢١٤١) كتاب الآداب، باب كراهة التسمية بالأسماء القبيحة، وابن ماجه (٣٧٣٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٨٣٠)، وأحمد في "المسند" (٩٩١٤)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٥٨٩٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٩٣١٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٣٧٣).

(٣) رواه مسلم (٢١٣٦)، وأبو داود (٤٩٥٩)، وابن ماجه (٣٧٣٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٨٣٦)، وأحمد في "المسند" =

واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ کردووین لەم ناوانە بەکار بێنین بۆ بەندەکانمان: (أفلح): ڕزگاربوو، (رباح): زۆر براوە، (یسار): ئاسانکار، (نافع): سوودبەخش.

پێنجەم: لە پاداشتی ئەو کار و ئیمانە دڵییانە ﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ﴾: «وهي السكون والطمأنينة، والثبات عند نزول المحن المقلقة، والأمور الصعبة، التي تشوش القلوب، وتزعج الألباب، وتضعف النفوس، فمن نعمة الله على عبده في هذه الحال أن يثبته ويربط على قلبه، وينزل عليه السكينة، ليتلقى هذه المشقات بقلب ثابت ونفس مطمئنة، فيستعد بذلك لإقامة أمر الله في هذه الحال، فيزداد بذلك إيمانه، ويتم إيقانه»[(١)].

واتە: ئارامی و دامەزراوی و مانەوەیە لە کاتی بەڵا و ناخۆشی و کارە قورسەکاندا کە دڵ و نەفس لاواز دەکات، وە زیادبوونی هیدایەت و زانست و شارەزایی دینی، وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ [الفتح: ٤].

(ابن عباس) رضي الله عنهما دەڵێت: «السَّكِينَةُ: الرَّحْمَةُ». وَأَخْرَجَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ، وَأَبُو الشَّيْخِ عَنْهُ قال: «السكينة: الطمأنينة»[(٢)].

واتە: بەزەیی و دامەزراوی و دڵنیابوونە.

بەتایبەت لەسەر ئەو مەرجە قورسانەی موشریکەکان دایان نابوو لەسەر موسوڵمانان لە ڕێککەوتننامەی حودەیبییەدا، کە هەموویان بە سوودمەندی موسوڵمانان شکایەوە[(٣)].

شەشەم: پاداشتێکی تر: ﴿وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا﴾، هەر بەدوای حودەیبییەدا موژدەی گرتنی خەیبەر و مەککەیان پێدرا، بەتایبەت شەڕی خەیبەر کە کەس ئامادەی نەبوو بێجگە لەم هەزار و چوارسەد کەسە نەبێت، وە تایبەت کران بە دەستکەوتەکانی ئەم شەڕە، وەکوو پاداشت و

= (٢٠١٣٨)، والطبراني في "الكبير" (٦٧٩٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٢٥٩٠٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٩٣٠٩).

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٩١ في تفسير سورة [الفتح: آية: ٤].

(٢) "فتح القدير" للشوكاني (١/ ٣٠٦)، "الدر المنثور" للسيوطي (١/ ٧٥٧).

(٣) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٩٣.

پێبەخشینێك لەسەر گوێڕایەڵی و ئیمانیان[(١)].

ئەمە بووە هۆكاری فتوحاتی گشتی و دەرگای سەركەوتنی بێ سنوور و بڵاوبوونەوەی ئیسلام.

ئیمامی (الزهري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لَا فَتْحَ فِي الْإِسْلَامِ كَانَ أَعْظَمَ مِنْ صُلْحِ الْحُدَيْبِيَةِ، وَلَقَدْ دَخَلَ فِي تِلْكَ السَّنَتَيْنِ فِي الْإِسْلَامِ مِثْلُ مَنْ كَانَ قَدْ دَخَلَ فِيهِ قَبْلَ ذَلِكَ بَلْ أَكْثَرُ، فَإِنَّ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا فِي سَنَةِ سِتٍّ، وَهِيَ سَنَةُ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ، وَكَانُوا فِي سَنَةِ ثَمَانٍ عَشَرَةَ آلَافٍ»[(٢)].

واتە: هیچ فەتحێك لە ئیسلامدا وەكوو ڕێككەوتننامەی حودەیبییە گەورەتر نەبووە، لە حودەیبییە هەزار و چوارسەد كەس بوون، كە ساڵی شەشەمی كۆچی بوو، وە لە ساڵی هەشتەم بوون بە دە هەزار كەس.

**كورتەی ئایەتەكە:** موژدەی ڕازیبوونی بەردەوامی خوایی، وەسفكردنیان بە ئیماندار و بڕیاری پاك و بێگەردی دڵ و دەروونیان و پێبەخشینی ئارامی ئیمانی و پاداشتكردنیان بە سەركردەیی و دەرگای فتوحات و بڵاوبوونەوەی ئیسلام.

ئەم ئایەتە گەورەترین سەلماندنی دادپەروەری و ڕێك و ڕەوانی و كاملێ ئیمانی هاوەڵانە، بۆیە هەر ئەمانە سەركردە و زانا و پێشەوای دوای پێغەمبەری ئەم ئیسلامە بوون.

ئەمانە پلەی ڕێك و ڕەوانی (عدالة)ی دینییان پێ دەبەخشرێت، وە زیادەڕەویشیان تێدا ناكرێت تاوەكوو پلەی پارێزراوی پێغەمبەرایەتی (معصومیة)یان پێ بدرێت، وە بە كەسانی سادەوساكاریش ناو نابرێن و لەقەڵەم نادرێن و وا گومان ببرێت كە قابیلی هەموو هەڵەو لادانێكی سادە بن.

ئەمە بەرنامەی ئەهلی سوننەتە بۆ تێڕوانین لەسەر هاوەڵان (الصحابة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ بە گشتی، بەڵگەشیان ئەم ئایەتە و چەندەها فەرموودەی خوایە و وەسف و سەنای پێغەمبەرەكەیەتی لەسەر هاوەڵان، بە پێچەوانەی فیرەقە گومڕاكانەوە.

خەواریجەكان بڕیاری بەكافربوونیان دەدا بەسەریاندا، ڕافیزەكانیش هەندێكیان پلەی پارێزراوی پێغەمبەرایەتی (معصومیة)یان پێ دەبەخشی، وەكوو (علي بن أبي طالب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وآل بیت)ی،

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٩٣.

(٢) "فتح القدير" للشوكاني (٥/ ٦٥).

پاشماوەکەی تریشیان بە هەڵگەڕاوە دەدایە قەڵەم، وە موعتەزیلە و ئەهلی کەلام لە نێوان ئیمان و کوفردا دایان دەنان بە ناوی (منزلة بین منزلتین)، وە ئەشعەری و ماتۆریدی و فیرەقە تازەکانیش نە پلەوپایە و نە باس و خواس و نە بەرگریکردن لێیان و نە لایەنگرییان و بە (عدالة) و زانا و پێشەوا و باشترینی سەدەی ئەم دینە باس و بەرنامەیانە، وە بگرە شوێنی گومانیانە و دوودڵن لە ئاستیان و خۆیان بە خاوەنیان نازانن.

پێویستە وەکوو (ابن حزم) ﵀ دەڵێت: «فَمن أخبرنَا الله عز وَجل أَنه علم مَا فِي قُلُوبهم رَضِي الله عَنْهُم وَأنزل السكينَة عَلَيْهِم فَلَا يحل لأحد التَّوَقُّف فِي أَمرهم وَلَا الشَّك فيهم الْبَتَّةَ»[١].

واتە: ئەگەر هەرکەس خوای گەورە هەواڵمان بداتێ کە زانایە بەوەی چی لەناو دڵیدایە و لێیان ڕازییە، وە ئارامی خۆیشی باراندووە بەسەریاندا؛ ئەوا دروست نییە بۆ هیچ کەسێك لە ئاستیاندا هەڵوێستە بکات و گومانی هەبێت لێیان.

لەبەرئەوەی گومانە لە دەقی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە (تزكية) و پلەدارییان بۆ دەکات.

**ئایەتی دووەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾﴾ [الفتح: ٢٩].

واتە: خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات بەسەر پێغەمبەرەکەی و هاوەڵانیدا بە گەورەترین وەسف و بارودۆخ، کە زۆر هەوڵدەر و تێکۆشەرن لە دژایەتی بێبڕواياندا و خاوەن بەزەیی و سۆزن لەنێوان یەکتردا، ئەمە مامەڵەیانە لەگەڵ خەڵکدا، وە مامەڵەشیان لەگەڵ خوادا بەردەوام لە نوێژدان و مەبەستیان ڕازیبوونی خوا و پاداشتیەتی، نیشانەکانیان لە پاشماوەی ناوچەوانیان دیارە بە هۆکاری کڕنووشبردن، ئەمانە نمونەیان لە تەوراتدا بەو شێوەیە، وە لە ئینجیلیشدا وەسف کراون

(١) "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٤/ ١١٦).

بە کشتوکاڵێك کە گەشە پێدراوە، هەر لە نەمامییەتییەوە تا خاوەن لاسك و پەلی بەهێز، ڕێك و ڕاستن بە شێوەیەك خاوەن کار سەرسامە بەمە، وە بێبڕوایان خەم و مەراق لە دڵیاندا دروست دەبێت بەم کۆبوونەوە و کامڵبوونەیان، وادەی خواییە بۆ ئیمانداران و کارچاکان بە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە[١].

مەبەست لێرەدا ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾: (ﷺ) پێغەمبەری خوایە، وە ئەوانەشی کە لەگەڵێدان هاوەڵان بە گشتی، وە بە تایبەتیش ئەمیر و زاناکانیان (الأمراء والعلماء) و هەڵگری دین لە چوار خەلیفە و ناودارانیان، بەتایبەت خاوەنی ئەم وەسفانەن، کە لە دیندا هەژمار دەکرێت بە پلەبەرز و کامڵترین جێبەجێکاری دین لە بواری:

❑ **الولاء والبراء:** لایەنگری و دژایەتیکردن لەسەر بنەمای دین و مەبەست تیایدا لە پێناوی خوادایە، نەخوێندنەوەی هیچ سوودمەندی و پەیوەندی و نزیکییەکی بێبڕوایان، وە نەخوێندنەوەی هیچ بەربەستێکی دونیایی لە دووبەرەکایەتی و جیاوازی لە لایەنگری ئیمانداران، بەڵکوو پەیوەندی لەسەر بنەمای داواکارییەکانی دینە.

وە لە مافی خوادا بەردەوامی لەسەر عیبادەت و جێبەجێکردنی فەرمانەکانە، وە لە مافی خەڵکیشدا بە سۆز و بەزەییانە مامەڵەکردن لەگەڵ یەکدا، بە هۆکاری خوێندنەوەی عوزر و ناتەواوییەکان.

❑ **الإخلاص والمتابعة:** جێبەجێکردنی هەردوو مەرجەکەی دین لە کارکردندا: نیەت پاکی و شوێنکەوتەیی (الإخلاص والمتابعة).

لە ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ﴾: ئەمە (المتابعة) یە، بە مەبەستی پاداشت شوێنکەوتەن، وە ﴿وَرِضۡوَٰنٗاۖ﴾: ئەمە (الإخلاص)ە، بە مەبەستی ڕازیبوونی خوایی نیەت پاکن.

ئەوەندەی خەریکی کار و کردەوەن ئەوەندە خاوەن قسە نین، بۆیە پاشماوەی کاریان پێوە دیارە ﴿سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ﴾.

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٧٩ في تفسير سورة [الفَتْح : آيَة : ٢٩].

ئەمانە هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلامن ﷺ، کە لە ئایینەکانی پێشووانیشدا شوێنی وەسف و پایەبەرزی بوون، ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ﴾: بەو مانایەی لە ئێوە دیندارتر و کامڵترن.

هەروەك لایەنگرانی ئەو دینانە گاوور و جوولەکە کاتێك هاوەڵانیان بینیوە دانیان بەم ڕاستییەدا ناوە، وەکو ئیمامی (مالك) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «بَلَغَنِي أَنَّ النَّصَارَى كَانُوا إِذَا رَأَوُا الصَّحَابَةَ الَّذِينَ فَتَحُوا الشَّامَ يَقُولُونَ: "وَاللهِ لَهَؤُلَاءِ خَيْرٌ مِنَ الْحَوَارِيِّينَ فِيمَا بَلَغَنَا"»[(١)].

واتە: ئەوەی پێم گەیشتووە گاوورەکان کاتێك هاوەڵانیان بینیوە لە فەتحی (شام)دا وتوویانە: سوێند بە خوا ئەمانە چاکترن لە هاوەڵانی (عیسا) عَلَيْهِ السَّلَامُ وەکوو پێمان گەیشتووە.

بە دڵنیاییەوە پلەی هاوەڵانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ پایەدارترە تا هاوەڵانی پێغەمبەرانی پێشوو، وەکوو هەڵوێستیان لە شەڕی (ئوحود)دا دەردەکەوێت و بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن: «وَوَاللهِ لَئِنِ اسْتَعْرَضْتَ بِنَا هَذَا الْبَحْرَ خُضْنَاهُ مَعَكَ. وَقَالَ لَهُ المقداد: لَا نَقُولُ لَكَ كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى لِمُوسَى: اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ، وَلَكِنَّا نُقَاتِلُ عَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ، وَمِنْ بَيْنِ يَدَيْكَ، وَمِنْ خَلْفِكَ»[(٢)].

واتە: سوێند بە خوا گەر بماندەی بەم دەریایەدا لەگەڵتاین، ئێمە ئەوە ناڵێین کە گەلەکەی (موسا) بە پێغەمبەر (موسا)یان عَلَيْهِ السَّلَامُ وت: "بڕۆ خۆت و خواکەت شەڕ بکەن، ئێمە ئالێرەدا دانیشتووین" ، بەڵکوو شەڕ دەکەین لەلای ڕاست و چەپ و بەردەم و پشتەوەت.

وە خەلیفەی ڕاشیدین (علي بن أبي طالب) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە وەسفی هاوەڵاندا دەڵێت: «لَقَدْ رَأَيْتُ أَثَرًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَمَا أَرَى أَحَدًا يُشْبِهُهُمْ، وَاللهِ إِنْ كَانُوا لَيُصْبِحُونَ شُعْثًا غُبْرًا صُفْرًا، بَيْنَ أَعْيُنِهِمْ مِثْلُ رُكَبِ الْمِعْزَى، قَدْ بَاتُوا يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، يُرَاوِحُونَ بَيْنَ أَقْدَامِهِمْ وَجِبَاهِهِمْ، إِذَا ذُكِرَ اللهُ مَادُوا كَمَا تَمِيدُ الشَّجَرَةُ فِي يَوْمِ رِيحٍ، فَانْهَمَلَتْ أَعْيُنُهُمْ حَتَّى

(١) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٢) في تفسير سورة [الفتح : آية : ٢٩].

(٢) "البداية والنهاية" لإبن كثير (٣/ ٢٦٢)، "زاد المعاد في هدي خير العباد" لابن القيم (٣/ ١٥٥)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (١٤/ ٤١١).

تَبُلَّ وَالله ثِيَابَهُمْ، وَالله لَكَأَنَّ الْقَوْمَ بَاتُوا غَافِلِينَ ... أُولَئِكَ مَصَابِيحُ الْهُدَى، يَكْشِفُ اللهُ عَنْهُمْ كُلَّ فِتْنَةٍ مُظْلِمَةٍ، سَيُدْخِلُهُمُ اللهُ فِي رَحْمَةٍ مِنْهُ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِالْمَذَايِيعِ الْبَذِرِ، وَلَا الْجُفَاةِ الْمُرَائِينَ»[(١)].

واته: شێوەیەکم دەبینی بە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ نەمبینیوە کەس لەوان بچێت، سوێند بە خوا بەیانییان دەکردەوە بە تەپ و تۆزاوی و ڕەنگ زەردییەوە، نێوان ناوچاوانیان وەکوو ئەژنۆی مالآت وابوو، شەونخوونییان دەکرد بە خوێندنەوەی قورئان و لەسەر ئەم قاچ و ئەو قاچ و ناوچەوانیان شەویان بەسەر دەبرد، وە گەر یادی خوا بکرایە شۆڕ دەبوونەوە وەکوو درەختێك لە ڕۆژی بادا و چاوەکانیان پڕ دەبوو لە فرمێسك تا جلەکانیان تەڕ دەبوو، سوێند بە خوا وا هەست دەکەم ئەم خەڵکە شەو بە بێئاگایی دەبەنە سەر، ئەوانە چرای ڕووناکی هیدایەتن، بە هۆکاری ئەوان هەموو فیتنەیەکی تاریك دەڕەوێتەوە، ئەوانە دەکەونە ڕەحمەتی خواوە، کەسانێك نەبوون دەنگۆکار و ناودار بن، وە کەسانێکی ڕیابازی وشك نەبوون.

**ئایەتی سێیەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ [الحشر: ٨ - ١٠].

﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ...﴾: دەسکەوتەکانی شەڕ بۆ هەژارە کۆچەرییەکانە، ئەوانەی کە دەرکراون لە ماڵ و حاڵ و کەسوکاری خۆیان، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا و سەرکەوتنی دینەکەی و خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەوان ڕاستگۆی تەواون بە کارپێکردن و

(١) "الحلية الأولياء" لأبو نعيم (١/ ٧٦)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٢/ ٤٩٢)، و "البداية والنهاية" لإبن كثير (٨/ ٧)، و "أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب رضي الله عنه" لعلي الصلابي (١/ ٣٤٦).

شوێنکەوتەی دین، بە کۆچ و جیهادکردن پشتیوانی پێغەمبەرەکەین، مەبەست لەمانە کۆچەرە مەککییەکانە.

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ ... ﴾: وە ئەوانەی ماڵی کۆچ و ئیمانیان بنیاد ناوە لەوەوپێش (واتە: پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم) بۆ سەرخستنی ئەم دینە، لە کاتێکدا هەموو شوێنێك لانەی شەریك بڕیاردان و شەڕ و بێبڕوایی بووە بێجگە لە (مەدینە) نەبێت، خۆشحاڵن بەوەی کۆچیان بۆ لا دەکەن لەبەر خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە خۆشەویستان و سەرخەری ئەم دینەیان خۆش دەوێت.

﴿ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ ... ﴾: لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئێرەیی و غیرەیەك نابەن بە کۆچەرییەکان لەوەی کە لەلایەن خواوە ﷻ پێیان دراوە لە پلەوپایە و تایبەتکردنیان بە وەسف و ناوبردن و پێشینەییەتی ئەم دینە لە (کۆچ بۆکردن و سەرخستنی).

﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ... ﴾: وە لە پلەی بەرزی خەڵکی مەدینە (أنصار) بەسەر خەڵکیدا بەخشینی پێویستییەکانیانە بە کۆچەرییەکان (المهاجرين) و پێشخستنیان بەسەر خۆیاندا لەگەڵ پێویستی خۆیان پێی، ئەوانەی وەکوو ئەمان لە ڕەزیلی و بەخیلی و گرتنەوەی نەفس پارێزراو بێت سەرکەوتوو و ڕزگاربووە لە هەموو سیفاتە شەڕەکان، مەبەست لەمانیش دانیشتوانی شاری مەدینەن، کە پێیان دەواترا پشتیوانان (الأنصار).

ئەم دوو سیفاتانەیان کۆچ و سەرخستنی مەککییەکان (الهجرة والنصر) و ماڵ بەخشین و ئیمانی مەدینەییەکان (الدار والإيمان)، (المهاجرين والأنصار) بوونە سەرکردە و گەورە پیاوان و زانایان و پێشەوایانی ئەم دینە.

﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ ... ﴾: بەشی سێیەم ئەوانەی لە دوای کۆچەری و پشتیوانانەوە دێن و لەسەر ڕێڕەوی ئەوان دەبن و هەڵوێستیان بەرامبەریان خۆ بە قەرزارزانینیان و دوعای خێر بۆکردنیانە بە وتنی ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴾، واتە: خوای پەروەردگار لە ئێمە و لەو برایانەمان خۆشبیت کە پێشمان کەوتوون بە ئیمانهێنان (واتە: شوێنکەوتەی ئەوانین لە ئیمان و دیندا)، وە هیچ ڕق و

کینەیەك لە دڵماندا نەبێت بۆ ئیمانداران، خوای پەروەردگار هەر تۆی خاوەن سۆز و بەزەییت[١].

## خوای پەروەردگار وەسفی کۆچەرییە مەککییەکان (المهاجرين) دەکات بە شەش وەسف:

١. ﴿لِلۡفُقَرَآءِ﴾: هەژاران بە بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵیان لە پێناوی خوادا ﷻ.

٢. ﴿ٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾: کۆچەرن بۆ سەرخستنی دین و پشتیوانی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

٣. ﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ﴾: دەرکراون لە شوێن و ماڵ و سەروەتیان.

٤. ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا﴾: نیەتیان پاداشت و ڕازیبوونی خوایە ﷻ.

٥. ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾: سەرخەر و پشتیوانی دینی خوا و پێغەمبەرەکەین ﷺ.

٦. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾: ئەوانە ڕاستگۆ بوون لە هەڵگرتنی ناخۆشییەکانی دونیا لە پێناوی دیندا.

## وە وەسفی مەدینەییەکان (الأنصار) دەکات بە:

١. ﴿تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ﴾: پەناو لانەدان و پشتیوانیکردن بە وڵات و ماڵ.

٢. ﴿وَٱلۡإِيمَٰنَ﴾: هەڵگری ئیمانن، هەر لە سەرەتایەوە پەیمانیان داوە بە وەرگرتنی ئەم دینە و پشتیوانیکردن لێی، لە پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم لە مەککەدا، وەکوو ئیمامی (مالك) ﵀ دەڵێت: «إِنَّ الْمَدِينَةَ تُبُوِّئَتْ بِالْإِيمَانِ وَالْهِجْرَةِ، وَإِنَّ غَيْرَهَا مِنَ الْقُرَى افْتُتِحَتْ بِالسَّيْفِ»[٢].

واتە: پلەوپایەی شاری مەدینە لەوەدایە سەرەتای بە ڕازیبوون و وەرگرتنی ئیمانەوە و کۆچکردن بۆی ئیسلامیان وەرگرت، بە پێچەوانەی هەموو شوێنێکەوە کە بە بەکارهێنانی هێز ئیسلامیان وەرگرت، تەنانەت شاری مەککەش.

٣. ﴿يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ﴾: لە پێناوی خوادا دەرگایان واڵا بوو بۆ هەموو ئیماندارێك.

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٨٥٠.

(٢) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٢٣) في تفسير سورة [الحشر : آية : ٩].

٤. ﴿ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا ﴾: **هیچ بەخیلی و حەسوودییەکیان نەدەبرد بە پلەوپایەی کۆچەرییەکان.**

٥. ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ ... ﴾: **برا کۆچەرییەکانیان پێش دەخست بەسەر خۆیاندا و خۆیان بە پلە دوو دادەنا.**

٦. ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾: ئەوانە ڕزگاربوو و سەرفرازن.

ئەم دوو پێکهاتەیە کە بریتین لە کۆچەرییەکان و پشتیوانان (المهاجرين والأنصار) پێکهاتەی هەموو هاوەڵانن، وە هەردوو لایان لە یەکن و سەرپەرشتیکاری یەکن، یەك کۆمەڵ و پێکهاتەن و جیاکراوە نین، دۆست و دوژمنیان یەکە، **وە هەردوو لایان خاوەنی ڕاستگۆترین ئیمانن کە کەس پێیان ناگاتەوە، وە بەم شێوەیە قورئان ئاماژەیان بۆ دەکات و وەسفیان دەکات:**

١. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾ [الأنفال : ٧٢].

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێنا و کۆچیان کرد و جیهادیان کرد بە ماڵ و لاشەیان لە پێناوی خوادا، وە ئەوانەی پەنایان دان و سەریان خستن؛ ئەمانە یەك کۆمەڵن و سەرپەرشتیکاری یەکن.

٢. وە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ [الأنفال : ٧٤].

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێنا و کۆچیان کرد و جیهادیان کرد لە پێناوی خوادا، وە ئەوانەی پەنایان دان و سەریان خستن؛ ئەم دوو کۆمەڵەیە خاوەنی ئیمانی حەقیقی و ڕاست و دروستن(١).

❁ کۆچەرییەکان لانە و ماڵ و کەسوکاریان بەجێهێشتووە لە پێناوی خوادا، پشتیوانەکانیش لانە و ماڵەکانیان بەخشیوە.

❁ کۆچەرییەکان سەروەت و سامانیان بەجێهێشتووە، پشتیوانەکانیش ماڵ و سەروەتیان بەخشیوە.

---

(١) "أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن" للشنقيطي (٨/ ٤٢).

۞ وە هەردوو لاشیان جیهادیان کردووە و پشتیوانی پێغەمبەرەکەین، گەرچی کۆچەرییەکان هەموو ماڵ و سەروەتیان بەجێهێشتووە.

وەکو (مصعب بن سعد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «النَّاسُ عَلَى ثَلَاثَةِ مَنَازِلَ، فَمَضَتْ مَنْزِلَتَانِ وَبَقِيَتْ مَنْزِلَةٌ»(١).

واتە: خەڵکی لەسەر سێ پلەن: دوانیان ڕۆشتووە (واتە کۆچەری و ئەنسارییەکان)، یەکێکیان ماوە (ئەوانەی کە شوێنکەوتەیانن و دوعای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەن)، وەکوو بەشی سێهەم کە لە ئایەتی دوای ئەواندا دێت.

٣. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾ [الحشر: ١٠].

واتە: بەشی سێهەم شوێنکەوتوانیان، ئەوانەی لەسەر بەرنامە و کاری (المهاجرين والأنصار) دەڕۆن و هەڵگرین، خاوەن بەشن لە دەستکەوتەکانی شەڕدا، وە هەڵوێستیان بەرامبەر بەو دوو کۆمەڵەیە وتنی دوعای خێر و لێخۆشبوونە و داننانە بە ئیمانی ڕاستەقینەیان و پلەوپایەیان: ﴿سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾، وە سەلامەتی دڵ و نییەتیانە لە ئاستیان: ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾.

ئەمە شوێنکەوتەی هاوەڵانە بە چاکە و مایەی ڕازیبوونی خواییە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ﴾ [التوبة: ١٠٠].

واتە: پێشەنگی یەکەمی کۆچەرییەکان و پشتیوانەکان و ئەوانەی شوێنکەوتەیانن بە چاکە؛ خوا لێیان ڕازییە.

(ابن أبي ليلى) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «النَّاسُ عَلَى ثَلَاثَةِ مَنَازِلَ: المهاجرين، والذين تبوؤا الدار

(١) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣١) في تفسير سورة [الحشر: آية: ١٠].

والإيمان، والذين جاؤوا مِنْ بَعْدِهِمْ، فَاجْتَهِدْ أَنْ لَا تَكُونَ خَارِجًا مِنْ هَذِهِ الْمَنَازِلِ»[(١)].

واتە: خەڵكی لە سێ پلەدان: كۆچەرییەكان و پشتیوانان و ئەوانەی لەپاش ئەوانەوە دێن، هەوڵ بدە یەكێك نەبیت لە دەرەوەی ئەم سێ پلەیە.

وە دەڵێن: «كُنْ شَمْسًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَكُنْ قَمَرًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَكُنْ كَوْكَبًا مُضِيئًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَكُنْ كَوْكَبًا صَغِيرًا، وَمِنْ جِهَةِ النُّورِ لَا تَنْقَطِعُ»[(٢)].

واتە: ببە بە خۆر، گەر نەتتوانی ببە بە مانگ، گەر نەتتوانی ببە بە ئەستێرەیەكی پرشنگدار، گەر نەتتوانی ببە بە ئەستێرەیەكی بچووك، لە ئاستی ڕووناكی ون مەبە.

وە ئیمامی (الرازي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «واعلم أن هذه الآيات قد استوعبت جميع المؤمنين لأنهم إما المهاجرون، أو الأنصار، أو الذين جاءوا من بعدهم، ... فمن لم يكن كذلك، بل ذكرهم بسوء كان خارجا من جملة أقسام المؤمنين، بحسب نص هذه الآية»[(٣)].

واتە: ئەم ئایەتە هەموو جۆرێك موسوڵمانی گرتووەتەوە، لە كۆچەری و پشتیوانان و شوێنكەوتوانیان ... گەر وا نەبێت، وە هاوەڵان بە خراپ باس بكات؛ ئەوا لە كۆڕیزی ئیمانداران دەردەچێت بە گوێرەی دەقی ئەم ئایەتە.

پیاوێك هات بۆ لای (حسين بن علي) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا وتی: «يَا ابْنَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا تَقُولُ فِي عُثْمَانَ؟ فَقَالَ لَهُ: يَا أَخِي أَنْتَ مِنْ قَوْمٍ قَالَ اللهُ فِيهِمْ: لِلْفُقَراءِ الْمُهاجِرِينَ الْآيَةَ. قَالَ لَا! قَالَ: فَوَاللهِ لَئِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْآيَةِ فَأَنْتَ مِنْ قَوْمٍ قَالَ الله فيهم: وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُا الدَّارَ وَالْإِيمانَ الْآيَةَ. قَالَ لَا قَالَ: فَوَاللهِ لَئِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْآيَةِ الثَّالِثَةِ لَتَخْرُجَنَّ مِنَ الْإِسْلَامِ وَهِيَ قَوْلُهُ تَعَالَى: وَالَّذِينَ جاؤُ مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنا وَلِإِخْوانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونا بِالْإِيمانِ الْآيَةَ»[(٤)].

---

(١) "تفسير البغوي" (٥/ ٦١)، و "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣١) في تفسير سورة [الحشر : آية : ١٠].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣١) في تفسير سورة [الحشر : آية : ١٠].

(٣) "التفسير الوسيط للقرآن الكريم" لطنطاوي (١٤/ ٣٠١) في تفسير سورة [الحشر : آية : ١٠].

(٤) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣١) في تفسير سورة [الحشر : آية : ١٠].

واتە: ئەی کوڕی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێیت سەبارەت بە (عوسمانی کوڕی عەففان) ؓ ؟ پێی وت: ئەی براکەم تۆ لەوانەیت کە خوا پێیان دەفەرموێت: ﴿ لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ ... ﴾ هەژارە کۆچەرییەکان؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە تۆ لەو کەسانەیت کە خوا پێیان دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُو الدَّارَ وَالْإِيمَانَ ... ﴾ پشتیوانەکان کە ماڵ و لانەیان بۆ کردنەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: سوێند بە خوا گەر لە ئایەتی سێیەم نەبیت لە ئیسلام دەردەچیت، کە خوا پێیان دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ ... ﴾.

ئەم ئایەتە باس لە کۆمەڵەی سێیەم دەکات کە دەستکەوتەکانی شەڕیان پێ دەدرێت: ﴿ مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ ﴾ [الحشر: ٧].

بۆیە ئیمامی (مالك) رحمه الله دەڵێت: «مَنْ كَانَ يُبْغِضُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ كَانَ فِي قَلْبِهِ عَلَيْهِمْ غِلٌّ، فليس له حق في في المسلمين، ثم قرأ وَالَّذِينَ جاؤُ مِنْ بَعْدِهِمْ الْآيَةَ»[(١)].

واتە: ئەوەی ڕقی یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ لە دڵدا بێت؛ بەشی نییە لە دەستکەوتی موسوڵمانانندا، وە ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ ... ﴾.

وَعَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: «أُمِرْتُمْ بِالِاسْتِغْفَارِ لِأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَبَبْتُمُوهُم»[(٢)].

واتە: (عائیشە)ی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: فەرمانتان پێ کراوە داوای لێخۆشبوون بۆ هاوەڵانی (محمد ﷺ) بکەن؛ کەچی قسەیان پێ دەڵێن؟!

---

(١) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣٢)، و "تفسير البغوي" (٨/ ٨٠)، و "تفسير ابن كثير" (٨/ ٧٣)، في تفسير سورة [الحشر: آية: ١٠].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣٢)، و "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٢)، و "تفسير البغوي" (٨/ ٨٠) في تفسير سورة [الحشر: آية: ١٠].

وە (عبدالله بن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «أَمَرَ اللهُ تَعَالَى بِالِاسْتِغْفَارِ لِأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُمْ سَيُفْتَنُونَ»(١).

واتە: خوای گەورە فەرمانی داوە داوای لێخۆشبوون بۆ هاوەڵانی (ﷺ) بکەن؛ لەگەڵ ئەوەشدا زانا بووە بەوەی چۆن تووشی فیتنە دەبن و چییان بەسەر دێت، واتە لە سەروو ئەوەشەوە هەر لێیان ڕازییە.

ئیمامی (الشعبي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «تَفَاضَلَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى عَلَى الرَّافِضَةِ بِخَصْلَةٍ، سُئِلَتِ الْيَهُودُ: مَنْ خَيْرُ أَهْلِ مِلَّتِكُمْ؟ فَقَالُوا: أَصْحَابُ مُوسَى. وَسُئِلَتِ النَّصَارَى: مَنْ خَيْرُ أَهْلِ مِلَّتِكُمْ؟ فَقَالُوا: أَصْحَابُ عِيسَى. وَسُئِلَتِ الرَّافِضَةُ مَنْ شَرُّ أَهْلِ مِلَّتِكُمْ؟ فَقَالُوا: أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ، أُمِرُوا بِالِاسْتِغْفَارِ لَهُمْ فَسَبُّوهُمْ»(٢).

واتە: جوولەکە و گاوورەکان بە پلەیەك باشترن لە ڕافیزەکان، پرسیاریان کرد لە جوولەکە: کێ باشترین کەسانی میللەتی ئێوەن؟ وتیان: هاوەڵانی (موسا) عَلَيْهِ السَّلَامُ، وە پرسیاریان کرد لە گاوورەکان: کێ باشترین میللەتی ئێوەن؟ وتیان: هاوەڵانی (عیسا) عَلَيْهِ السَّلَامُ، وە پرسیاریان لە ڕافیزە کرد: کێ خراپترینی میللەتی ئێوەن؟ وتیان: هاوەڵانی (ﷺ)، فەرمانیان پێ کراوە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن کەچی قسەیان پێ دەڵێن.

**ئایەتی چوارەم:** خوای گەورە جَلَّ جَلَالُهُ دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾ [التوبة: ١٠٠].

خوای پەروەردگار هەواڵ دەدات بە ڕازیبوونی خۆی لە کۆچەری و پشتیوانەکان و شوێنکەوتوانیان بە چاکە و پێبەخشینی بەهەشتەکانی بە مانەوەی هەتا هەتایی و بەدەستهێنانی

(١) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣٣)، في تفسير سورة [الحشر: آية: ١٠].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣٣)، و "تفسير البغوي" (٨/ ٨٠) في تفسير سورة [الحشر: آية: ١٠].

سەرکەوتن و سەرفرازی تەواو، لەبەر ئەوە: «فَيَا وَيْلُ مَنْ أَبْغَضَهُمْ أَوْ سَبَّهم أَوْ أَبْغَض أَوْ سبَّ بَعْضَهُمْ، وَلَا سِيَّما سيدُ الصَّحَابَةِ بَعْدَ الرَّسُولِ وَخَيْرُهُمْ وَأَفْضَلُهُمْ، أَعْنِي الصِّدِّيقَ الْأَكْبَرَ وَالْخَلِيفَةَ الْأَعْظَمَ أَبَا بَكْرِ بْنَ أَبِي قُحَافَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَإِنَّ الطَّائِفَةَ الْمَخْذُولَةَ مِنَ الرَّافِضَةِ يُعَادُونَ أَفْضَلَ الصَّحَابَةِ ويُبغضونهم ويَسُبُّونهم، عِياذًا بِاللهِ مِنْ ذَلِكَ»[(١)].

واتە: هاوار بۆ ئەوانەی ڕقیان لێیانە و قسەیان پێ دەڵێن، یا بە هەندێکیان، بەتایبەت گەورەی هاوەڵان و چاکترینیان و پایەبەرزترینیان کە (ئەبو بەکری ڕاستگۆ) جێنشینی گەورەیە، کۆمەڵێکی سەرشۆڕ لە ڕافیزەکان دژایەتی پایەبەرزترین هاوەڵان دەکەن، خوا پەنامان بات.

## ئەم ڕەزامەندییە سێ کۆمەڵ دەگرێتەوە:

١. ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ﴾: پێشینە سەرەتا کۆچەرییەکان، ئەوانەی هەر لە سەرەتای مەککەوە تا کۆچکردن و بەشداربوانی شەڕی بەدر و بەشداربوانی پەیمانی حودەیبییە و گۆڕینی قیبلە، ئەمانە هەموویان بەشدارن لەم وەسفەدا.

ئیمامی (الشوكاني) ﵀ دەڵێت: «وَلَا مَانِعَ مِنْ حَمْلِ الْآيَةِ عَلَى هَذِهِ الْأَصْنَافِ كُلِّهَا»[(٢)].

واتە: ئایەتەکە هەموو ئەمانە دەگرێتەوە: ﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ...﴾ [الحشر: ٨].

٢. ﴿وَٱلۡأَنصَارِ﴾: «وَهُمُ الَّذِينَ نَصَرُوا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَعْدَائِهِ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ وَآوَوْا أَصْحَابَهُ»[(٣)].

واتە: ئەوانەن کە پێغەمبەریان سەرخست بەسەر دوژمنەکانیدا، لە خەڵکی مەدینە و لانەیان بۆ هاوەڵان کردەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ...﴾ و بە تایبەت کەسانی خاوەن پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٤/ ٢٠٣) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].

(٢) "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ٤٥٣) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].

(٣) "تفسير البغوي" (٤/ ٨٨) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].

٣. ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ﴾: «وَهُمُ الْمُتَأَخِّرُونَ عَنْهُمْ مِنَ الصَّحَابَةِ فَمَنْ بَعْدَهُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»(١).

واتە: ئەوانەن كە لەدوای هاوەڵە سەرەتاییەكان و پاش ئەوانەوە دێن تا ڕۆژی كۆتایی.

ئەوانەی شوێنكەوتەیانن لە شێوازی بیروباوەڕیان و قسە و كرداریان: «بالاعتقادات والأقوال والأعمال»(٢).

﴿بِإِحۡسَٰنٖ﴾: «قَيْدٌ لِلتَّابِعِينَ، أَيْ: وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ مُتَلَبِّسِينَ بِإِحْسَانٍ فِي الْأَفْعَالِ وَالْأَقْوَالِ»(٣).

واتە: ئەم وشەیە مەرجە بۆ شوێنكەوتوانیان كە چاكەكار بن لە كار و گوفتاریاندا.

مەرجە لە شوێنكەوتوواندا شوێنكەوتەی كارە چاكەكانیان بن، نەك هەڵەكانیان: «شَرَطَ فِي التَّابِعَيْنِ شَرِيطَةً وَهِيَ أَنْ يَتْبَعُوهُمْ فِي أَفْعَالِهِمُ الْحَسَنَةِ دُونَ السَّيِّئَةِ»(٤).

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «فرضي عن السابقين من غير اشتراط إحسان ولم يرض عن التابعين إلا أن يتبعوهم بإحسان»(٥).

واتە: خوای پەروەردگار ڕازی بووە لە پێشینەكان بەبێ مەرجی چاكە (إحسان)، بەڵام ڕازی نەبووە لە شوێنكەوتوان بەبێ نەبوونی (إحسان) بە شێوەی چاكە، وە یەكێك لەو چاكانە ئەم دوعایەیە: ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ ...﴾ [الحشر : ١٠]، كە لە قورئاندا ئاماژەی پێ دەكات.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ، قَالَ: «مَرَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِرَجُلٍ يَقْرَأُ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾ [التوبة : ١٠٠]. ... حَتَّى بَلَغَ: ﴿وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾ [التوبة : ١٠٠]. قَالَ:

(١) "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ٤٥٣) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].
(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٤٩ في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].
(٣) "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ٤٥٣) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].
(٤) "تفسير البغوي" (٤/ ٨٨)، و"تفسير القرطبي" (٨/ ٢٣٨) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١٠٠].
(٥) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٧٢.

وَأَخَذَ عُمَرُ بِيَدِهِ فَقَالَ: مَنْ أَقْرَأَكَ هَذَا؟ قَالَ: أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ. فَقَالَ: لَا تُفَارِقُنِي حَتَّى أَذْهَبَ بِكَ إِلَيْهِ فَلَمَّا جاءَهُ قَالَ عُمَرُ: أَنْتَ أَقْرَأْتَ هَذَا هَذِهِ الْآيَةَ هَكَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَنْتَ سَمِعْتَهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: لَقَدْ كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّا رُفِعْنَا رِفْعَةً لَا يَبْلُغُهَا أَحَدٌ بَعْدَنَا، فَقَالَ أُبَيٌّ: بَلَى تَصْدِيقُ هَذِهِ الْآيَةِ فِي أَوَّلِ سُورَةِ الْجُمُعَةِ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ [الجمعة: ٣]. ... إِلَى: ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [إبراهيم: ٤]، وَفِي سُورَةِ الْحَشْرِ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾، وَفِي الْأَنْفَالِ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمْ﴾ [الأنفال: ٧٥]. إِلَى آخِرِ الْآيَةِ[1].

واته: (مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: (عومەری كوڕی خەتتاب) ﷺ تێپەڕ بوو بەلای پیاوێكدا، گوێی لێبوو ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ﴾ [التوبة: ١٠٠]. تا كۆتایی، دەستی گرت و پێی وت: كێ ئەمەی فێر كردوویت؟ وتی: (ئوبەی كوڕی كەعب) ﷺ، وتی: دوور مەكەوەرەوە تا دەتبەم بۆ لای، كاتێك بردی بۆ لای؛ ئیمامی (عومەر) وتی: تۆ ئەمەت بەسەردا خوێندووەتەوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: تۆ ئەمەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە؟ وتی: بەڵێ، پاشان ئیمامی (عومەر) فەرمووی: وا گومان دەبەم پلەیەك بەرز بووینەتەوە كە كەس لە دوای خۆمان پێمان ناگاتەوە، (ئوبەی) وتی: بەڵێ وایە بۆ ڕاستی ئەمە لە ئایەتی: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ [الجمعة: ٣]. ئەوانەی دوای ئەمان دێن پێیان ناگەنەوە، وە ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ﴾. ئەوانەی پێشمان كەوتوون لە ئیماندا، وە ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمْ﴾ [الأنفال: ٧٥]. ئەوانەی ئیمانیان لەپاش ئێوە هێناوە و كۆچیان كردووە و جیهادیشیان كردووە لەگەڵتان؛ ئەوانە لە ئێوەن (بەڵام وەكوو ئێوە نین).

(١) "تفسير الطبري" (١١/٦٤١) في تفسير سورة [التوبة: آية: ١٠٠].

ئەم پلەیە لەناو هاوەڵاندا زۆر ڕوون و ئاشکرا بووە، تەنانەت خەلیفەی ڕاشیدین (عومەری کوڕی خەتتاب) ﵁ ڕای وا بوو بەپێی پێشینە و زووتر موسوڵمان بوون سەروەتی دەوڵەت دابەش بکرێت، وەکوو دەفەرموێت: «وَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لَهُ: أَتَجْعَلُ ذَا السَّابِقَةِ كَمَنْ لَا سَابِقَةَ لَهُ؟»[1].

واتە: ئیمامی (عومەر) ﵁ بە (ئەبو بەکری صدیق)ی ﵁ دەوت: چۆن دەبێت ئەوەی پێشینەی هەیە وەکوو ئەوە بێت کە پێشینەی نییە؟

ئەویش ڕای وابوو وەکوو یەك بێت، لەبەرئەوەی ئەوان پێشینەییەتیان بۆ خوا بووە و پاداشتیان لای ئەوە، وەکوو دەڵێت: «إِنَّمَا عَمِلُوا للهِ واجر هم عَلَيْهِ»[2]، ئەگەرچی ئیمامی (عومەر) ﵁ لە کۆتایی تەمەنیدا ڕای چووە سەر ڕاکەی ئیمامی (ئەبو بەکر) ﵁.

وە هەر ئەم پلەدارییە کە ئایەتەکە هێمای بۆ دەکات، بە تایبەت پێشخستنی ناوی مەککییەکان و لکاندنی وشەی ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾ پێشەنگ و یەکەم و سەرەتاکان بە مەککییەکانەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە لە نێوان مەککەیی و مەدینەییەکاندا مەککییەکان لە پێشەوەن و پێشەنگن، هەم لەبەر سەرەتا هەڵگری ئیسلام و قوڕەیشین و سەنتەری دینی عەرەب و پارێزەر و خزمەتگوزاری ماڵەکەی خوان بە چەندەها سەدە.

بۆیە (ئەبو بەکری صدیق) ﵁ لە (ثقيفة بني الساعدة) کاتێك مەدینەییەکان وتیان لە ئێمە سەرکردەیەك و لە کۆچەرییەکان سەرکردەیەك؛ بیری ئەوەی هێنانەوە کە پێغەمبەرایەتی لە قوڕەیشدا بووە و لەگەڵ ئەو پلەوپایەیەی هەیانە: «... وَلَنْ يُعْرَفَ هَذَا الأَمْرُ إِلَّا لِهَذَا الحَيِّ مِنْ قُرَيْشٍ، هُمْ أَوْسَطُ العَرَبِ نَسَبًا وَدَارًا ...»[3].

واتە: ئەم کارە (واتە حوکمڕانی) نەزانراوە بێجگە لە هۆزی (بني هاشم) لە قوڕەیشدا، ئەوان ناودارترین بنەماڵە و شوێن و چاکەی عەرەب بوون.

---

(١) "تفسير القرطبي" (٨/ ٢٣٨) في تفسير سورة [التَّوۡبَة : آيَة : ١٠٠].

(٢) "تفسير القرطبي" (٨/ ٢٣٨) في تفسير سورة [التَّوۡبَة : آيَة : ١٠٠].

(٣) رواه البخاري (٦٨٣٠).

وە فەرمووی: «إِنَّ رَسُوْلَ اللهِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: "الأَئِمَّةُ مِن قُرَيْشٍ" ... إِنَّ اللهَ سَمَّانَا (الْصَّادِقِيْن)، وَسَمَّاكُمُ (الْمُفْلِحِيْن)، وَقَدْ أَمَرَكُمْ أَنْ تَكُوْنُوْا مَعَنَا حَيْثُمَا كُنَّا، فَقَالَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ [التوبة: ١١٩]»[(١)].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیمام و پێشەواکان لە قورەیشن، وە خوای گەورە ناوی بردووین بە (ڕاستگۆکان)، وەکوو دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ [الحشر: ٨]، وە ناوی ئێوەی بردووە بە (ڕزگاربووەکان) وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ [الحشر: ٩]، وە فەرمانی داوە لەگەڵمان بن لە هەرکوێ بین، وەکوو دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾﴾ [التوبة: ١١٩].

ئەم هاوەڵانە بە مەککەیی و مەدینەییەکانەوە هەر ئەو هاوەڵانەن کە لە پەیمانی (حودەیبییە)دا بە هەمان موژدەی ڕازیبوون موژدەیان پێ دراوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ [الفتح: ١٨]، وە هەر لێرەشدا بە: ﴿رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾ [التوبة: ١٠٠] هەمان موژدەیان پێ دەدات، وە بە گشتی ناویان دەبات، وەکوو دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ [الفتح: ٢٩]، وە وادەی لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەیان دەداتێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾﴾ [الفتح: ٢٩]، وە ئەمانە شایستەن بە (ڕاستگۆ) و (ڕزگاربوو) ناو ببرێن: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ [الحشر: ٨]، و ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ [الحشر: ٩].

---

(١) "العواصم من القواصم" لابن العربي المالكي ص٤٣، ٤٤.

**ئایەتی پێنجەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرمویێت: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾ [الحديد: ١٠].

واتە: وەکوو یەك نین لە پلەوپایە و چاکەدا، کەسانێك کە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون لە پێناوی خوا ﷻ لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا ﷺ پێش گرتنەوەی مەککە و دوای گرتنەوەی مەککە ... وە هەردوو لاش خوای گەورە ﷻ وادەی بەهەشتی پێ داون، خوای گەورەش زانا و ووردەکارە بە کارەکانتان[١].

ئەم پلەکارییە دەگەڕێتەوە بۆ: «إِنَّمَا كَانَتِ النَّفَقَةُ قَبْلَ الْفَتْحِ أَعْظَمَ، لِأَنَّ حَاجَةَ النَّاسِ كَانَتْ أَكْثَرَ لِضَعْفِ الْإِسْلَامِ»[٢].

واتە: بۆ ئەوەی پێویستی خەڵکی موسوڵمان زۆرتر بوو، لەبەر سەرەتایی ئیسلام و لاوازی و کەمی موسوڵمانان.

وە لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵان چەند پلەیەکن و پلەبەرزی بۆ پێشووەکانە، وە کردارە چاکەکان بەگوێرەی گەڕانەوەی سوودمەندییە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان، وە پاداشتیش بەگوێرەی کار و هیلاکییە.

وە مەبەستیش لە ﴿الْفَتْحِ﴾ گرتنەوەی مەککەیە، وەکوو (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَالْجُمْهُورُ عَلَى أَنَّ الْمُرَادَ بالفتح هاهنا فَتْحُ مَكَّةَ»[٣].

ئەگەرچی هەندێك لە زانایان بە ڕێککەوتننامەی (حودەیبییە) ناوی دەبەن، لەسەر ئەو لێکدانەوەیەی کە ڕێککەوتنی (حودەیبییە) بووە سەرەتا و هۆکاری بەخشینی خوایی بۆ فەتحی

---

(١) "تفسير البغوي" (٨/ ٣٣) في تفسير سورة [الحديد: آية: ١٠].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٧/ ٢٤٠)، و "فتح القدير" للشوكاني (٥/ ٢٠٢) في تفسير سورة [الحديد: آية: ١٠]، و "محاسن التأويل" للقاسمي (٩/ ١٤٣) في تفسير سورة [الحديد: آية: ١٠].

(٣) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٢) في تفسير سورة [الحديد: آية: ١٠].

مەککە، «وَإِطْلَاقُ الْفَتْحِ عَلَى صُلْحِ الْحُدَيْبِيَةِ وَارِدٌ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ①﴾ [الفَتْح : ١] »(١).

مەبەست لێرەدا پلەوپایەی هاوەڵان و ناودار و دیارەکانی ئیسلامە، کە خەوارج و ڕافیزە و موعتەزیلە و فیرەقەکان قسە لە ئاستیاندا دەکەن.

الشَّيْخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وهذا يدل على فضل الصحابة كلهم رضي الله عنهم، حيث شهد الله لهم بالإيمان، ووعدهم الجنة»(٢).

واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پلەی هاوەڵان و رَضِيَ اللهُ عَنْهُم مژدەی خوایی پێیان بە ئیمان و بەهەشت.

ئەم ئایەتە زۆر بە ڕوونی باسی پلەوپایە و کرداری تەواویان دەکات لای خوا کە چەندە بەرزە، کە بەم دەربڕینانە دەریان دەخات:

١. وشەی ﴿لَا يَسْتَوِي﴾ واتە: وەکوو یەك نین لە چاکە و پاداشتدا، لای یەکەم لەپێش و بەرزترە تا لاکەی تر: «فَنَفْيُ التَّسْوِيَةِ كِنَايَةٌ عَنْ تَفْضِيل أحد جانبين وَتَنْقِيصِ الْجَانِبِ الْآخَرِ نَقْصًا مُتَفَاوِتًا»(٣).

واتە: نەخستنە ئاستی یەك دەربڕینێکی نیمچە شاراوەیە لەسەر بەرزی پلەی لایەکیان بەسەر لاکەی تردا، بە هۆکاری ناتەواوی و جیاوازی.

کۆی زۆری هاوەڵانی پێشەنگ و ناودارانی ئیسلام لە کۆمەڵی یەکەمدا دەردەکەوێت: «ولذلك كان السابقون وفضلاء الصحابة، غالبهم أسلم قبل الفتح»(٤).

واتە: پیاوە بەرزەکانی هاوەڵان زۆریان پێش گرتنەوەی مەککە موسوڵمان بوون.

---

(١) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٢٧/ ٣٧٤) في تفسير سورة [الحَدِيد : آيَة : ١٠].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص٨٣٨ في تفسير سورة [الحَدِيد : آيَة : ١٠].

(٣) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٢٧/ ٣٧٥) في تفسير سورة [الحَدِيد : آيَة : ١٠].

(٤) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص٨٣٨ في تفسير سورة [الحَدِيد : آيَة : ١٠].

**٢.** وە بە وشەی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةً﴾، واتە: ئەوانە خاوەن گەورەترین پلەن.

ئیمامی (الشوكاني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «قَالَ الزَّجَّاجُ: لِأَنَّ الْمُتَقَدِّمِينَ نَالَهُمْ مِنَ الْمَشَقَّةِ أَكْثَرُ مِمَّا نَالَ مَنْ بَعْدَهُمْ، وَكَانَتْ بَصَائِرُهُمْ أَيْضًا أَنْفَذَ»(١).

واتە: ئیمامی (زەجاج) دەڵێت: سەرەتاكان ناخۆشی زۆریان چەشتبوو تا ئەوانەی دوای ئەوان، بۆیە خاوەن ئەزموون و چاوكراوەتر بوون بۆ تێگەیشتنی دین و كاركردن لە پێناویدا.

ئیمامی (الشوكاني) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَقَدْ أَرْشَدَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى هَذِهِ الْفَضِيلَةِ بِقَوْلِهِ فِيمَا صَحَّ عَنْهُ: "لَوْ أَنْفَقَ أَحَدُكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ"»(٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ ئەم جیاوازی پلەوپایەیە كردووە كە دەفەرموێت: گەر هەر یەكێكتان بە هاوشێوەی شاخی ئوحود ئاڵتوون ببەخشێتەوە؛ ناگاتە لەپی دەستی یەكێكیان، بەڵكوو ناگاتە نیوەی لەپی دەستیشیان.

**ئایەتی شەشەم:** خوای گەورە جَلَّ جَلَالُهُ دەفەرموێت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧﴾ [التوبة: ١١٧].

واتە: خوای پەروەردگار بە سۆز و بەزەیی خۆی هەواڵ دەدات كە لە پێغەمەرەكەی و ﷺ كۆچەری و مەدینەییەكان خۆش بووە، تاوانەكانیان سڕدراوەتەوە و چاكەكانیانی بۆ زیاد كردوون و پلەوپایەیانی بەرز كردووەتەوە، بە هۆكاری هەستان بەو كارە قورسانەی كە كردوویانە.

---

(١) "فتح القدير" للشوكاني (٥/ ٢٠٢) في تفسير سورة [الحديد : آية : ١٠].

(٢) "فتح القدير" للشوكاني (٥/ ٢٠٢) في تفسير سورة [الحديد : آية : ١٠]، والحديث رواه البخاري (٣٦٧٣)، وأبو داود (٤٦٥٨)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٥١)، وأحمد في "المسند" (١١٠٧٩)، والطبراني في "الأوسط" (٦٨٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٩٠٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٨٨).

﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾: یەكێك لەو كارانە: بە دوای پێغەمبەرەكەیانەوە ڕۆیشتن بۆ شەڕكردن لەگەڵ دوژمناندا لە شەڕی (تەبوك) كە كاتێكی زۆر گەرم و نەبوونی بوو، وە دوژمنیش زۆر بوون، ئەمانە كە هەمووی هۆكاری خۆدزینەوە بووە، پشتیان بە خوا بەست و ڕۆیشتن پاش ئەوەی خەریك بوو دڵەكانیان لادات بەلای دانیشتن و حەوانەوەدا، بەڵام خوای پەروەردگار دڵیانی جێگیر و بەهێز كرد.

﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾: پاشان لێیان خۆش بوو، خوای پەروەردگار بە سۆز و بەزەییە پێیان[(١)].

(محمد صديق حسن خان) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وذكر التوبة أولاً قبل ذكر الذنب تفضلاً منه وتطييباً لقلوبهم، ثم ذكر الذنب بعد ذلك وأردفه بذكر التوبة مرة أخرى تعظيماً لشأنهم، وليعلموا أنه تعالى قد قبل توبتهم وعفا عنهم، ثم أتبعه بقوله: (إنه بهم رؤوف رحيم) تأكيداً لذلك أي رفيق بعباده لأنه لم يحملهم ما لا يطيقون من العبادات، وبين الرؤوف والرحيم فرق لطيف وإن تقاربا في المعنى، قال الخطابي: قد تكون الرحمة مع الكراهة ولا تكاد الرأفة تكون معها»[(٢)].

واتە: خوای پەروەردگار لێخۆشبوونی باس كردووە پێش باسكردنی تاوانەكە، بۆ دەربڕینی بەخشندەیی خۆی و دڵخۆشكردنی هاوەڵان، پاشان باسی تاوانەكەی كردووە كە ﴿مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾ خەریك بوو دڵیان لابدات، پاشان سەرلەنوێ باسی لێخۆشبوونی كردووەتەوە جارێكی تر، بۆ دەربڕینی پلەوپایەیان كە تاوانبار نین، پاشان بەدوای دا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ خوای گەورە بۆ ئەوان زۆر بەسۆز و بەزەییە، تاوەكوو بزانن كە تەوبەكەیانی وەرگرتووە و لێیان خۆش بووە، وەكوو ئیمامی (الخطابي) دەڵێت: دەشێت بەزەیی لەگەڵ ڕقلێبووندا بێت، بەڵام سۆز (رأفة) بە هیچ شێوەیەك ڕقلێبوونی لەگەڵدا نابێت.

---

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٥٤ في تفسير سورة [التوبة : آية : ١١٧].

(٢) "فتح البيان في مقاصد القرآن" لصديق حسن خان (٥/٤١٨) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١١٧].

ئیمامی (الشوكاني) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «وَلَيْسَ مِنْ لَازِمِ التَّوْبَةِ أَنْ يَسْبِقَ الذَّنْبُ مِمَّنْ وَقَعَتْ منه أوله لِأَنَّ كُلَّ الْعِبَادِ مُحْتَاجٌ إِلَى التَّوْبَةِ وَالِاسْتِغْفَارِ»(١).

واتە: مەرج نییە لەپێش هەموو تەوبەیەکەوە تاوانێك هەبێت، بەڵکوو هەموو بەندەیەك پێویستی بە تەوبە و داوای لێخۆشبوون هەیە، گەر تاوانیش نەبێت؛ نەکردنی کاری پێشینە و لەپێشتر لە کارەکاندا هۆکارە بۆ داوای لێخۆشبوون.

ئیمامی (الطنطاوي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «ومنهم من يرى أن المقصود بذكر التوبة هنا التنويه بفضلها، ... ومنهم من يرى أن المراد بالتوبة هنا: دوامها لا أصلها، وإلى هذا المعنى أشار بعضهم بقوله: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ أي: أدام توبته على النبي والمهاجرين والأنصار ... من أن النبي معصوم من الذنب، وأن المهاجرين والأنصار لم يفعلوا ذنبا في هذه القضية، بل اتبعوه من غير تلعثم، قلنا: المراد بالتوبة في حق الجميع دوامها لا أصلها»(٢).

واتە: زانایان دەڵێن مەبەست لە تەوبە و لێخۆشبوونیان ئاگادارکردنەوەیە بە پلەوپایەیان ... وە هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لێی بەردەوام لێخۆشبوونە بۆیان بۆیە بە وشەی ڕابردوو (تاب) باسی کردووە نەك ئێستا لێیان خۆش دەبم و بەس، واتە: بەردەوام لێخۆشبوون بۆ پێغەمبەر ﷺ و کۆچەر و پشتیوانەکانە ... لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پارێزراوە (معصوم) لە تاوان، وە کۆچەری و پشتیوانەکان لەم ڕووداوەدا هیچ تاوانێکیان ئەنجام نەداوە، بەڵکوو شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ.

(ابن عباس) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «مَنْ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ لَمْ يُعَذِّبْهُ أَبَدًا»(٣).

واتە: هەرکەسێك خوا لێی خۆش بوو بە هیچ شێوەیەك سزای نادات.

**مەبەست لێرەدا:** خوای پەروەردگار ناوی پێغەمبەری ﷺ لکاندووە بە هاوەڵانییەوە بە گشتی، کۆچەری و پشتیوانەکان و مژدەی لێخۆشبوونی دوو جار پێداون، وە وادەی بەسۆزی و

(١) "فتح القدير" للشوكاني (٢/ ٤٧٠) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١١٧].

(٢) "التفسير الوسيط للقرآن الكريم" لطنطاوي (٦/ ٤١٨، ٤١٩) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١١٧].

(٣) "تفسير البغوي" (٤/ ١٠٥) في تفسير سورة [التوبة : آية : ١١٧].

بەبەزەیی بوونی بەتایبەت بۆ تەرخان کردوون، ئەمە پلەوپایەی هاوەڵانە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

خۆ ئەگەر ناوی پێغەمبەریان لەگەڵدا باس نەکرایە ئەوا ڕافیزە و عەقڵانییەکان تاوانیان دەخستە پاڵیان و بە کەسی سادە ناویان دەبردن.

**ئایەتی حەوتەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾﴾ [البَقَرَة : ١٤٣].

واتە: هەروەها ئێوەمان کردووە بە گەلێکی چاکترین و دادپەروەرترینی نێو گەلان، لە هەموو کارە دینییەکاندا ناوەندی پێکاندنن، لە نێوان زیادەڕەوی و کەمڕەویدا لە ناسینی خوا و پێغەمبەران و شەریعەتدا ... بەم هۆکارە شاهیدحاڵی سەر هەموو گەلانن لە ڕۆژی دواییدا، بە هۆکاری زانست و دادپەروەری (العلم والعدل) و باشترین شاهید و وەسفکاری ئەم گەلە ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ بەسەریەوە[(١)].

وە پێغەمبەر ﷺ شەرحی کردووە بە (عدلاً)[(٢)].

**مەبەست لە ئایەتەکە:** یەکەم چین و باشترین کۆمەڵی ئەم ئیسلامە کە خوای گەورە کردوویەتی بە گەلێکی ڕاست و دروست و دادپەروەر و پلەبەرزیان بەسەر گەلانی تردا بە شاهیدحاڵی پێغەمبەرەکەیان، وە خۆشیان شاهیدحاڵ بن بەسەر گەلانی تردا؛ کۆی هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، کە ئایەتەکە بەم وەسفانە باسی دەکات:

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٧٠ في تفسير سورة [البَقَرَة : آيَة : ١٤٣].

(٢) "تفسير ابن كثير" (١/ ٤٥٥) في تفسير سورة [البَقَرَة : آيَة : ١٤٣]. عن أبي سعيد الخدري ﵁، وفي "المسند" برقم (١١٠٦٨).

**١. ﴿ أُمَّةً وَسَطًا ﴾: (الخيار والعدل): گەلێکی خێرترین و دادپەروەرترین لەناو گەلاندا لە هەموو ڕوویەکەوە، (كنتم خير أمة) و (وسط) مەبەست پێی ناوەندە لە نێوان زیادەڕەوی و کەمرەویدا.**

(الحسن البصري) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت: «سُنَّتُكُمْ وَاللهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ بَيْنَهُمَا: بَيْنَ الْغَالِي وَالْجَافِي»[(١)].**

**واته: حەق و سوننەت سوێند بە خوا لە نێوان زیادەڕەوی و کەمرەویدایە.**

الشَّيْخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت: «وفي الآية دليل على أن إجماع هذه الأمة، حجة قاطعة، وأنهم معصومون عن الخطأ، لإطلاق قوله: ﴿وَسَطًا ﴾ »[(٢)].**

**واته: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا کۆدەنگی هاوەڵان و زانایان بەڵگەیە لە دوای قورئان و فەرموودە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە وەسفیان دەکات بە ﴿وَسَطًا ﴾.**

**٢. ﴿شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾: قَالَ الْعَطَاء: «أُمَّةُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شُهَدَاءُ عَلَى مَنْ يَتْرُكُ الْحَقَّ مِنَ النَّاسِ أَجْمَعِينَ»[(٣)].**

**واته: موسوڵمانان شایەتیدەرن لەسەر هەرکەسێك کە لابدات لە حەق لە خەڵکی.**

الشَّيْخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) رَحِمَهُ اللَّهُ **دەڵێت: «بسبب عدالتهم وحكمهم بالقسط، يحكمون على الناس من سائر أهل الأديان، ولا يحكم عليهم غيرهم، فما شهدت له هذه الأمة بالقبول، فهو مقبول، وما شهدت له بالرد، فهو مردود»[(٤)].**

**واته: بە هۆکاری دادپەروەریتانەوە حوکم دەدەن بەسەر خەڵکانێك کە لەسەر دینە ڕابوردوو و کاتییەکانی پێشوون، ئەوەی ئەم ئوممەتە وەری بگرێت و ڕەددی دایەوە بەو شێوەیە.**

---

(١) رواه الدارمي في "السنن" (٢٢٢)، وفي "شرح العقيدة الطحاوية" (٢/ ٣٦٢).

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص٧٠ في تفسير سورة [البَقَرَةِ : آيَة : ١٤٣].

(٣) "تفسير البغوي" (١/ ١٥٩) في تفسير سورة [البَقَرَةِ : آيَة : ١٤٣].

(٤) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص٧٠ في تفسير سورة [البَقَرَةِ : آيَة : ١٤٣].

٣. ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا﴾: «ويكونَ رسولي محمدٌ صلى الله عليه وسلم شهيدًا عليكم، بإيمانكم به وبما جاءكم به من عندي»(١).

واتە: پێغەمبەرەکەم ﷺ شایەتە لەسەرتان بە ئیمانهێنانتان پێی و بەوەی کە بۆی هێناون لەلایەن منەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ٤١﴾ [النساء: ٤١].

واتە: هەموو گەلێك شاهیدحاڵی هەیە، تۆش ئەی (محمد ﷺ) شاهیدحاڵی سەر ئەم گەلەی.

ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی تری گەورەیە لەسەر پلەوپایە و بەرێزی و کامڵی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەوەی خاوەن بەرنامەی پڕ زانستی ڕاست و دروست و سەلامەت لە هەموو لادان و گومڕاییەکن و کارپێکارن پێی، هیچ گەلێکی ڕابوردوو ناگاتە ئێوە و داهاتووش پەیوەستن بە شوێنکەوتەی ئێوەوە.

ئەمە ئاستی پلەی زانستی و ئیمان و خێر و دادپەروەرییانە، لەبەرئەوە شایستەن ببنە شاهید بەسەر گەلان و کەسانی ترەوە، لە پێش و دوای خۆیان، وە لە دونیا و ڕۆژی دوایی، ئەم پلەیەیان بە شاهیدی پێغەمبەرەکەیانە ﷺ کە پێی گەیاندوون و باوەڕیان پێ کردووە و گەیاندوویانە.

جا کەسانێك پێغەمبەر ﷺ شاهیدحاڵی پرخێر و چاکیان بێت، ئایا پێویست بە تەزکییە و شاهیدحاڵی کەسی تر دەکات؟! وە گەر هاوەڵان ﷺ شاهید بن بەسەر کەسانی ترەوە؛ کێ هەیە شاهید بێت بەسەر ئەمانەوە بێجگە لە خوا و پێغەمبەرەکەیان ﷺ؟!

ئیمامی (القرطبي) ﷺ دەڵێت: «فَالصَّحَابَةُ كُلُّهُمْ عُدُولٌ، أَوْلِيَاءُ اللهِ تَعَالَى وَأَصْفِيَاؤُهُ، وَخِيَرَتُهُ مِنْ خَلْقِهِ بَعْدَ أَنْبِيَائِهِ وَرُسُلِهِ. هَذَا مَذْهَبُ أَهْلِ السُّنَّةِ»(٢).

واتە: لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا هاوەڵان هەموویان تەزکییەکراون بە دادپەروەری و ئەولیا و هەڵبژاردەی خوان لەپاش پێغەمبەران.

---

(١) "تفسير الطبري" (٣/ ١٤٦) في تفسير سورة [البقرة: آية: ١٤٣].

(٢) "تفسير القرطبي" (١٦/ ٢٩٩) في تفسير سورة [الفتح: آية: ٢٩].

**ئایەتی هەشتەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرمویێت: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١١٠﴾ [آل عمران: ١١٠].

واتە: ئێوە باشترینی گەلانن، وە سوودمەنترین کەسن بۆ خەڵکان، بەوەی فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن[1].

الشَّيخ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) رَحِمَهُ الله دەڵێت: «يمدح تعالى هذه الأمة ويخبر أنها خير الأمم التي أخرجها الله للناس، وذلك بتكميلهم لأنفسهم بالإيمان المستلزم للقيام بكل ما أمر الله به، وبتكميلهم لغيرهم بالأمر بالمعروف والنهي عن المنكر المتضمن دعوة الخلق إلى الله»[2].

واتە: خوای گەورە وەسفی ئەم ئوممەتە دەکات و هەواڵ دەدات بە چاکترین ئوممەت لەناو گەلانی تردا، بە هۆکاری کامڵکردنی خۆتان بە ئیمان و هەستان بە جێبەجێکردن پێی، وە تەواوکردنی خەڵکانی تر بە ڕێگەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، بە هۆکاری بانگەوازیکردن بۆ لای خوا ﷻ.

ئیمامی (الطبري) رَحِمَهُ الله دەیهێنێت کە: «عَنِ السُّدِّيِّ: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ [آل عمران: ١١٠]، قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: لَوْ شَاءَ اللَّهُ لَقَالَ: «أَنْتُمْ»، «فَكُنَّا كُلَّنَا» وَلَكِنْ قَالَ: ﴿كُنتُمۡ﴾ [البقرة: ٢٣] «فِي خَاصَّةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمَنْ صَنَعَ مِثْلَ صَنِيعِهِمْ، كَانُوا خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ»»[3].

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٩٣) في تفسير سورة [آل عمران: آية: ١١٠].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص١٤٣ في تفسير سورة [آل عمران: آية: ١١٠].

(٣) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" ص١٤٣ في تفسير سورة [آل عمران: آية: ١١٠].

واتە: (عومەری کوڕی خەتتاب) ﵁ لە تەفسیری ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ﴾ دا دەڵێت: گەر خوا ﷻ ویستی لێبوایە دەیفەرموو: هەمووتان «أَنْتُمْ»، ئەو کاتە هەموو موسوڵمانێکی دەگرتەوە، بەڵام فەرمووی: ئێوە «كُنْتُمْ»، کە بە تەنها هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوانەی کە کارەکانیان هاوشێوەی هاوەڵانن.

(ابن كثير) ﵀ دەڵێت: «وَالصَّحِيحُ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ عامةٌ فِي جَمِيعِ الْأُمَّةِ، كُلُّ قَرْن بِحَسْبِهِ، ... ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا﴾ أَيْ: خِيَارًا ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ ... قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أَنْتُمْ تُوفُونَ سَبْعِينَ أُمَّةً، أَنْتُمْ خَيْرُهَا، وأَنْتُمْ أَكْرَمُ عَلَى الله عزَّ وجَلَّ"(١) ... وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "أُعْطِيتُ مَا لَمْ يُعْطَ أَحَدٌ مِنْ الأَنْبِيَاءِ". فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا هُوَ؟ قَالَ: " نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ وَأُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ، وَسُمِّيتُ أَحْمَدَ، وَجُعِلَ التُّرَابُ لِي طَهُورًا، وَجُعِلَتْ أُمَّتِي خَيْرَ الأُمَمِ"(٢)»(٣).

وە ئیمامی (الطبري) ﵀ دەڵێت: «قَالَ أَبُو جَعْفَرٍ: وَأَوْلَى هَذِهِ الْأَقْوَالِ بِتَأْوِيلِ الْآيَةِ مَا قَالَ الْحَسَنُ وَذَلِكَ أَنَّ: ... رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: «أَلَا إِنَّكُمْ وَفَّيْتُمْ سَبْعِينَ أُمَّةٍ أَنْتُمْ آخِرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ»»(٤).

واتە: ڕای (ابن كثير) و (طبري) لەسەر ئەوەیە کە ئەم ئایەتە کۆی گشتی گەلی موسوڵمانان دەگرێتەوە، هەر سەردەمەو بەگوێرەی خۆی، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا﴾، واتە ئێوەمان گێڕاوە بە گەلێکی خێر و دادپەروەر، وە (حەسەنی بەصری)ش ﵀ بەڵگەکاری بۆ

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٢٠٠١٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، ورواه الطبراني في "الكبير" (١٠٣٠) والحاكم في "المستدرك" (٦٩٨٨).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٧٦٣)، والفاكهي في "أخبار مكة" (١٨٧٢)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣١٦٤٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٠٢٤)، والآجري في "الشريعة" (١٠٤٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٤٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٩٣٩)، وفي "الإرواء" (٢٨٥).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٢/ ٩٤) في تفسير سورة [آل عمران : آية : ١١٠].

(٤) "تفسير الطبري" (٥/ ٦٧٥) في تفسير سورة [آل عمران : آية : ١١٠].

دەکات بە فەرموودەی: «أَنْتُمْ تُوفُونَ سَبْعِينَ أُمَّةً، ...»، واتە: ئێوە تەواوکەری حەفتاهەمین گەلن، وە ئێوە کۆتاهەمین و بەڕێزترینیانن لای خوای گەورە، وە فەرموودەی: «... وَجُعِلَتْ أُمَّتِي خَيْرَ الأُمَمِ»، واتە: کۆمەڵێك بەخشندەیی بە من دراوە کە بە هیچ کامێك لە پێغەمبەرانی تر نەدراوە، ... ئوممەتەکەم گێڕدراوە بە چاکترین و خێرترینی ئوممەتانی تر.

**مەبەست لەم ئایەتەدا:** وەسفی ڕاستەوخۆی هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، بە خێرترین ئوممەتی سەر ڕووی دونیا، بە هۆکاری جێبەجێکردنی دین بە تەواوترین شێوە، وە موسوڵمانان بە پاشکۆی هاوەڵان، بە مەرجی جێبەجێکردنی وەکوو ئەوان بە پلە دوو بەر ئایەتەکە دەکەون، ئەمەش یەکێکە لەو ئایەتانەی کە پلەوپایەبەرزی و کاملّی هاوەڵان دەردەخات.

**ئایەتی نۆیەم:** خوای گەورە ﷻ دەفەرمویت: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾﴾ [الزمر: ٣٣].

(ابن كثير) رحمه الله دەڵێت: «قَرَأَ الرَّبِيعُ بْنُ أَنَسٍ: "الَّذِينَ جَاءُوا بِالصِّدْقِ" يَعْنِي: الْأَنْبِيَاءَ، "وَصَدَّقُوا بِهِ" يَعْنِي: الْأَتْبَاعَ»[1].

واتە: ئەوانەی ڕاستیان هێناوە پێغەمبەرانن عليهم السلام، وە ئەوانەی ئەوانەی بەڕاستیان داناوە و باوەڕیان پێکردوون شوێنکەوتووەکانیانە، ئەوانە ﴿هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ لەخواترسن.

(ابن عاشور) رحمه الله دەڵێت: «مَنْ ثَبَتَ لَهُ هَذَا الْوَصْفُ كَانَ مُرَادًا بِهِ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمْ جَمَاعَةٌ ... وَقَرِينَتُهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ»[2].

واتە: ئەوەی ئەو وەسفەی پێ مەبەستە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، بە بەڵگەی وشەی ئەوانە «أُولَئِكَ»، کە بە کۆ ناوی بردوون.

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٩٩) في تفسير سورة [الزمر: آية: ٣٣].

(٢) "التحرير والتنوير" لابن عاشور (٢٤/ ٨) في تفسير سورة [الزمر: آية: ٣٣].

(ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَهَذَا الصِّنْفُ الَّذِي يَقُولُ الصِّدْقَ وَيُصَدِّقُ بِهِ، ... وَالصَّحَابَةُ الَّذِينَ كَانُوا يَشْهَدُونَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَأَنَّ الْقُرْآنَ حَقٌّ، هُمْ أَفْضَلُ مَنْ جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ بَعْدَ الْأَنْبِيَاءِ»[1].

واتە: ئەو ئایەتە مەبەست پێی ئەو کۆمەڵەیە کە ڕاست دەڵێت و باوەڕی پێ دەکرێت، هاوەڵان کە ئیمانیان بە (تەوحید) و قورئان هێناوە باشترین کەسانێکن کە ڕاستیان هێناوە و هەڵگرین و باوەڕیان پێ هێناوە.

**مەبەست لە ئایەتەکەدا:** وەسفی هاوەڵانە بە ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ ڕاستگۆترین بوون بە باوەڕپێکردنی قورئان، وە خاوەن تەقوا و لەخواترس بوون.

**ئایەتی دەیەم:** خوای گەورە جَلَّ جَلَالُهُ دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾﴾ [التحريم: ٨].

واتە: ڕۆژێك دەبێت خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتوانی سەرشۆڕ ناکات و ڕووناکییەکیان پێ دەدات، ڕووناککەرەوەی بەردەم و لای ڕاستیانە و دەڵێن: خوایە ڕووناکییەکەمان بۆ تەواو بکەیت و لێمان خۆشبیت، تۆ باڵادەستیت بەسەر هەموو شتێکدا.

وە ناوبراون بە ﴿هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ لە ئایەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ [الأعراف: ١٥٧].

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٣٣).

وە لە ئایەتی: ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾﴾ [التوبة: ٨٨].

وە ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾﴾ [التوبة: ٢٠].

**ئەمانە و دەیەها ئایەتی قورئانی وەسف و باسی پلەبەرزی و کامڵی هاوەڵان دەکات، کە باشترین ئیمان و هیدایەت و شارەزایی و گەیاندنی دینییان بەدەستهێناوە و شوێنی ڕەزامەندی خواین، بەو مانایەی قابیلی تۆمەت و توانج و ڕەخنەی قورس نین، کە ببێتە هۆکاری گومان لێیان و بریندارکردنیان و شوێنی متمانە نەبوون بۆ وەرگرتنی دین لێیانەوە.**

  

# فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دادوەری هاوەڵان

## (الأحاديث النبوية على عدالة الصحابة)

**فەرموودەی یەکەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَوْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِيفَهُ»[١].

واتە: قسە بە هاوەڵانم مەڵێن، ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە هاوشێوەی شاخی ئوحود ئاڵتوون ببەخشێتەوە، ناگاتە لەبی دەستی یەکێکیان، وە تەنانەت نیوەی لەپی دەستیشیان.

هۆکاری وتنی ئەم فەرموودەیە وەکوو (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وَكَانَتْ هَذِهِ الْمُشَاجَرَةُ بَيْنَهُمَا فِي بَنِي جَذِيمة الَّذِينَ بَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بَعْدَ الْفَتْحِ، فَجَعَلُوا يَقُولُونَ: "صَبَأْنَا، صَبَأْنَا"، فَلَمْ يُحْسِنُوا أَنْ يَقُولُوا: "أَسْلَمْنَا"، فَأَمَرَ خَالِدٌ بِقَتْلِهِمْ وَقَتْلِ مَنْ أُسِرِ مِنْهُمْ، فَخَالَفَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ وَغَيْرُهُمَا. فَاخْتَصَمَ خَالِدٌ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بِسَبَبِ ذَلِكَ»[٢].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەرکردایەتی (خالیدی کوڕی وەلید) رضي الله عنه هاوەڵانی نارد بۆ هۆزی (بني جذيمة) لەپاش گرتنەوەی مەککە، کاتێك هاوەڵانیان بینی وتیان: (صَبَأْنَا، صَبَأْنَا): (ئەمە وشەیەکە قوڕەیش بەو کەسانەی دەوت کە موسوڵمان دەبوون، بە مانای لە دین هەڵگەڕاوە)، نەیان دەزانی بڵێن موسوڵمان بووین، (خالیدی کوڕی وەلید) فەرمانی دا بە کوشتنیان، هەندێك لە هاوەڵان دژی وەستانەوە، یەکێك لەوانە (عبد الرحمن ی کوڕی عەوف) بوو رضي الله عنه، ئەمە بووە هۆکاری دەمەقاڵێیان، (خالید) رضي الله عنه بە (عبد الرحمن)ی وت: «تَسْتَطِيلُونَ عَلَيْنَا بِأَيَّامٍ سَبَقْتُمُونَا بِهَا»، واتە: قسە بەسەرماندا درێژ دەکەنەوە بەهۆی ئەوەی چەند رۆژانێك لەپێش ئێمەوە

---

(١) رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١)، وأبو داود (٤٦٥٨)، والترمذي (٣٨٦١)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٥٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٩٤)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٥)، والطبراني في "الصغير" (٩٨٢).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٨/ ١٢) في تفسير سورة [الحديد : آية : ١٠].

موسوڵمان بوون؟! «فَبَلَغَنَا أَنَّ ذَلِكَ ذُكِر لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»، واتە: ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ئەم فەرموودەیەی فەرموو.

لە کۆتایی ئەم کارەشدا (عبد الرحمن و عبد الله ی کوڕی عومەر ...) ﭭ و هاوەڵانیان ئەم ڕاستییەیان پێکا و کاملتر بوون لە تێگەیشتنی دیندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەدوای ئەم هەواڵە دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ مَرَّتَيْنِ»[1].

واتە: دوو جار فەرمووی: خوایە من بەریم لەو کارەی کە (خالید) کردوویەتی.

ئەمە جێبەجێکردنی فەرمانی خواییە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ٢١٦﴾ [الشعراء: ٢١٦].

واتە: گەر فەرمانی تۆیان شکاند، بڵێ من بەریم لە کارەکانتان.

کەواتە لەناو هاوەڵاندا پۆلێن کراون، ئیماندارانی سەرەتا و کۆچەرییەکانی مەدینە تاوەکوو پێش ڕێککەوتنی حودەیبییە پلە یەکن لە ئیسلامدا، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١٠﴾ [الحديد: ١٠].

(ابن تیمیة) ﵀ دەڵێت: «فإن قيل: فلم نهى خالد عن أن يسب أصحابه إذا كان من أصحابه أيضا؟ وقال: "لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ما بلغ مد أحدهم ولا نصيفه".

قلنا: لأن عبد الرحمن بن عوف ونظراءه هم من السابقين الأولين الذين صحبوه في وقت كان خالد وأمثاله يعادونه فيه وأنفقوا أموالهم قبل الفتح وقاتلوا وهو أعظم درجة من الذين أنفقوا من بعد الفتح وقاتلوا وكلا وعد الله الحسنى فقد انفردوا من الصحبة بها لم يشركهم فيه خالد ونظراؤه ممن أسلم بعد الفتح، الذي هو صلح الحديبية، وقاتل أن يسب أولئك الذين

(١) رواه البخاري (٤٣٣٩)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٢٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٤٩)، وأحمد في "المسند" (١٣٨١٢)، والبزار في "المسند" (٦٠٠٦)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٩٤٣٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٣٢٣٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٩٢٣)، و"صحيح الجامع الصغير" (٣٣٨٦).

صحبوه قبله ومن لم يصحبه قط نسبته إلى من صحبه كنسبة خالد إلى السابقين وأبعد»[(١)].

واته: گەر وتیان بۆچی ڕێگری لە (خالید) کرد کە قسە بە (صحابة) بڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو (صحابة)یەتی؟ دەڵێین: لەبەر ئەوەی (عبد الرحمن) و هاوشێوەکانی لە پێشەنگی ئەو هاوەڵانەیە کاتێك پشتیوانی ئیسلام بوون کە (خالید) و هاوشێوەکانی دژایەتییان دەکرد، ئەوانەی کە پێش حودەیبییە دەیانبەخشی و دەجەنگان پلەی گەورەیان هەیە، تا ئەوانەی پاش ئەوان، ئەوان هاوەڵی تایبەتن، کەس بەشدارییان ناکات لەگەڵیاندا وەکوو (خالید) و هاوشێوەکانی، بۆیە شایستەی قسەپێوتن نین، وە ئەوەی بە هیچ شێوەیەك هاوەڵییەتی نەکردبێت؛ لە پۆلێنکردندا لەگەڵ ئەوانەی هاوەڵییەتییان کردووە وەکوو هاوشێوەی (خالید) وایە لەگەڵ پێشەنگەکانی ئیسلامدا و دوورتریش.

**لەم ڕیوایەتانەدا زۆر ڕوونتر هەڕەشە دەکات لەوانەی کە قسە بە هاوەڵان دەڵێن:**

١. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «دَعُوا لِي أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنْفَقْتُمْ مِثْلَ أُحُدٍ – أَوْ مِثْلَ الْجِبَالِ – ذَهَبًا، مَا بَلَغْتُمْ أَعْمَالَهُمْ»[(٢)].

واته: واز لە هاوەڵانم بێنن، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر بەقەد شاخی ئوحود، یاخود شاخەکان ئاڵتوون ببەخشنەوە ناگەنە کارەکانیان.

٢. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «أَحْسِنُوا إِلَى أَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»[(٣)].

واته: چاك بن لەگەڵ هاوەڵانمدا، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان.

٣. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ، وَالْمَلَائِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[(٤)].

(١) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٧٦.

(٢) رواه أحمد في "المسند" (١٣٨١٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، رجاله ثقات رجال الشيخين، وأخرجه ضياء الدين في "المختارة" (٢٠٤٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٩٢٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٣٨٦).

(٣) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٦٧٢٨)، والنسائي في "الكبرى" (٩١٧٥)، وأحمد في "المسند" (١٧٧)، والبزار في "مسنده" (١٦٦)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٤٣)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٤٦٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٨٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٤٣٠).

(٤) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٨)، والطبراني في "الكبير" (١٢٧٠٩)، وفي"الدعاء" (٢١٠٨)، وأبوبكر بن الخلال في =

واتە: ئەوەی قسە بە هاوەڵانم دەڵێت نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت.

٤. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: «إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ الْقَدَرُ فَأَمْسِكُوا، وَإِذَا ذُكِرَ النُّجُومُ فَأَمْسِكُوا»(١).

واتە: گەر باسی هاوەڵانم کرا بێدەنگ بن، وە گەر باسی قەزاوقەدەر کرا بێدەنگ بن، وە گەر باسی ئەستێرە کرا بێدەنگ بن.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی خستووەتە ڕیزی بابەتە عەقیدەییەکانەوە، وەك: (القضاء والقدر، الشرك) و ئەستێرە پەرستییەوە، بۆیە زانایان هەڵوێستی دەربارەی هاوەڵان بە بابەتێکی بەرنامەیی و بیروباوەڕی دینی ڕیزبەندیان کردووە، بۆیە ئەم بابەتانەیان بەناوی مەنهەجەوە تۆمار کردووە، وەکو: (منهج إعتقاد أهل السنة)، (عقيدة أهل السنة في الصحابة)، (أصول إعتقاد أهل السنة)، (عدالة الصحابة في منهج أهل السنة).

**فەرموودەی دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: «خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ»(٢).

واتە: باشترینی ئوممەتەکەم کەسانی ئەم سەدەیەیە، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان.

لە ڕیوایەتێکی تردا بە: «خَيْرُ النَّاس ...»(٣) هاتووە.

---

= "السنة" (٨٣٣)، والآجري في "الشريعة" (١٤٧٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٣٤٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٦٢٨٥).

(١) رواه الطبراني في "الكبير" (١٤٢٧)، وعبدالرزاق في "الأمالي" (٥١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٤/١٠٨)، وفي "القضاء والقدر" (٤٤٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٤٥).

(٢) رواه البخاري (٣٦٥٠)، وأحمد في "المسند" (٢٢٩٦٠)، وأبو يعلى في "المسند" (٧٤٢٠)، والطبراني في "الكبير" (٦٥٨)، والطيالسي في "المسند" (٢٩٧)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٣١٦٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/٧٨)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٦١٢٥).

(٣) رواه البخاري (٢٦٥٢، ٣٦٥١)، ومسلم (٢٥٣٣)، والترمذي (٢٢٢١)، والنسائي في "الكبرى" (٥٩٨٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٧٢٧)، وأحمد في "المسند" (٣٥٩٤)، والطبراني في "الكبير" (٢١٨٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٨٧١)، =

واتە: باشترین خەڵکی ... .

وە دەفەرموێت: «بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي آدَمَ، ...»(١).

واتە: خوای پەروەردگار لە باشترین سەدەیا منی ناردووە، واتە لەناو باشترین چین و توێژێکدا.

وە مەبەستیش هاوەڵانییەتی، لەبەر ئەو چاکەیەی کە مەبەستی پێیەتی لەواندا، کە دەرنەچوونە لە دینداری و کامڵی خووڕەوشت.

ئەم فەرموودەیە تەواوکاری وادەکەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران: ١١٠].

واتە: ئێوە خێرترین گەلی نێردراون بۆ خەڵکی.

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «الِاعْتِبَارَ فِي الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ بِجُمْهُورِ أَهْلِ الْقَرْنِ وَهُمْ وَسَطُهُ وَجُمْهُورُ الصَّحَابَةِ انْقَرَضُوا بِانْقِرَاضِ خِلَافَةِ الْخُلَفَاءِ الْأَرْبَعَةِ حَتَّى أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَقِيَ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ إلَّا نَفَرٌ قَلِيلٌ وَجُمْهُورُ التَّابِعِينَ بِإِحْسَانِ. انْقَرَضُوا فِي أَوَاخِرِ عَصْرِ أَصَاغِرِ الصَّحَابَةِ فِي إمَارَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ وَعَبْدِ الْمَلِكِ، وَجُمْهُورُ تَابِعِي التَّابِعِينَ انْقَرَضُوا فِي أَوَاخِرِ الدَّوْلَةِ الْأُمَوِيَّةِ؛ وَأَوَائِلِ الدَّوْلَةِ الْعَبَّاسِيَّةِ»(٢).

واتە: ئەم سێ سەدەیە بە کۆی گشتی بە هاوەڵان و کەسانی ئەو سەدەیە دەوترێن کە تیایدا ژیاون، کۆی هاوەڵان لە دونیادا نەمان بە کۆتایی (خەلیفەکانی ڕاشیدین)، تا ئەو ئاستەی کەسانی ئەهلی بەدر چەند کەسێکی کەمیان مابوو، وە کۆی (تابعين) لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵانی بچووکدا کۆتاییان هات لە سەردەمی (عبد الله بن الزبير) رضي الله عنه و (عبد الملك بن مروان)دا، وە کۆی (تابعي تابعين) لە کۆتایی سەردەمی ئەمەوییەکان و سەرەتای سەردەمی عەبباسییەکاندا لە

= والبزار في "المسند" (١٧٧٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٤٠٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٤٦٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٨٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٦٦)، والآجري في "الشريعة" (١١٥١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٧٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠/ ١٣٨).

(١) رواه البخاري (٣٥٥٧)، وأحمد في "المسند" (٨٨٥٧)، وأبو يعلى في "المسند" (٦٥٥٣)، والبيهقي في "الشعب" (١٣٢٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٦١٤).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١٠/ ٣٥٧).

دونیادا دەرچوون.

**فەرموودەی سێیەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَّ اطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَهِدَ بَدْرًا فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ»(١)، وفي رواية: «... فَقَدْ أَوْجَبْتُ لَكُمُ الجَنَّةَ»(٢).

واتە: تۆ نازانیت، خوای پەروەردگار سەیری هاوەڵانی بەشداربووی شەڕی بەدری کردووە و فەرموویەتی: چ کارێك ویستتان لێیە بیکەن، ئەوە لێتان خۆش بووم.

وە هەرچی ناوداران هەیە لە هاوەڵاندا کە دیارن ئەم موژدەیە دەیانگرێتەوە، لەبەر بەشداربوونیان لە شەڕی بەدر، وە ژمارەیان وەکوو (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وكانوا ثلاث مئة وثلاثة عشر»(٣).

واتە: سێ سەد و سیانزە کەس بوون.

(ابن القيم) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَكَذَلِكَ اخْتَارَ أَصْحَابَهُ مِنْ جُمْلَةِ الْعَالَمِينَ، وَاخْتَارَ مِنْهُمُ السَّابِقِينَ الْأَوَّلِينَ، وَاخْتَارَ مِنْهُمْ أَهْلَ بَدْرٍ، وَأَهْلَ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ، وَاخْتَارَ لَهُمْ مِنَ الدِّينِ أَكْمَلَهُ، وَمِنَ الشَّرَائِعِ أَفْضَلَهَا، وَمِنَ الْأَخْلَاقِ أَزْكَاهَا وَأَطْيَبَهَا وَأَطْهَرَهَا»(٤).

واتە: خوای پەروەردگار هاوەڵانی لەنێوان هەموو خەڵکدا هەڵبژاردووە، وە لەنێوان ئەوانیشدا پێشووە ساڵحەکانی هەڵبژاردووە، وە لەنێوان ئەوانیشدا ئەهلی بەدری هەڵبژاردووە، وە بەشداربووانی حودەیبییە، وە لە دینیدا کامڵترین دین و شەریعەتی هەڵبژاردووە، وە لە ڕەوشتەکاندا پاکترین و پڕخێرترینیانی هەڵبژاردووە، ئەم هەڵبژاردنانە ویست و مافی خۆیەتی،

---

(١) رواه البخاري (٣٠٠٧، ٤٢٧٤)، ومسلم (٢٤٩٤)، وأبو داود (٢٦٥٠)، والترمذي (٣٣٠٥)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٩٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٧٢٧)، والبزار في "المسند" (١٩٧)، والطبراني في "الكبير" (١٢٥٩٣)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٤٤٣٦)، والبيهقي في "الشعب" (٨٩٢٦)، والبغوي في "شرح السنة" (١١٧٣).

(٢) رواه البخاري (٦٩٣٩).

(٣) "المسائل والأجوبة" لابن تيمية ص٧٥.

(٤) "زاد المعاد في هدي خير العباد" لابن القيم (١/ ٤٦).

وەکوو دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ [القصص: ٦٨].

**فەرموودەی چوارەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ»(١).

واتە: نیشانەی ئیمان؛ خۆشەویستی ئەنسارییەکانە (مەدینەییەکان)، وە نیشانەی دووڕوویی؛ ڕقلێبوونی ئەنسارییەکانە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: «الْأَنْصَارُ لَا يُحِبُّهُمْ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يُبْغِضُهُمْ إِلَّا مُنَافِقٌ، وَمَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللهُ»(٢).

واتە: ئەوەی ئیماندار نەبێت ئەنسارییەکانی خۆش ناوێت، وە ئەوەی ڕقی لێیانە دووڕووە، خوایە ئەو کەسەت خۆش بووێت کە ئەوانی خۆش دەوێت، وە ڕقت لەو کەسە بێت کە ڕقی لێیانە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا بە (ئەنسارییەکان) دەفەرموێت: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّكُمْ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ» مَرَّتَيْنِ(٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دوو جار پێیانی فەرموو: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئێوە لە هەموو کەس خۆشەویستترن لای من.

---

(١) رواه البخاري (١٧، ٣٧٨٤)، وأحمد في "المسند" (١٢٣١٦)، والبيهقي في "الشعب" (١٤٢٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦٤٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٩٦٦).

(٢) رواه البخاري (٣٧٨٣)، ومسلم (٧٥)، والترمذي (٣٩٠٠)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٧٦)، وأحمد في "المسند" (١٨٥٧٦)، وفي "فضائل الصحابة" (١٤٥٥)، والطبراني في "الأوسط" (٦٩٤٦)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٣٥٣)، والبيهقي في "الشعب" (١٤٢٢)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١٧٧٨).

(٣) رواه البخاري (٣٧٨٦، ٦٦٤٥)، ومسلم (٢٥٠٩)، والنسائي في "الكبرى" (٨٢٧١)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (١٤٥٧)، وفي "المسند" (١٢٣٠٥)، والطيالسي في "المسند" (٢١٨٠)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (١٧٣٧).

**فەرموودەی پێنجەم:** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ، قَالَ: فَجَلَسْنَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: «**مَا زِلْتُمْ هَاهُنَا؟**» قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ قُلْنَا: نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ، قَالَ: «**أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ**»، قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، وَكَانَ كَثِيرًا مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «**النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ، وَأَنَا أَمَنَةٌ لِأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ، وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ**»(١).

واتە: (ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: نوێژی مەغریبمان کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، پاشان وتمان: ئەگەر دابنیشتینایە تاوەکوو نوێژی عیشاشمان دەکرد، دانیشتین، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لامان، فەرمووی: لەو کاتەوە لێرەن؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبمان کرد و وتمان دانیشین تا عیشاش دەکەین، فەرمووی: چاکتان کرد، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، زۆر جاران سەری بەرزدەکردەوە بۆ ئاسمان، فەرمووی: ئەستێرەکان نیشانەی مانەوەی ئاسمانن، گەر ئەستێرەکان ڕۆیشتن، بەسەر ئاسماندا دێت ئەو وادەیەی بەسەریدا دراوە.

وەکوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ٩﴾ [المرسلات: ٩]، ﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ١١﴾ [التكوير: ١١]، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ١ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ٢﴾ [الانفطار: ١، ٢]، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ [الانشقاق: ١].

---

(١) رواه مسلم (٢٥٣١)، وأحمد في "المسند" (١٩٥٦٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٤٩)، وأبوبكر بن الخلال في "السنة" (٧٧٢)، والبزار في "المسند" (٣١٠٢)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣١٨، والآجري في "الشريعة" (١١٥٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٦١).

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وە منیش نیشانەی سەلامەتی و مانەوەی هاوەڵانم، گەر ڕۆیشتم، ئەو هەڕەشانە دێت بەسەر هاوەڵاندا کە وادەیان پێدراوە، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا»[(١)].

پاشان فەرمووی: وە هاوەڵانم نیشانەی سەلامەتی و مانەوەی ئومەتەکەمن (موسوڵمانان)، گەر هاوەڵان ڕۆیشتن، بەسەر ئومەتەکەمدا دێت ئەو وادە و هەڕەشانەی بەسەریاندا دراوە، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «وَإِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً»[(٢)].

هاوەڵان لە پلەبەرزییان هۆکاری سەلامەتی و داخستنی دەرگای فیتنە و دووبەرەکایەتی بوون، بۆیە پاش ئەوان دەرگای فیرەق و تاقمە گومڕاکان کرایەوە و هەمووشیان کۆدەنگ بوون لە لێدانی هاوەڵاندا، هەر بە خەوارج و ڕافیزە و موعتەزیلە و ... هتد.

**فەرموودەی شەشەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «أَلَا إِنَّ مَنْ قَبْلَكُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَإِنَّ هَذِهِ الْمِلَّةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ: ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَهِيَ الْجَمَاعَةُ»[(٣)].

---

(١) رواه أبو داود (٤٦٠٧)، وابن ماجه (٤٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٥)، وأحمد في "المسند" (١٧١٤٥)، والدارمي في "السنن" (٩٦)، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٩)، والطبراني في "الكبير" (٦١٧)، والمروزي في "السنة" (٦٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٣٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٥٤)، وابن بطة في "الإبانة" (١٤٢)، والآجري في "الشريعة" (٨٨)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٧٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٢٢٠)، وابن عبدالبر في "الجامع" (٢٣٠٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٣٧)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٥٤٩).

(٢) رواه أبو داود (٤٥٩٦)، والترمذي (٢٦٤٠)، وابن ماجه (٣٩٩١)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٢٤٧)، وأحمد في "المسند" (٨٣٩٦)، والحاكم في "المستدرك" (١٠)، وأبو يعلى في "المسند" (٥٩١٠)، والطبراني في "الأوسط" (٤٨٨٦)، والمروزي في "السنة" (٦١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٩٠١)، وابن وضاح في "البدع" (٢٥٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٧٣)، والآجري في "الشريعة" (٢١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٠٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٠٨٣).

(٣) رواه أبو داود (٤٥٩٧)، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٣)، والطبراني في "الكبير" (٨٨٤)، والمروزي في "السنة" (٥٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٦٨)، والآجري في "الشريعة" (٢٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٥٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٠٤)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٦٤١).

وفي رواية: «إِلَّا السَّوَادَ الْأَعْظَمَ»[١].

وفي رواية: «مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي»[٢].

**واتە: گەلانی پێش ئێوە لە جوولەکە و گاوور جیاوازی کەوتە نێوانیان، بوون بە حەفتا و دوو بەشەوە، بەڵام موسوڵمانانی ئەم گەلە دەبن بە حەفتا و سێ بەشەوە، حەفتا و دوویان لە ئاگردایە، یەك بەشیان لە بەهەشتدایە، ئەوانیش (الجماعة)ن، کە هاوەڵانن و ئەوانەش کە لەسەر ڕێڕەوی ئەوانن.**

**لە ڕیوایەتەکەی تردا واتە: زۆرینەی خەڵکی ئەمڕۆ.**

**وە لە ڕیوایەتەکەی تردا واتە: ئەوەی کە من و هاوەڵانم لەسەرین.**

**هەرسێ ڕیوایەتەکە ئاماژەیە بۆ هاوەڵان و بەرنامە و ڕێڕەوی دینییان کە لەسەر حەقن، وە متمانەی ڕزگاربوون لە گومڕایی و لادان پەیوەستبوونە بەوانەوە، نیشانە و کێشانەن بۆ هەموو تێڕوانینێکی دینی.**

**ئەمە پلەی هاوەڵانە لە بەرنامەی ئەهلی سوننەتدا، لەسەر زاری پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەفەرموێت:**

**١. (الجماعة): واتە: ئەم کۆمەڵە دیارەی ئەمڕۆ، ئەلف و لامی دیاریکراو (معرفة)ی لەسەرە، وە هیچ کۆمەڵێك بوونی نەبووە لەو سەردەمەدا کە لەسەر دین بن بەو شێوازە بێجگە لە هاوەڵان (الصحابة) ﷺ نەبێت.**

**٢. وە وشەی ڕەشایی گەورە (السَّوَادَ الأَعْظَمَ): واتە: زۆرینەی خەڵك، وە زۆرینەش کۆمەڵگای هاوەڵان بووە.**

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٨٩٢)، والطبراني في "الكبير" (٨٠٥٤)، والمروزي في "السنة" (٥٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٦٧٨٣)، وابن بطة في "الإبانة" (٥٣٢)، والآجري في "الشريعة" (٢٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٦٩)، وقال شعيب الأرنؤوط في تحقيق سنن أبي داود: إسناده حسن، وكذلك في المسند (١٩/ ٢٤٢).

(٢) رواه الترمذي (٢٦٤١)، والطبراني في "الكبير" (٦٢)، وابن وضاح في "البدع" (٢٥٠)، والآجري في "الشريعة" (١١١)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٤٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٣٤٨)، وفي "المشكاة" التحقيق الثاني (٢٦٤١).

**٣.** وە وشەی (مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي): زۆر بە ڕوونی دەفەرموێت ئەوەی من و هاوەڵانم لەسەرین لە بەرنامە و ڕێڕەوی دینی.

وە لە هەندێك ڕیوایەتدا وشەی (اليوم) ی پێوە لکاوە: «مَا أَنَا عَلَيْهِ الْيَوْمَ وَأَصْحَابِي»[(١)].

واتە: ئەوەی من و هاوەڵانم لەسەرین ئەمڕۆ.

بۆیە لای زانایان بەناوی بەرنامەی پێشووە ساڵحەکان (منهج السلف الصالح)ەوە ناودارە، کەواتە پێکهاتووە لە بەرنامە دینییەکە و خاوەنەکانیان، خۆ ئەگەر خاوەنەکانیان کە هاوەڵانن نەماون؛ ئەوا بەرنامەکانیان تیادا مەبەستە لەو سێ وشەیەدا، هەروەك (عبد الله ی کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێت: «إِنَّمَا الْجَمَاعَةُ مَا وَافَقَ طَاعَةَ اللهِ وَإِنْ كُنْتَ وَحْدَكَ»[(٢)].

واتە: ئەو کۆمەڵە ڕزگاربووە ئەوانەن کە گونجاو بن لەگەڵ گوێڕایەڵی خوادا، ئەگەر بە تەنهاش بیت.

الشَّيْخ (الألباني) ﷺ دەڵێت: «لا يكفي إذا دعونا الناس إلى العمل بالكتاب والسنة أن نقتصر على هذا فقط في الدعوة؛ بل لا بد من أن نضم إلى ذلك جملة: (على منهج السلف الصالح) »[(٣)].

واتە: بەوە بەس نابێت خەڵك بانگەواز بکەین بۆ کارکردن بە قورئان و فەرموودە، وە بەوە کۆتایی پێ بێنین، بەڵکوو دەبێت وشەی (بەرنامەی پێشینە ساڵحەکان) بخەینە پاڵیان، واتە (الكتاب والسنة على منهج السلف الصالح)، بەرنامەمان قورئان و فەرموودەیە لەسەر ڕێڕەوی پێشینە ساڵحەکان، وە بە بەستنەوەیەکی زانستی بزانیێت، کە هۆکاری جیاکاری بێت لە بەرنامەکانی تر.

مەبەست لێرەدا پلەی هاوەڵانە بە بەستنەوەیان بە ئیسلامەوە، کە لێجیاکەرەوە نین و مۆرکی ڕاست و دروستی و بەرنامە پاکین، پەیوەستبوون پێیانەوە هۆکاری ڕزگاربوونە، ئەمە پلەوپایە بەرزی هاوەڵانە ﷺ.

---

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (٤٤٤)، والطبراني في "الأوسط" (٤٨٨٦)، وفي "الصغير" (٧٢٤)، والمروزي في "السنة" (٥٩)، وابن بطة في "الإبانة" (٢٦٥)، والآجري في "الشريعة" (٢٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٢٣٨)، وضياء الدين في "المختارة" (٧/ ٢٧٨)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٥٣٤٣)، وفي "المشكاة" (١٧١).

(٢) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٦٠).

(٣) "أصل صفة صلاة النبي ﷺ" للألباني (٣/ ٨٩١).

**فەرموودەی حەوتەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيَقُولُونَ: فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، فَيَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: هَلْ فِيكُمْ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ»[1].

واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵكیدا، كۆمەڵێك دەچن بۆ جیهاد لەپێناوی خوادا ﷻ، دەڵێن: لەناوتاندا هەیە هاوەڵی پێغەمبەر بێت ﷺ؟ دەڵێن: بەڵێ، دەبێتە هۆكاری سەركەوتنیان، پاش ئەوان سەردەمێك دێت بەسەر خەڵكیدا، كۆمەڵێك دەچن بۆ جیهاد لەپێناوی خوادا ﷻ، دەڵێن: لەناوتاندا هەیە گەیشتبێت بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ؟ دەڵێن: بەڵێ، دەبێتە هۆكاری سەركەوتنیان، پاشان سەردەمێك دێت پێیان دەڵێن: لەناوتاندا هەیە گەیشتبێت بەوانەی كە گەیشتوون بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ؟ دەڵێن: بەڵێ، دەبێتە هۆكاری سەركەوتنیان.

هۆكاری خێر و پلەبەرزی دوو چینی دوای خۆیانن، بەڵكوو نیشانەی پڕخێر و بەرەكەتن بۆ ئەو دوو چینەی دوای خۆیان.

وەكوو لە ڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَنِي، وَاللَّهِ لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَ مَنْ صَاحَبَنِي، وَاللَّهِ لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَأَى مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَ مَنْ صَاحَبَ مَنْ صَاحَبَنِي»[2].

---

(١) رواه البخاري (٣٦٤٩)، ومسلم (٢٥٣٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٤٧٦٨)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٦٤٤)، وفي "المسند" (١١٠٤١)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٦٤).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (٢٠٧)، وفي "مسند الشاميين" (٧٩٩)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٤١٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٢٨٣).

واتە: بەردەوام لـەسەر خێرن تا ئەو کەسانەتان تیادا مابێت کە منی بینیوە و هاوەڵێیەتی کردووم، سوێند بە خوا بەردەوام لـەسەر خێرن بە مەرجێك ئەو کەسانەتان تیادا مابێت کە گەیشتوون بەوانەی منیان بینیوە و هاوەڵێیەتییان کردووم، وە سوێند بە خوا بەردەوام لـەسەر خێرن بە مەرجێك ئەو کەسانەتان تیادا مابێت کە گەیشتوون بەوانەی گەیشتوون بە هاوەڵانی من (واتە تابعین).

  

# وتەی هاوەڵان ﷺ لەسەر دادوەری خۆیان

## (أقوال الصحابة ﷺ على عدالتهم)

١. (عبد الله ی کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێت: «إِنَّ اللهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَاصْطَفَاهُ لِنَفْسِهِ، فَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ، فَوَجَدَ قُلُوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَجَعَلَهُمْ وُزَرَاءَ نَبِيِّهِ، يُقَاتِلُونَ عَلَى دِينِهِ، فَمَا رَأَى الْمُسْلِمُونَ حَسَنًا، فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَأَوْا سَيِّئًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ سَيِّئٌ»[(١)].

واتە: خوای پەروەردگار سەیری دڵی بەندەکانی کرد، بینی دڵی (ﷺ) باشترین دڵی بەندەکانی بوو، بۆ خۆی هەڵبژارد و بەرنامەکەی خۆی پیادا نارد، پاشان سەیری دڵی بەندەکانی کرد پاش دڵی (ﷺ)، بینی دڵی هاوەڵانی باشترین دڵە، کردنی بە پشتیوانی پێغەمبەرەکەی و لە پێناوی دینەکەیدا بجەنگێن، ئەوەی موسوڵمانان بە چاکی بزانن لای خوا چاکە، وە ئەوەی بە خراپی بزانن لای خوا خراپە (واتە هاوەڵان).

پێدەچێ (ابن مسعود) ﷺ لە ڕوانگەی ئایەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾﴾ [آل عمران: ١١٠] وتبێتی، کە هاوەڵان باشترین کەسانن لەو کاتەدا خوای گەورە هێنابێتنییە دونیاوە بۆ خەڵکی.

---

(١) رواه مالك في "الموطأ" (٣٧٨)، وأحمد موقوفا على ابن مسعود (١/ ٣٧٩)، والحاكم في "المستدرك" (٤٤٦٥)، والبزار في "المسند" (١٨١٦)، والطبراني في "الكبير" (٨٥٨٢)، وفي "الأوسط" (٣٦٠٢)، والطيالسي في "المسند" (٢٣)، والبيهقي في "السنن الصغرى" (٨١٧)، وفي "المدخل" (٤٩)، والخطيب في "الفقيه والمتفقه" (١/ ١٤٦)، وفي "التأريخ" (٤/ ١٦٥)، وابن الأعرابي في "المعجم" (٨٩١)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٧٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠٥)، والسخاوي في "المقاصد" (٩٥٩)، والهيثمي في "المجمع" (١/ ١٧٧)، وابن حجر في "الدراية" (٢/ ١٨٧)، وابن الجوزي في "الواهيات" (٤٥٢).

**٢.** (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ، فَلَمَقَامُ أَحَدِهِمْ سَاعَةً خَيْرٌ مِنْ عِبَادَةِ أَحَدِكُمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً»(١)، وفي رواية: «خَيْرٌ مِنْ عَمَلِ أَحَدِكُمْ عُمْرَهُ»(٢).

**واتە:** قسە مەڵێن بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، شوێنکاری یەك کاتی یەکێکیان خێری زیاترە لە عیبادەتی چل ساڵی یەکێك لە ئێوە، بەڵکوو هەموو تەمەنی.

**٣.** (سەعیدی کوڕی زەید) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: «لَمَشْهَدُ رَجُلٍ مِنْهُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْبَرُّ فِيهِ وَجْهُهُ، خَيْرٌ مِنْ عَمَلِ أَحَدِكُمْ عُمُرَهُ، وَلَوْ عُمِّرَ عُمُرَ نُوحٍ»(٣).

**واتە:** کارێك لە کارەکانی هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کە ڕووی تۆزاوی بووبێت، خێری زیاترە لە کردەوەی هەموو تەمەنی یەکێکتان،گەر هەموو تەمەنی (نووح)یشی عَلَيْهِ السَّلَامُ هەبێت.

**٤.** (عبدالله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «مَنْ كَانَ مُسْتَنًّا فَلْيَسْتَنَّ بِمَنْ قَدْ مَاتَ، أُولَئِكَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانُوا خَيْرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ، أَبَرَّهَا قُلُوبًا، وَأَعْمَقَهَا عِلْمًا، وَأَقَلَّهَا تَكَلُّفًا، قَوْمٌ اخْتَارَهُمُ اللهُ لِصُحْبَةِ نَبِيِّهِ صلّى الله عليه وسلم وَنَقْلِ دِينِهِ، فَتَشَبَّهُوا بِأَخْلَاقِهِمْ وَطَرَائِقِهِمْ فَهُمْ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانُوا عَلَى الْهُدَى الْمُسْتَقِيمِ»(٤).

**واتە:** ئەوەی دەیەوێت شوێنکەوتە بێت با شوێنکەوتەی ئەوانە بێت کە مردوون، ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ، کە چاکترین کەسانی ئەم ئوممەتەن، خاوەنی خێرترین دڵن، وە

---

(١) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٢٠، ١٧٢٩).

(٢) رواه ابن ماجه (١٦٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، ورواه أحمد في "فضائل الصحابة" (١٥)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٢٤١٥)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٢٣، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٠٠٦)، والآجري في "الشريعة" (٢٠٠٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٥٠)، وحسنه الألباني في "صحيح وضعيف سنن ابن ماجة" (١٦٢).

(٣) رواه أبو داود (٤٦٥٠)، وأحمد في "المسند" (١٦٢٩)، وفي "فضائل الصحابة" (٩٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٩٥١٣)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٣١، وفي "المدخل" (٩٠)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٣٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٧١٨)، وأبو نعيم في "معرفة الصحابة" (٥٣)، وفي "الحلية" (١/ ٩٥)، وضياء الدين في "المختارة" (١٠٨٣)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (١٨/ ٣٨٩)، وصححه الألباني في "صحيح وضعيف سنن أبي داود" (٤٦٥٠).

(٤) رواه أحمد في "المسند" (١/ ٣٧٩)، وابن بطة في "منهاج السنة" (١/ ١٦٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٠٥)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢١٤) برقم (١٠٥).

خاوەنی قووڵترین زانستن و کەمترین قورساییان تێدا بەدی دەکرێت لە گەیاندنی دیندا، کەسانێکن خوای گەورە هەڵیبژاردوون بۆ هاوەڵایەتی پێغەمبەرەکەی، وە گەیاندنی دینەکەی، هاوشێوەی ڕەوشت و ڕێگایان بن، ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەری خوان ﷺ و لەسەر ڕێگەی ڕاست و هیدایەتن.

٥. قِيلَ لِعَائِشَةَ: «إِنَّ نَاسًا يَتَنَاوَلُونَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِنَّهُمْ لَيَتَنَاوَلُونَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ؟! قَالَتْ: مَا تَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ انْقَطَعَ عَنْهُمُ الْعَمَلُ، فَلَمْ يُحِبَّ اللهُ أَنْ يَقْطَعَ عَنْهُمُ الأَجْرَ»[١].

واتە: بە (عائیشە)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دایکی ئیماندارانیان وت: خەڵکانێك قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن، تەنانەت (ئەبو بەکر و عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وتی: بە چی لەمەدا سەرسامن؟! ئەمان کردەوەیان نەماوە، خوای گەورە پێی خۆشە پاداشتیان لێ نەبڕێت.

٦. (عبدالله ی کوڕی مەسعود) رضي الله عنه دەڵێت: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا أَتَاهُمُ الْعِلْمُ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَمِنْ أَكَابِرِهِمْ، فَإِذَا جَاءَ الْعِلْمُ مِنْ قِبَلِ أَصَاغِرِهِمْ فَذَاكَ حِينَ هَلَكُوا»[٢].

واتە: بەردەوام خەڵکان لەسەر خێرن، تاوەکوو زانست لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ و گەورەکانتانەوە بێت بۆتان، گەر زانست لە بچووکەکانتانەوە بێت بۆتان، ئەوا تیا چوون.

وَقَالَ مُجَاهِدٍ وَقَتَادَةَ فِي قَوْله تَعَالَى: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ ﴾ [سَبَإ: ٦]، قَالَ: أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ[٣].

---

(١) "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (١٣/ ١٥١) برقم (٦٠٠٢)، "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٤/ ٣٨٧)، "جامع الأصول" (٩/ ٤٠٨)، "مسند عائشة" للسيوطي ص١٦٤، "المشيخة البغدادية" للأصبهاني (٥٢).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (٨٥٨٩)، وفي "الأوسط" (٧٥٩٠)، ومعمر بن راشد في "الجامع" (٢٠٤٤٦)، وابن مبارك في "الزهد" (٨١٥)، وابن الأعرابي في "المعجم" (٩٢٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٨/ ٤٩)، وابن عبدالبر في "الجامع" (١٠٥٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٣١٧)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٥١/ ١٥٧) برقم (٥٩٩٩)، وفي "سلسلة الآثار الصحيحة" لأبو عبدالله الداني (١/ ٢٧).

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ١٢).

واته: (موجاهید و قەتادە) لـە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ﴾ [سَبَإ: ٦] واته: خاوەن زانستەکان دەڵێن ئەوەی هاتووەتە خوارەوە بۆت حەقە، دەڵێن: ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەرن ﷺ.

٧. (عبد الله ی کوڕی عەبباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «لَا تَسُبَّ السَّلَفَ، وَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ»[(١)]، وفي رواية: قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَإِيَّاكَ وَشَتْمَ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؛ فَيَكُبَّكَ اللهُ عَلَى وَجْهِكَ فِي النَّارِ»[(٢)].

واته: قسە مەڵێ بە هاوەڵان و پێشووان، بە سەلامەتی بڕۆرە بەهەشتەوە.

لە ڕیوایەتەکەی تردا: تا خوای گەورە لەسەر ڕوو نەتخاتە دۆزەخەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَنَا بِالِاسْتِغْفَارِ لَهُمْ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُمْ سَيَقْتَتِلُونَ»[(٣)].

واته: قسە مەڵێن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوای گەورە فەرمانی داوە کە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا زانا بووە بەسەر ئەوەدا کە شەڕ لە نێوانیاندا دروست دەبێت.

٨. «فَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ضَرْبَ بِالدِّرَّةِ مَنْ فَضَّلَهُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: مَنْ قَالَ غَيْرَ هَذَا أَقَمْنَا عَلَيْهِ مَا نُقِيمُ عَلَى الْمُفْتَرِي»[(٤)].

---

(١) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٥٥)، ابن الأعرابي في "المعجم" (٢١٠١).

(٢) "معجم ابن المقرئ" (٨١٧)، و "السابع من فوائد أبو عثمان البحيري" للنيسابوري (٣٤)، و "الإيماء إلى زوائد الأمالي والأجزاء" لسليم جرار (٢٥٥٣)، و "طبقات المحدثين" لأبي الشيخ الأصبهاني (١/ ٣١٦)، و "أخبار أصبهان" لأبو نعيم الأصبهاني (١/ ٣٥١).

(٣) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (١٧٤١)، والآجري في "الشريعة" (١٩٧٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٣٩)، والأصبهاني في "الحجة في بيان المحجة" (٣٦٤)، والبوصيري في "الإتحاف" (٧٠٠١)، وابن حجر في "المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية" (٤١٦٣).

(٤) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٣٩٦)، وابن تيمية في "الصارم المسلول على شاتم الرسول" ص٥٨٥.

وَكَذَلِكَ قَالَ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: «لَا يُفَضِّلُني أَحَدٌ عَلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ إِلَّا جَلَدْتُهُ حَدَّ الْمُفْتَرِي»[(١)].

واتە: خەلیفەی (عومەری كوڕی خەتتاب) ﷺ بە دوورڕەكەی لەو كەسەی داوە كە پلەی ئەمی بەرزكردووەتەوە بەسەر (ئەبو بەكر)دا ﷺ، وتوویەتی: ئەوەی بێجگە لەمە (واتە بەرزكردنەوەی پلەی ئەبو بەكر بەسەر عومەر)دا بلێت، ئەوا ئێمە سزای درۆهەڵبەستنی بەسەردا دەدەین، كە هەشتا دارە، وەكوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً﴾ [النور: ٤].

هەروەها خەلیفە (عەلی كوڕی ئەبی تالیب) ﷺ وتوویەتی: ئەوەی پایەبەرزم بكات بەسەر (ئەبو بەكر و عومەر)دا، سزای درۆهەڵبەستنی بەسەردا دەدەم.

وە سزای درۆهەڵبەستنیش تۆمەتباركردنی كەسێكە بە تاوانی (زینا) كە هەشتا جەڵدە، وەكوو خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدًاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤﴾ [النور: ٤].

  

(١) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٤٩)، والدارقطني في "المؤتلف والمختلف" (٢/٨٠٧)، والقرطبي في "الاستيعاب" (٣/٩٧٣)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٢٦/٣٤٣)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٥٨، والآجري في "الشريعة" (١٨١٣)، وابن زكريا البغدادي في "المخلصيات" (٢٧٢٩)، والشاذلي في "كنز العمال" (٣٦١٠٣)، وابن تيمية في "الصارم المسلول على شاتم الرسول" ص٥٨٥.

# وتەی شوێنکەوتووان و زانایان لەسەر دادوەری هاوەڵان

## ( أقوال التابعين والعلماء في تعديل الصحابة )

١. قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مُصْعَب بنُ ثَابِت ابنُ الْزُّبَيْر ﭬ: قَالَ الْمَهْدِي: «مَا تَقولُ فِيمَنْ يَنْتَقِصُ الصَّحَابَة؟ قُلْتُ: زَنَادِقَة، لأَنَّهُمْ مَا اسْتَطَاعُوا أَنْ يُصَرِّحُوا بِنَقص رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، فتنقصوا أَصْحَابه فَكَأَنَّهُمْ قَالُوا: كَانَ يُصْحَبُ صَحَابَةَ الْسُّوء»[1].

واتە: ئەم کوڕەزایەی (عبد الله ی کوڕی زوبێر) ﭬ، خەلیفە (مەهدی) لێی دەپرسێت: چی دەڵێیت بە کەسێك کە قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت؟ وتی: دەرچوو لە دینن، لەبەرئەوەی نەیانتوانی بە ئاشکرا قسە بە پێغەمبەر ﷺ بڵێن، قسەیان بە هاوەڵان وت، وەکوو ئەوە وایە بڵێن: پێغەمبەر ﷺ هاوەڵێیەتی کەسانی خراپی کردووە.

٢. عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﬞ: «فَارْضَ لِنَفْسِكَ مَا رَضِيَ بِهِ الْقَوْمُ لِأَنْفُسِهِمْ، فَإِنَّهُمْ عَلَى عِلْمٍ وَقَفُوا، وَبِبَصَرٍ نَافِذٍ كَفُّوا، وَهُمْ عَلَى كَشْفِ الْأُمُورِ كَانُوا أَقْوَى، وَبِفَضْلِ مَا كَانُوا فِيهِ أَوْلَى، فَإِنْ كَانَ الْهُدَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ لَقَدْ سَبَقْتُمُوهُمْ إِلَيْهِ وَلَئِنْ قُلْتُمْ إِنَّمَا حَدَثَ بَعْدَهُمْ مَا أَحْدَثَهُ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِهِمْ وَرَغِبَ بِنَفْسِهِ عَنْهُمْ، فَإِنَّهُمْ هُمُ السَّابِقُونَ، فَقَدْ تَكَلَّمُوا فِيهِ بِمَا يَكْفِي، وَوَصَفُوا مِنْهُ مَا يَشْفِي، فَمَا دُونَهُمْ مِنْ مَقْصَرٍ، وَمَا فَوْقَهُمْ مِنْ مَحْسَرٍ، وَقَدْ قَصَّرَ قَوْمٌ دُونَهُمْ فَجَفَوْا، وَطَمَحَ عَنْهُمْ أَقْوَامٌ فَغَلَوْا، وَإِنَّهُمْ بَيْنَ ذَلِكَ لَعَلَى هُدًى مُسْتَقِيمٍ»[2].

واتە: یەکێك لە ئامۆژگارییەکانی (عومەری کوڕی عبد العزیز) ﬞ فەرمووی: ڕازی بە

---

(١) "الإكمال في ذكر من له رواية في مسند الإمام أحمد" لشمس الدين الدمشقي ص٦٥٠، و "التحفة اللطيفة في تأريخ المدينة الشريفة" للسخاوي (٢/ ٩٤)، و "النهي عن سب الأصحاب" لضياء الدين المقدسي (٣٠)، و "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (١١/ ٤١٥)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٤/ ٣٨٣)، و "تعجيل المنفعة" لابن حجر العسقلاني (٥٨٥)، و "لسان الميزان" لابن حجر العسقلاني (٣/ ٣٦٢).

(٢) رواه أبو داود (٤٦١٢) وصححه الألباني، وابن بطة في "الإبانة" (١٨٣٣)، والآجري في "الشريعة" (٥٢٩).

بەوەی کە هاوەڵان بۆ خۆیان پێی ڕازی بوون، بووەستە لە ئاستی وەستانیاندا، ئەوانە بە زانستەوە وەستاون، وە بە چاوێکی کراوەوە کاریان کردووە، ئەوان لەسەر دەرککردنی بابەتەکان بەتوانا بوون، وە گەر چاك بووایە ئەوان لەپێشتر بوون، ئەوان پێشینەی ئەم دینەن، گەر هیدایەت لای ئێوەوە بێت ئەوا پێشیان کەوتوون، گەر بڵێیت چەند ڕووداوێك لەدوای ئەوان ڕوویانداوە، ئەوەی ئەو ڕووداوانەی داهێناوە کەسانێکن کە ڕێڕەوی ئەوانیان نەگرتووە، خۆیان بە کامڵتر زانیوە، ئەوانەی قسە لە دیندا دەکەن، بەبێ ئەوان کورتهێنەر و زیادەڕەون، ئەوان لەسەر ڕێگەی ڕاستن.

**٣. قَالَ أَبُو زُرْعَةَ الرَّازِيّ رَحِمَهُ اللهُ: «إِذَا رَأَيْتَ الرَّجُلَ يَنْتَقِصُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاعْلَمْ أَنَّهُ زِنْدِيقٌ، وَذَلِكَ أَنَّ الرَّسُولَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَنَا حَقٌّ، وَالْقُرْآنَ حَقٌّ، وَإِنَّمَا أَدَّى إِلَيْنَا هَذَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَنَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِنَّمَا يُرِيدُونَ أَنْ يُجَرِّحُوا شُهُودَنَا لِيُبْطِلُوا الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ، وَالْجَرْحُ بِهِمْ أَوْلَى وَهُمْ زَنَادِقَةٌ»[(١)].**

واتە: (ئەبو زورعە) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: گەر بینیت کەسێك توانج لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەدات، بزانە ئەوە دەرچوو لە دینە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ لای ئێمە حەقە، وە قورئان حەقە، وە ئەوانەی پێیان گەیاندووین ئەو قورئان و سوننەتانە هاوەڵانی پێغەمبەرن ﷺ، دەیانەوێت شایەتەکانمان بۆ گەیاندنی دین تۆمەتبار بکەن، تاوەکوو قورئان و فەرموودەکان لە کار خەن، ئەوان لەپێشترن کە تۆمەتبار بن، ئەوان بێبڕوان.

**٤. قَالَ مَالك بن أَنَس رَحِمَهُ اللهُ: «إِنَّمَا طَعَنُوا فِي أَصْحَابِهِ لِيَقُولَ الْقَائِلُ رَجُلُ سُوءٍ كَانَ لَهُ أَصْحَابُ سُوءٍ، وَلَوْ كَانَ رَجُلًا صَالِحًا لَكَانَ أَصْحَابُهُ صَالِحِينَ»[(٢)].**

واتە: ئیمامی (مالیکی کوڕی ئەنەس) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: بۆیە تانە دەدەن لە هاوەڵان، بۆ ئەوەی

---

(١) "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص٤٩، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣٨/ ٣٢)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (١٩/ ٩٦)، و "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر العسقلاني (١/ ٢٢)، و "مشارق الأنوار الوهاجة ومطالع الأسرار البهاجة في شرح سنن الإمام ابن ماجه" لمحمد بن علي بن آدم بن موسى (٣/ ١٢).

(٢) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٨٠، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٤٢٩)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٧/ ٤٥٩)، و "الصواعق المرسلة في الرد على الجهمية والمعطلة" لابن القيم (٤/ ١٤٠٥).

بلێین کەسێکی خراپ بوو، بۆیە هاوەڵەکانی خراپ بوون، گەر پیاوێکی چاك بوایە ئەوا هاوەڵەکانی چاك دەبوون.

**٥. مِمَا رَوَاهُ الْخَطِيبُ رَحِمَهُ اللَّهُ: «لما جاء الرشيد بشاكر رأس الزنادقة ليضرب عنقه قَالَ: أَخْبَرَنِي، لم تعلمون المتعلم منكم أول ما تعلمونه الرفض والقدر؟ قَالَ: أما قولنا بالرفض فإنا نريد الطعن على الناقلة، فإذا بطلت الناقلة أو شك أن نبطل المنقول»[(١)].**

واتە: کاتێك یەکێك لە دوژمنان بەناوی (شاکر) کە سەر و ناودار بوو لە دژایەتیکردنی دیندا، هێنرا تا لە ملی بدرێت، پێش ئەوەی بکوژرێت پێی وترا: هەواڵم بدەرێ، بۆچی سەرەتای فێرکردنی هەموو کەس فێری قسە و تانەدانی دەکەن لە هاوەڵان؟! وتی: ئێمە دەمانەوێت کەسانی گەیەنەری دین تۆمەتبار بکەین، لەبەرئەوەی گەر ئەوان تۆمەتبار بوون، ئەوا دین بەرەو بەتاڵبوونەوە دەڕوات.

**٦. عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَبَا بَكْرٍ فَقَدْ أَقَامَ الدِّينَ وَمَنْ أَحَبَّ عُمَرَ فَقَدْ أَوْضَحَ السَّبِيلَ، وَمَنْ أَحَبَّ عُثْمَانَ فَقَدِ اسْتَنَارَ بِنُورِ اللَّهِ، وَمَنْ أَحَبَّ عَلِيًّا فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى، وَمَنْ قَالَ الْحُسْنَى فِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدْ بَرِئَ مِنَ النِّفَاقِ»[(٢)].**

واتە: (ئەیوبی سەختیانی) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ئەوەی (ئەبو بەکر)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ خۆشبوێت، ئەوە دینی پایەدار کردووە، وە ئەوەی (عومەر)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ خۆشبوێت، ئەوە ڕێگاکەی بۆ ڕۆشن بووەتەوە، وە ئەوەی (عوسمان)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ خۆشبوێت، ئەوە بە نووری خوا ڕووناك بووەتەوە، وە ئەوەی (عەلی) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ خۆشبوێت، ئەوە پەیوەستە بە ڕێگەی پتەوی خواییەوە، ئەوەی چاك بڵێت سەبارەت بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە پاك و بەرییە لە دووڕوویی.

**٧. قَالَ مَالك بْن أَنَس رَحِمَهُ اللَّهُ: «كَانَ السَّلَفُ يُعَلِّمُونَ أَوْلَادَهُمْ حُبَّ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ كَمَا يُعَلِّمُونَ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ»[(٣)].**

---

(١) "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (٥/ ٥٠٤) برقم (٢٣٦٦).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٢)، و "الثقات" لابن حبان (٩/ ٨٧)، و "منازل الأئمة الأربعة" لمحمد أبوبكر الأزدي ص١٣٩، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣٩/ ٥٠٢)، و "الرياض النضرة في مناقب العشرة" للطبري (١/ ٥٣).

(٣) رواه مالك في "الموطأ" (١/ ٢٥٥) برقم (١٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" (٢٣٢٥)، وابن =

واتە: ئیمامی (مالیکی کوڕی ئەنەس) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: پێشینە سالحەکان منداڵەکانیان فێری خۆشەویستی (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ دەکرد، وەکوو چۆن فێری سوورەتێکی قورئانیان دەکردن.

٨. قَالَ أَحْمَد بْن حَنْبَلْ رَحِمَهُ اللَّهُ: «إِذَا رَأَيْتَ أَحَدًا يَذْكُرُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسُوءٍ فاتَّهِمْهُ عَلَى الْإِسْلَامِ»(١).

واتە: ئیمام (أحمد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ئەگەر کەسێکت بینی هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ بە خراپ ناو برد، ئەوە تۆمەتباری کە بە موسوڵمان نەبوون.

٩. عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ رَحِمَهُ اللَّهُ: «ضَرَبَ مَنْ شَتَمَ عُثْمَانَ ثَلَاثِينَ سَوْطًا ... وَضَرَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ مَنْ سَبَّ مُعَاوِيَةَ أَسْوَاطًا»(٢).

واتە: خەلیفەی پێنجەم (عومەری کوڕی عبد العزيز) رَحِمَهُ اللَّهُ، ئەو کەسەی کە قسەی بە (عوسمانی کوڕی عەففان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بوتایە سی جەلدەی لێ دەدا، وە چەند جەلدێکی دەدا لەو کەسەی کە قسەی بە (مەعاویە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بوتایە.

١٠. وَقَالَ إِسْحَاق بْن رَاهَوَيْه رَحِمَهُ اللَّهُ: «مَنْ شَتَمَ أَصْحَابَ النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَاقِبَ وَيُحْبَس»(٣).

واتە: ئەوەی قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بڵێت، سزا دەدرێت و بەند دەکرێت.

١١. وَقَالَ يَحْيَى بْن مَعِينٍ رَحِمَهُ اللَّهُ فِي تَلِيدِ بْنِ سُلَيْمَانَ: «إِنَّهُ كَذَّابٌ كَانَ يَشْتُمُ عُثْمَانَ وَكُلُّ مَنْ شَتَمَ عُثْمَانَ أَوْ طَلْحَةَ أَوْ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَجَّالٌ لَا يُكْتَبُ عَنْهُ وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِيْن»(٤).

= عساكر في "تأريخ دمشق" (٤٤/ ٣٨٣).

(١) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٣٥٩)، و "الحجة في بيان المحجة" للأصبهاني (٣٦٨)، و "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٦٨.

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٧/ ١٣٣٧).

(٣) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٦٨، و "الرد القويم على المجرم الأثيم" للتويجري ص٣٢.

(٤) "تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي" للمباركفوري (١٠/ ١١٨)، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" =

واتە: (یەحیای کوڕی مەعین) ﷬ دەڵێت: هەرکەسێك قسە بە (عوسمان و تەڵحە) و یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بڵێت، ئەوە دەجالە، فەرموودەی لێ وەرناگیرێت، نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت.

**١٢.** قَالَ أَبُو حَنِيْفَةَ ﷬: «لَقِيتُ عَطَاءً بِمَكَّةَ فَسَأَلْتُهُ عَنْ شَيْءٍ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنْ أَهْلِ الْكُوفَةِ، قَالَ: أَنْتَ مِنْ أَهْلِ الْقَرْيَةِ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَمِنْ يَدْرِي أَيُّ الْأَصْنَافِ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِمَّنْ لَا يَسُبُّ السَّلَفَ، وَيُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ، وَلَا يُكَفِّرُ أَحَدًا بِذَنْبٍ، فَقَالَ لِي عَطَاءٌ: عَرَفْتَ فَالْزَمْ»[١].

واتە: (ئەبو حەنیفە) ﷬ دەڕوات بۆ حەج، بە (عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح) ﷬ قوتابی (عبداللە ی کوڕی عەبباس) ﵄ دەگات، دەڵێت: شتێکم لێ پرسی، ئەویش وتی: خەڵکی کوێیت؟ وتم: من خەڵکی کووفەم، وتی: تۆ لەو شوێنەی کە دینیان پارچەپارچە کردووە و هەریەکەی کۆمەڵێکن؟ وتم: بەڵێ، وتی: تۆ لە چ کۆمەڵێکی؟ وتم: من لەو کەسانەم کە قسە بە هاوەڵان ناڵێن و باوەڕم بە قەزاوقەدەر هەیە، وە کەسیش بێبڕوا ناکەم بە تاوانێك، پێی وتم: زانیوتە و پێی گەیشتوویت، پەیوەست بە پێوەی.

**١٣.** قَالَ الشَّافِعِيُّ ﷬: «وَقَدْ أَثْنَى اللهُ تَعَالَى عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَضِيَ عَنْهُمْ فِي الْقُرْآنِ، وَالتَّوْرَاةِ، وَالْإِنْجِيلِ»[٢].

واتە: ئیمامی (شافعی) ﷬ دەڵێت: (خوای پەروەردگار وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ

---

= لناصر بن علي عائض حسن الشيخ (٣/ ١١١٥)، و "مشارق الأنوار الوهاجة ومطالع الأسرار البهاجة في شرح سنن الإمام ابن ماجه" لمحمد بن علي بن آدم (٣/ ٣٤٥)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لأبو أحمد لجرجاني (٢/ ٢٨٤)، و "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (٨/ ٥)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (٤/ ٣٢٢)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر العسقلاني (١/ ٥٠٩).

(١) "حلية الأولياء وطبقات الأصفياء" لأبي نعيم (٣/ ٣١٤)، و "مسند أبي حنيفة" لأبي نعيم ص٢٣، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٩/ ٣٣٦)، و "تأريخ بغداد" لخطيب البغدادي (١٣/ ٣٣٢).

(٢) "المدخل إلى السنن الكبرى" للبيهقي ص١١١ برقم (٤٠)، و "إعلام الموقعين" لابن القيم (١/ ٦٣)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٥٨)، و "دولة السلاجقة وبروز مشروع إسلامي لمقاومة التغلغل الباطني والغزو الصليبي" لعلي الصلابي ص٣٠٥.

کردووە، لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا)، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسف کراون لەو پلەوپایەیەی کە بۆ پاش ئەوان نییە، ڕەحمەتی خوایان لێبێت و لێیان پیرۆز بێت، ئەوەی پێی بەخشیون لە پلەوپایەی شەهیدان و ڕاستگۆیان و ساڵحاندا، ئەوان فەرموودەکانیان بە ئێمە گەیاندووە، وە شاهیدحاڵی هاتنەخوارەوەی قورئان بوون، زانا بوون بەسەر مەبەستەکانی پێغەمبەردا ﷺ، بە گشتی و بە تایبەت ڕێنموونیکردنیان، ئاگاداری هەموو سوننەتەکانی بوون، ئەوان لە سەروو ئێمەوەن لە هەموو زانستێك و هەموو ئیجتیهادێکدا، وە لە بواری وەرع و عەقڵ و فەرمانەکانی خوا لە دەقەکانەوە شارەزاترن، ڕاکانیان بۆ ئێمە باشترە، وە لەپێشترە، تاوەکوو ڕاکانی خۆمان.

وە دەڵێت: «من عاند السّنة قصد الصَّحَابَة، وَمن قصد الصَّحَابَة أبْغض النبي، وَمن أبْغض النَّبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كفر بِاللهِ الْعَظِيم»[(١)].

واتە: ئەوەی دژایەتی سوننەت بکات، ئەوا مەبەستی پێی هاوەڵانە، وە ئەوەی مەبەستی پێی هاوەڵان بێت، ڕقی لە پێغەمبەرە ﷺ، وە بەوەش بێبڕوا دەبێت.

**١٤.** قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ رَحِمَهُ اللهُ: «أُصُولُ السُّنَّةِ عِنْدَنَا: التَّمَسُّكُ بِمَا كَانَ عَلَيْهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالِاقْتِدَاءُ بِهِمْ»[(٢)].

واتە: یەکێك لە بنەماکانی سوننەت لای ئێمە، پەیوەستبوونە بەو بەرنامە و ڕێڕەوە دینییەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوون، وە شوێنکەوتەییانە.

**١٥.** قَالَ الْإِمَامُ الْنَّسَائِيُّ رَحِمَهُ اللهُ: «إنما الإسلام كدار لها باب، فباب الإسلام الصحابة، فمن آذى الصحابة إنما أراد الإسلام، كمن نقر الباب إنما يريد دخول الدار»[(٣)].

واتە: ئیمامی (نەسائی) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئیسلام وەکووماڵێك وایە دەرگای هەبێت، دەرگای

(١) "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ١٣)، و "المقصد الأرشد في ذكر أصحاب الإمام أحمد" لابن مفلح (١/ ٦٩).

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٣١٧)، و "ذم التأويل" لابن قدامة المقدسي (٧١)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٢٤١)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٤/ ٨١)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٠٢)، "المقصد الأرشد في ذكر أصحاب الإمام أحمد" لابن مفلح (٧٨٧)، و "مناقب الإمام أحمد" لابن الجوزي ص٢٣٠.

(٣) "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (١/ ٣٣٩)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٧١/ ١٧٥).

ئیسلامیش هاوەڵانە، ئەوەی ئازاری هاوەڵان بدات، مەبەستی پێی ئیسلامە، هەروەك چۆن یەكێك لە دەرگا بدات مەبەستی پێی چوونەژوورەوەیە.

**١٦.** قَالَ الْإِمَامُ الطَّحَاوِيُّ رَحِمَهُ اللهُ: «وَلَا نُفَرِّطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَلَا نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ. وَنُبْغِضُ مَنْ يُبْغِضُهُمْ، وَبِغَيْرِ الْخَيْرِ يَذْكُرُهُمْ. وَلَا نَذْكُرُهُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ. وَحُبُّهُمْ دِينٌ وَإِيمَانٌ وَإِحْسَانٌ، وَبُغْضُهُمْ كُفْرٌ وَنِفَاقٌ وَطُغْيَانٌ»(١).

واتە: ئیمامی (تەحاوی) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: زیادەڕەوی ناكەین لە خۆشەویستی كەسێكیاندا، وە خۆمان بەری ناكەین لە هیچ كەسیان، ڕقمان لەوانەیە كە ڕقی لێیانە و باسیان دەكەن بەبێ حەق، وە بەجوانی نەبێت باسیان ناكەین، خۆشەویستییان دین و ئیمان و چاكەیە، وە ڕقلێبوونیان بێبڕوایی و دووڕوویی و یاخیبوونە.

وَقَالَ ابن أبي العز الحنفي الدمشقي رَحِمَهُ اللهُ: «فَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَكُونُ فِي قلبه غل على خيار الْمُؤْمِنِينَ، وَسَادَاتِ أَوْلِيَاءِ اللهِ تَعَالَى بَعْدَ النَّبِيِّينَ؟»(٢).

واتە: ئیمامی (ئەبی عزی حەنەفی) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: كێ لەوە گومڕاترە كە لە دڵیدا ڕق و كینەی هەبێت بەرامبەر چاكترینی ئیمانداران و گەورەی ئەولیاكانی خوا دوای پێغەمبەران عَلَيْهِمُ السَّلَامُ؟.

**١٧.** قَالَ الْقَاضِي عِيَاض رَحِمَهُ اللهُ: «ومن توقيره صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وبره توقير أصحابه وبرهم ومعرفة حقهم، والاقتداء بهم وحسن الثناء عليهم، والاستغفار لهم، والإمساك عما شجر بينهم، ومعاداة من عاداهم»(٣).

واتە: مایەی ڕێزگرتنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و چاكەكردن لەگەڵی ڕێزلێگرتنی هاوەڵانیەتی و چاكبوونە لەگەڵیان و زانینی مافیانە و شوێنكەوتەییانە و باسكردنیانە بە چاك و دوعای لێخۆشبوونە بۆیان و باسنەكردنی ڕووداوەكانی نێوانیانە و دژایەتیكردنی دوژمنانیانە.

---

(١) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٧٥.

(٢) "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٧٠.

(٣) "الشفاء" للقاضي عياض (٢/ ٥٢)، و "الأساليب البديعة في فضل الصحابة وإقناع الشيعة" للنبهاني ص٢٢.

**١٨.** قَالَ ابْنُ صَلَاحْ الْشَّهْرَزُورِيّ رَحِمَهُ اللهُ: «**للصحابة بأسرهم خصيصة، وهي: أنه لا يسأل عن عدالة أحد منهم، بل أمر مفروغ منه، لكونهم على الإطلاق معدلين بنصوص الكتاب والسنة وإجماع من يعتد به في الإجماع من الأمة**»[(١)].

**واته: بۆ هاوەڵان بە گشتی تایبەتمەندییەك هەیە: ئەویش ئەوەیە پرسیار لە دادپەروەری كەسیان ناكرێت، ئەم كارە كۆتایی پێ هاتووە، لەبەر ئەوەی بە شێوەیەكی گشتی تەزكییە و باسكراون بە دەقەكانی قورئان و فەرمودە و كۆدەنگی ئەو زانایانەی كە ڕایان لە كۆدەنگیدا وەردەگیرێت.**

**١٩.** قَالَ الْجُوَيْنِيُّ رَحِمَهُ اللهُ: «**وَلَعَلَّ السَّبَبَ فِي قَبُولِهِمْ مِنْ غَيْرِ بَحْثٍ عَنْ أَحْوَالِهِمْ أَنَّهُمْ نَقَلَةُ الشَّرِيعَةِ، وَلَوْ ثَبَتَ التَّوَقُّفُ فِي رِوَايَتِهِمْ، لَانْحَصَرَتِ الشَّرِيعَةُ عَلَى عَصْرِ الرَّسُولِ وَلَمَا اسْتَرْسَلَتْ عَلَى سَائِرِ الْأَعْصَارِ**»[(٢)].

**واته: هۆكاری وەرگرتنی ڕیوایەتەكانی هاوەڵان بەبێ بەدواداچوون لەسەر بارودۆخیان، وە هۆكاری خوێندنەوەی كۆدەنگییان و كردنە بەڵگە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە هاوەڵان هۆكاری گەیاندنی دینەكەن، وە گەر گێڕانەوەكەیان وەرنەگیرێت، ئەوا دین و شەریعەت لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەرناچێت بۆ سەردەمەكانی تر.**

**٢٠.** قَالَ ابْن الْقَيّمْ رَحِمَهُ اللهُ: «**رَأْيُ أَفْقَهِ الْأُمَّةِ، وَأَبَرِّ الْأُمَّةِ قُلُوبًا، وَأَعْمَقِهِمْ عِلْمًا، وَأَقَلِّهِمْ تَكَلُّفًا، وَأَصَحِّهِمْ قُصُودًا، وَأَكْمَلِهِمْ فِطْرَةً، وَأَتَمِّهِمْ إدْرَاكًا، وَأَصْفَاهُمْ أَذْهَانًا، الَّذِي شَاهَدُوا التَّنْزِيلَ، وَعَرَفُوا التَّأْوِيلَ، وَفَهِمُوا مَقَاصِدَ الرَّسُولِ؛ فَنِسْبَةُ آرَائِهِمْ وَعُلُومِهِمْ وَقُصُودُهُمْ إلَى مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَنِسْبَتِهِمْ إلَى صُحْبَتِهِ؛ وَالْفَرْقُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَنْ بَعْدَهُمْ فِي ذَلِكَ كَالْفَرْقِ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُمْ فِي الْفَضْلِ؛ فَنِسْبَةُ رَأْيِ مَنْ بَعْدَهُمْ إلَى رَأْيِهِمْ كَنِسْبَةِ قَدْرِهِمْ إلَى قَدْرِهِمْ**»[(٣)].

---

(١) "الإبانة الصغرى" لابن بطة (٢٦٣)، و "الإصابة في الذب عن الصحابة" لدكتور مازن بن محمد بن عيسى ص١٣١، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض حسن الشيخ (٢/ ٨١٢)، و "قطف الجني الداني شرح مقدمة رسالة ابن أبي زيد القيرواني" لعبدالمحسن العباد ص١٥٩.

(٢) "البرهان في أصول الفقه" للجويني (١/ ٢٤٢)، و "إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ١٨٦).

(٣) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦٣).

واتە: ڕای چاك ڕای هاوەڵانە، شارەزاترین کەسانی ئەم ئوممەتەن، وە باشترین و خاوەنی خێرۆمەندترین دڵ و خاوەنی قووڵترین زانست و کەمترین قورساییین لە فەتوا و دیندا و پاکترین نیەت و کاملترین نەفس و تەواوترین وورپایی و پوختترین بۆچوونن، کەسانێکن کە شاهیدحاڵی هاتنەخوارەوەی قورئان بوون، وە زاناترین کەس بوون بەسەر تەفسیردا و تێگەیشتووترین کەسانێك بوون بەسەر مەبەستەکانی پێغەمبەردا ﷺ، ئاستی بۆچوون و زانستەکانیان و نیەتەکانیان لە دیندا وەکوو ئاستی پلەی هاوەڵێیەتییان بۆ پێغەمبەر ﷺ وایە، جیاوازی نێوان ئەمان و پاش ئەمان وەکوو جیاوازی ئاستی دینییانە، بۆچوونەکانیان لە ئاستی بۆچوونی دوای خۆیان وەکوو جیاوازی پلەی یەکترییان وایە.

وە دەڵێت: «وَالْمَقْصُودُ أَنَّ أَحَدًا مِمَّنْ بَعْدَهُمْ لَا يُسَاوِيهِمْ فِي رَأْيِهِمْ، وَكَيْفَ يُسَاوِيهِمْ وَقَدْ كَانَ أَحَدُهُمْ يَرَى الرَّأْيَ فَيَنْزِلُ الْقُرْآنُ بِمُوَافَقَتِهِ؟ ... وَحَقِيقٌ بِمَنْ كَانَتْ آرَاؤُهُمْ بِهَذِهِ الْمَنْزِلَةِ أَنْ يَكُونَ رَأْيُهُمْ لَنَا خَيْرًا مِنْ رَأْيِنَا لِأَنْفُسِنَا، وَكَيْفَ لَا وَهُوَ الرَّأْيُ الصَّادِرُ مِنْ قُلُوبٍ مُمْتَلِئَةٍ نُورًا وَإِيمَانًا وَحِكْمَةً وَعِلْمًا وَمَعْرِفَةً وَفَهْمًا عَنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَنَصِيحَةً لِلْأُمَّةِ، وَقُلُوبُهُمْ عَلَى قَلْبِ نَبِيِّهِمْ، وَلَا وَاسِطَةَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ، وَهُمْ يَنْقُلُونَ الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ مِنْ مِشْكَاةِ النُّبُوَّةِ غَضًّا طَرِيًّا لَمْ يَشُبْهُ إِشْكَالٌ، وَلَمْ يَشُبْهُ خِلَافٌ، وَلَمْ تُدَنِّسْهُ مُعَارَضَةٌ، فَقِيَاسُ رَأْيِ غَيْرِهِمْ بِآرَائِهِمْ مِنْ أَفْسَدِ الْقِيَاسِ»[1].

واتە: مەبەست ئەوەیە کەس ناگاتە پلەی ئەوان و ناچێتە ئاستیان، بەڵکوو هەندێکیان وەحی لەسەر ڕایەکەی دادەبەزی، گەر لەم ئاستەدا بن شایستە بەوەن ڕایان بۆ ئێمە باشتر بێت تا ڕای خۆمان، چۆن وا نابێت کە لە دڵێکەوە دەرچووە پڕ لە ئیمان و حیکمەت و نوور و زانست و تێگەیشتنن لە خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی ﷺ، دڵیان لەسەر دڵی پێغەمبەر بووە، وە لەنێوان خۆیان و پێغەمبەردا ﷺ کەسانێکی تر نەبووە بۆ گەیاندنی دینەکە، خۆیان گەیەنەری زانست و ئیمان بوون لە دەلاقەی پێغەمبەرایەتییەوە بە تەڕ و پاراوی، هیچ تێکچوون و جیاوازییەکی تێکەڵ نەبووە، وە بەرامبەرێتی بۆ دروست نەبووە، بۆیە کێشانەی ڕاوبۆچوونی ئەوان بە ڕاوبۆچوونی دوای ئەوان و خستنەئاستی یەك هەڵەیەکی گەورەیە.

(١) "إعلام الموقعين عن رب العالمين" لابن القيم (١/ ٦٤ – ٦٥).

**٢١.** قَالَ ابْن تَيْمِيَّة رَحِمَهُ اللهُ: «فَإِنَّهُمْ خَيْرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ، كَمَا تَوَاتَرَتْ بِذَلِكَ الْأَحَادِيثُ ... وَهُمْ أَفْضَلُ الْأُمَّةِ، الْوَسَطُ الشُّهَدَاءُ عَلَى النَّاسِ، ... فَلَيْسُوا مِنَ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ، وَلَا مِنَ الضَّالِّينَ الْجَاهِلِينَ ... بَلْ لَهُمْ كَمَالُ الْعِلْمِ وَكَمَالُ الْقَصْدِ، ... وَالصَّحَابَةُ أَكْمَلُ الْأُمَّةِ فِي ذَلِكَ بِدَلَالَةِ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَالْإِجْمَاعِ وَالِاعْتِبَارِ، وَلِهَذَا لَا تَجِدُ أَحَدًا مِنْ أَعْيَانِ الْأُمَّةِ إِلَّا وَهُوَ مُعْتَرِفٌ بِفَضْلِ الصَّحَابَةِ»[١].

واتە: هاوەڵان چاكترین كەسانی ئەم ئوممەتەن، وەكوو چەندەها ڕیوایەت لەو بارەیەوە هاتووە، ئەوان باشترین كەسانی دادپەروەرن كە شایەتن بەسەر خەڵكییەوە، نە لە نەفرەتلێكراوەكانن وەكوو جوولەكە، كە شوێنكەوتەی هەوا و ئارەزووەكانیانن، وە نە نەزان و گومڕان وەكوو گاورەكان، بەڵكوو خاوەنی كامڵترین زانست و خاوەن نیەتن، هاوەڵان چاكترین و كامڵترینی ئەم ئوممەتەن، بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی زانایان، لەبەرئەوە كەسێك نییە لەم ئوممەتەدا دانی نەنابێت بە پلەوپایەیاندا.

**٢٢.** قَالَ ابْنُ كَثِيْر رَحِمَهُ اللهُ: «وَالْأَحَادِيثُ فِي فَضَائِلِ الصَّحَابَةِ وَالنَّهْيِ عَنِ التَّعَرُّضِ لَهُمْ بِمَسَاءَةٍ كَثِيرَةٌ، وَيَكْفِيهِمْ ثَنَاءُ اللهِ عَلَيْهِمْ وَرِضَاهُ عَنْهُمْ ... وَلَهُمُ الْفَضْلُ وَالسَّبْقُ وَالْكَمَالُ الَّذِي لَا يَلْحَقُهُمْ فِيهِ أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ»[٢].

واتە: فەرموودە زۆرە لە باسی پلەوپایەی هاوەڵان و قسەنەوتن پێیان، ئەوەندە بەسە كە خوای گەورە وەسف و پایەداریان دەكات، ئەوان پلە و پێشینەییەك و كامڵییەكیان هەیە، كەس لە موسوڵمانان پێیان ناگاتەوە، خوای گەورە لێیان ڕازی بێت و ڕازییان بكات.

**٢٣.** قَالَ الْقُرْطُبِيّ رَحِمَهُ اللهُ: «فَالصَّحَابَةُ كُلُّهُمْ عُدُولٌ، أَوْلِيَاءُ اللهِ تَعَالَى وَأَصْفِيَاؤُهُ، وَخِيَرَتُهُ مِنْ خَلْقِهِ بَعْدَ أَنْبِيَائِهِ وَرُسُلِهِ. هَذَا مَذْهَبُ أَهْلِ السُّنَّةِ»[٣].

---

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٨٠).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٣).

(٣) "تفسير القرطبي" (١٦/ ٢٩٩).

**واتە: هاوەڵان هەموویان دادپەروەرن، وەلییەکانی خوان و هەڵبژێردراو و چاکترینی دروستکراوانی خوان پاش پێغەمبەران ﷷ، ئەمە بەرنامەی ئەهلی سوننەیە.**

  

# بەشی دووەم

## ڕاجیایی نێوان هاوەڵان و ڕوونکردنەوەی زانایان بۆی

## (الخلاف بين الصحابة وأقوال العلماء فيه)

بەگوێرەی دەقی ئەو ئایەت و فەرموودە و قسەی زانایانە، هاوەڵان پلەوپایەیەکی گەورەی دینی و دونیاییان بەدەستهێناوە، ئەم پلە و بەرێزییە بەرهەمی تەواوی کاملّی دینییانە، لەڕووی وەرگرتن و جێبەجێکردنیەوە، کەواتە زانا و خواناس و سەرکردە و ناوداری ئەم دینەن، بەڵکوو (معجزة)ی ئیسلامە، کە چینێکی ئاوا دەگەیەنێتە ئەو ئاستە، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ»[1].

واتە: خوای پەروەردگار بەم قورئانە کۆمەڵێك پایەبەرز دەکات و کۆمەڵێکیش دادەبەزێنێت کە وەری ناگرن.

وە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝٥﴾ [القَصَص: ٥].

واتە: خوای گەورە دەیەوێت منەت و نیعمەتی خۆی بڕژێنێت بەسەر ئەوانەی کە بێ دەسەڵات و لاوازن لە زەویدا، بیانکاتە پێشەوا و پێشەنگ و باڵادەستی سەر زەوی.

بۆیە هەر لە کۆنەوە تا ئەم سەردەمە دژایەتیکەرانی ئەم دینە بۆ کەلێنێك دەگەڕێن بۆ لێدان و بێ متمانەکردنی ئیسلام، هەر لە فیرەقە گومڕاکانەوە کە دروستکراوی دەستی دوژمنانی کۆنی ئیسلام بووە لە (مجوسیە)کان و دینە سڕدراوەکانی وەکوو جوولەکە و گاوورەکان لە بێدەسەڵاتییاندا پیلانگێڕ بوون بۆ کەلێن دروستکردن، هەر لە (ابن سبأ)ی کۆنە جوولەکە و

---

(١) رواه مسلم (٨١٧)، وابن ماجه (٢١٨)، وأحمد في "المسند" (٢٣٢)، والدارمي في "السنن" (٣٤٠٨)، والطبراني في "مسند الشاميين" (٢٩٩٩)، والبيهقي في "الشعب" (٢٤٢٨)، وفي "السنن الكبرى" (٥١٢٥)، وفي "مسند الفاروق" لابن كثير برقم (٢/ ٦٠٩).

ئەوانەی کە گۆشکراوی دەستی فەیلەسووفەکانن لە (معتزلة) و عەقلانییەکان و خاوەن هەوا و ئارەزووەکان ... .

یەکەم کاریان کە تا ڕادەیەك جێگیر بێت لێدانی هاوەڵانە، بە بیانووی جۆراوجۆر و چەواشەکاری و لەگەڵ خۆکەڕکردن لەو هەموو دەقی ئایەت و فەرموودانە و وتەی کۆی زانایان کە وەکوو ڕۆژێکی ڕۆشنە لەم بوارەدا.

لایەنێك دەیەوێت وەکوو کەسانێکی سادە سەیر بکرێن، دوور لەو هەموو بەها و ئەو ڕێزەی کە هەیانە، وە لایەنێکی تر دەیانەوێت بیانگەیەننە ئاستی پێغەمبەران و قابیلی هیچ هەڵەیەك نەبن.

لایەنێك (عدالة) و دادپەروەرییان لێ دەسێنێتەوە و کامڵییان لێ دادەنرێنێت، وە لایەنێکی تر (معصوم)یەتیان پێ دەبەخشێت کە پلەی پێغەمبەرایەتییە، لایەنێك کەمڕەو و لایەنێکیش زیادەڕەو (الإفراط والتفريط)، خەوارجەکان و موعتەزیلە و عەقڵانییەکان کەمڕەون تیایاندا، دەیانەوێت هاوەڵان وەکوو هەموو کەسێکی سادە و ساکاری ناو بازنەی دین پێوانەیان بۆ بکرێت، وە ڕافیزە(شیعە)کان ئیمامی (عەلی) و بنەماڵەکەی و نەوەکانی بە (معصوم) دادەنێن.

ئەمە کاری جوولەکە و گاوورەکانە، جوولەکەکان پێغەمبەرانیان بە کەسانی سادە دەزانی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ [آل عمران : ١١٢].

بۆیە کوشتنی (يحى و زكريا) و دەستیشیان لە (عيسى) ﷺ بە هەوڵدان لەسەری و تەنانەت زەهراویکردنی مەڕەکەی خەیبەر بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەبوو، ناودار بوون بە بکوژی پێغەمبەران (قتلة الأنبياء) ﷺ، ئەوەندە بە سادە سەیریان دەکردن، وە لەولاشەوە گاوورەکانیش پێغەمبەر (عيسى) ﷺ یان بە بەشێك لە خوا یان کوڕی خوا دادەنا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾ [المائدة : ٧٣]، ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾ [التوبة : ٣٠].

بەڵام بەرنامەی ئەهلی سوونە باوەڕیان بەوەیە کە نابێت لە هاوەڵاندا زیادەڕەوی و کەمڕەوی بکرێت، دەبێت پلەوپایەی خۆیان پێ بدرێت کە مافی خۆیانە: ﴿وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ﴾ [هود : ٣].

واتە: هەموو خاوەن پلەیەك پلەکەی خۆی بدرێتێ.

نە کەسێکی سادەوساکارن، وە نە بێتاوان و پارێزراون، واتە نە (معصوم) بن وەکوو پێغەمبەران ﷺ، بەڵکوو پلەی (عدالة) ڕاست و دروستی و کاملی و دادپەروەری دینییان پێ ببەخشرێت، کە ئەم پلەی دادوەرییە (عدالة) دیاری و بەخششی ئێمە نییە، بەڵکوو پێبەخشینی خوایی و پلەوپایەی بەرزی خۆیانە، کە پێبەخشینیان دەبێتە هۆکاری متمانەی تەواوی گەیاندنی ئەو دینە بۆ ئێمە، کە دەبێت هەر وایش بێت، گەرنا ئەو دینە قەتیس دەمێنێت بۆ سەردەمی خۆی و هۆکاری گەیاندن دەپچڕێت و دەبێتە هۆی نەمانی دین، ئەمەش ناگونجێت لەگەڵ گەورەیی و باڵادەستی خوادا، کە کۆمەڵێك دروست نەبێت بۆ گەیاندنی دینەکەی و لاوازی بەرنامەکەی و قابیلی مانەوە و گەیاندن نەبێت و دروستکراوەکانی (مخلوقات) هۆکاری ژیانیان بۆ بڕەخسێنێت، بەڵام بۆ پێویستی و یاساکانی ژیان و ڕێنموونییان و هیدایەتیان پەراوێز و لەبیریان بکات، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ [المؤمنون: ١١٥].

واتە: وا گومان دەبەن ئێمە ئێوەمان بۆ گاڵتە و گەپ دروستکردووە و ناگەڕێنەوە لامان؟!

کە بۆخۆی کاملی بەرنامەکەی نیشانەی کاملی خۆیەتی، وە کاری پێغەمبەرەکەی ﷺ بەرهەمدار و مایەی مانەوە بێت، بۆیە هاوەڵان وەکوو هەموو ئادەمیزادێك ئادەمیین و لەخۆگری هاوشێوەکانیانن و فریشتە (ملائكة) نین، قەدەرەکانی خوایی و ڕووداوەکانی دونیایی و تاقیکردنەوەکان هیچ بەربەستێکیان نییە لە ئاستیاندا.

بۆیە هەرچییەکیان کردبێت لە چوارچێوەی ئیجتیهاد و سوودمەندی دینی و دونیایی ئەو خەڵکە دەرناچێت و پلەوپایە و زانستی دینی و کارە گەورە و گرانە ڕابوردووەکانیان بەڵگەنەویستە بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێن و گومانی باشیان پێ ببرێت، کە هەر ئەوەندەیان بۆ ڕەخساوەو پێ کراوە لەو سەردەمەدا، خوای گەورە و میهرەبان پاداشتیان لەسەر چاکەکانیان باتەوە و لە نەتوانینەکانیشیان ببوورێت، کەسانێکی خۆنەویست و دونیانەویست بوون، زانا و تێکۆشەر و هەوێنی ئەم دینە بوون، بەم شێوەیە زانایانی ئەهلی سوننە دەڕواننە هاوەڵانی خۆشەویست، بە باسی چاکەکانیان و لادانی ڕووداوەکانیان.

بۆیە لەبیرکردنی پلەوپایە و وەسفی قورئان و فەرموودە لەسەریان و باسکردنی ڕووداوەکانی نێوانیان و بنیادنانی دین لەسەریان؛ نیشانەی گومڕایی و پێچەوانەی دەقی ئایەت و فەرموودەکانە،

ئەمە بە کاری بیدعەکاران و سەرلێشێواوان ناودەبرێت، مەبەستیش لە پشتیانەوە لێدانی دین و دوژمنکارییە بۆی.

بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێك لە وتەی زانایانی ئەهلی سوونە لەسەر جیاوازییەکانی نێوان هاوەڵان و چۆنێتی مامەڵە و تێڕوانین لەگەڵ ئەو بابەتانەدا دەخەینە ڕوو:

١. قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَكَذَلِكَ نُؤْمِنُ بِالْإِمْسَاكِ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَهُمْ وَنَعْلَمُ أَنَّ بَعْضَ الْمَنْقُولِ فِي ذَلِكَ كَذِبٌ. وَهُمْ كَانُوا مُجْتَهِدِينَ؛ إمَّا مُصِيبِينَ لَهُمْ أَجْرَانِ؛ أَوْ مُثَابِينَ عَلَى عَمَلِهِمْ الصَّالِحِ مَغْفُورٌ لَهُمْ خَطَؤُهُمْ؛ وَمَا كَانَ لَهُمْ مِنْ السَّيِّئَاتِ وَقَدْ سَبَقَ لَهُمْ مِنْ اللَّهِ الْحُسْنَى فَإِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُهَا لَهُمْ: إمَّا بِتَوْبَةِ أَوْ بِحَسَنَاتِ مَاحِيَةٍ أَوْ مَصَائِبَ مُكَفِّرَةٍ؛ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ. فَإِنَّهُمْ خَيْرُ قُرُونِ هَذِهِ الْأُمَّةِ»[(١)].

واتە: (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: باوەڕمان بەوەیە بێدەنگ بین لە ئاست ڕووداوەکانی نێوانیان، وە بزانین ئەو شتانەی لەو بارەیەوە وتراوە هەندێکیان درۆن، ئەوان بۆ خۆیان ئیجتیهادیان کردووە، یا ئەوەتا پێکاویانە و دوو پاداشتیان هەیە لەسەر ئەو کارە چاکانەیان کە هۆکاری لێخۆشبوونی هەڵەکانیان و سڕینەوەی تاوانەکانیانە، ئەمان هەر لە ئەزەلەوە لای خوا بە چاك نووسراون، خوای پەروەردگار لێیان خۆش دەبێت بە تەوبە یان بە چاکەکان کە هۆکاری سڕینەوەیە، یاخود بەو بەڵا و ناخۆشییانەی کە سڕەرەوەی تاوانەکانە، یان بەدەر لەمانە، ئەوان بۆ خۆیان باشترین سەدە بوون لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ.

وە دەڵێت: «وَأَنَّ الِاقْتِتَالَ لَا يَمْنَعُ الْعَدَالَةَ الثَّابِتَةَ لَهُمْ، لِأَنَّ الْمُقَاتِلَ وَإِنْ كَانَ بَاغِيًا فَهُوَ مُتَأَوِّلٌ وَالتَّأْوِيلُ يَمْنَعُ الْفُسُوقَ»[(٢)].

واتە: شەڕکردن نابێتە هۆکاری نەمانی دادپەروەرییەکەیان، لەبەرئەوەی شەڕکردن ئەگەرچی یاخیبوونە، هۆکارەکەی بۆچوون و ئیجتیهادێکی دینییە، کە ئەمەش ڕێگرە لەوەی کە بە فاسق و تاوانبار هەژمار بکرێت.

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٤٠٦).

(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٢٣٠).

٢. قَالَ (الذهبي) ﵀: «كَمَا تَقَرَّرَ عَنِ الكَفِّ عَنْ كَثِيْرٍ مِمَّا شَجَرَ بَيْنَ الصَّحَابَةِ، وَقِتَالِهِم رَضِيَ اللهُ عَنْهُم أَجْمَعِيْنَ، وَمَا زَالَ يَمُرُّ بِنَا ذَلِكَ فِي الدَّوَاوِينِ، وَالكُتُبِ، وَالأَجْزَاءِ، وَلَكِنْ أَكْثَرُ ذَلِكَ مُنْقَطِعٌ، وضَعِيْفٌ وَبَعْضُهُ كَذِبٌ وَهَذَا فِيْمَا بِأَيْدِيْنَا وَبَيْنَ عُلَمَائِنَا، فَيَنْبَغِي طَيُّهُ وَإِخْفَاؤُهُ، بَلْ إِعْدَامُهُ، لِتَصْفُوَ القُلُوْبُ وَتَتَوَفَّرَ عَلَى حُبِّ الصَّحَابَةِ وَالتَّرَضِّي عَنْهُم، وَكُتْمَانُ ذَلِكَ مُتَعَيِّنٌ عَنِ العَامَّةِ، وَآحَادِ العُلَمَاءِ، وَقَدْ يُرَخَّصُ فِي مُطَالَعَةِ ذَلِكَ خَلْوَةً لِلْعَالِمِ المُنْصِفِ، العَرِيِّ مِنَ الهَوَى، بِشَرْطِ أَنْ يَسْتَغفرَ لَهُم، كَمَا عَلَّمَنَا اللهُ تَعَالَى حَيْثُ يَقُوْلُ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ [الحشر: ١٠]، فَالقَوْمُ لَهُم سَوَابِقُ وأعمال مكفرة لما وقع بينهم، وَجِهَادٌ مَحَّاءٌ، وَعُبَادَةٌ مُمَحِّصَةٌ، وَلَسْنَا مِمَّنْ يَغْلُو فِي أَحَدٍ مِنْهُم، وَلاَ نَدَّعِي فِيْهِم العِصْمَةَ، نَقْطَعُ بِأَنَّ بَعْضَهُم أَفْضَلُ مِنْ بَعْضٍ»[(١)].

واتە: ئیمامی (زەهەبی) ﵀ دەڵێت: وەکوو بڕیارە واز لە زۆری ڕووداوەکانی نێوان هاوەڵان بهێنرێت، گەرچی لە نووسراو و کتێب و بەشەکاندا هەر بەسەرماندا تێدەپەڕێت، گەرچی زۆری گێڕانەوەکانیان پچڕاندنی تێدایە، یاخود سەنەدەکەی (ضعیف)ە، وە هەندێکیشیان درۆن، ئەمانەی بە دەستی ئێمە و زانایانەوەیە کە پێویستە بپێچرێتەوە و بشاردرێتەوە، بەڵکوو نەهێڵدرێت، تاوەکوو دڵەکان بە پاکی بمێنێتەوە و پڕبێت لە خۆشەویستی هاوەڵان و دووعای ڕازیبوون بۆیان، باسنەکردن و شاردنەوەی ئەو بابەتانە پێویستە لەسەر ئاستی گشتی و تاك تاکی زانایان، ڕەنگە ڕێگە بدرێت بە پێداچوونەوە و خوێندنەوەی لەلایەن زانایەکی بەویژدان و دوور لە هەوا و ئارەزوو، بە مەرجی داوای لێخۆشبوونکردن بۆیان، بە دەقی ئایەتەکە کە خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ [الحشر: ١٠]، ئەوان خاوەن پێشینەیەك و کردەوەیەکی سڕەرەوەیان هەیە بۆ ڕووداوەکانیان، وە خاوەن جیهاد و عیبادەتێکی پاککەرەوەکارن، ئێمەش کەسانێك نین زیادەڕەوییان تێدا بکەین و (معصوم)یەتیان بخەینە پاڵ، بەڵکوو ئەوە یەکلاکەرەوەیە کە هەندێکیان بەڕێزترن تا هەندێکیان.

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١/ ٤٩).

٣. قَالَ (عمر بن عبدالعزيز) رَحِمَهُ اللهُ: «تِلْكَ دِمَاءٌ طَهَّرَ الله يَدِي مِنْهَا؛ أَفَلا أُطَهِّرُ مِنْهَا لِسَانِي؟ مَثَلُ أَصْحَابِ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَثَلُ العُيُوْنِ، ودَوَاءُ العُيُوْنِ تَرْكُ مَسِّهَا»(١).

واته: (عومەری کوڕی عبد العزیز) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئەوە خوێنێك بوو، خوای گەورە دەستی پاراستم لێی، ئایا زمانمی لێ نەپارێزم؟ نموونەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نموونەی چاوە، وە دەرمانی چاویش دەستلێنەدانیەتی.

٤. سُئِلَ الْحَسَنُ الْبَصْرِيُّ عَنْ قِتَالِهِمْ فَقَالَ: «قِتَالٌ شَهِدَهُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَغِبْنَا، وَعَلِمُوا وَجَهِلْنَا، وَاجْتَمَعُوا فَاتَّبَعْنَا، وَاخْتَلَفُوا فَوَقَفْنَا»(٢).

واته: پرسیار دەکرێت لە (حەسەنی بەسری) رَحِمَهُ اللهُ دەربارەی ئەو شەڕانەی ڕوویداوە لەنێوان هاوەڵاندا، دەڵێت: هاوەڵان ئامادەی بوون و ئێمەی لێ نەبووین، ئەوان زانا بوون بەسەریدا، ئێمە نەزان بووین، کاتێك کۆدەنگ بوون شوێنکەوتەیان بووین، وە کاتێك جیاواز بوون ئێمە وەستاین.

٥. سئل جعفر بن محمد الصادق عما وقع بين الصحابة، فأجاب بقوله: «أقول ما قال الله: ﴿عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ۝٥٢﴾ [طه: ٥٢]»(٣).

واته: پرسیار لە ئیمام (جەعفەری صادق) رَحِمَهُ اللهُ کرا دەربارەی ئەو ڕووداوانە، وەڵامی دایەوە و وتی: ئەوە دەڵێم کە خوای گەورە دەیلێت: زانست لە بارەیانەوە لای خوایە و لە کتێب و نووسراوێکدایە کە لێتێکچوون و لەبیرچوونەوەی لەسەر دروست نابێت لای خوا.

٦. قَالَ (ابن حجر) رَحِمَهُ اللهُ: «وَاتَّفَقَ أَهْلُ السُّنَّةِ عَلَى وُجُوبِ مَنْعِ الطَّعْنِ عَلَى أَحَدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ بِسَبَبِ مَا وَقَعَ لَهُمْ مِنْ ذَلِكَ وَلَوْ عَرَفَ الْمُحِقَّ مِنْهُمْ لِأَنَّهُمْ لَمْ يُقَاتِلُوا فِي تِلْكَ الْحُرُوبِ إِلَّا عَنِ اجْتِهَادٍ وَقَدْ عَفَا اللهُ تَعَالَى عَنِ الْمُخْطِئِ فِي الِاجْتِهَادِ بَلْ ثَبَتَ أَنَّهُ يُؤْجَرُ أَجْرًا وَاحِدًا وَأَنَّ الْمُصِيبَ يُؤْجَرُ أَجْرَيْنِ»(٤).

---

(١) "الإنصاف" للباقلاني ص١٦، و "الطبقات" لابن سعد (٥/ ٣٩٤)، و "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (١٦/ ١٢٢)، و "مناقب الشافعي" للرازي ص١٣٦.

(٢) "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (١٦/ ٣٢٢).

(٣) "الإنصاف" للباقلاني ص١٦٤.

(٤) "فتح الباري شرح صحيح البخاري" لابن حجر العسقلاني (١٣/ ٣٤).

واتە: ئەهلی سوننە کۆدەنگن لەسەر واجبوونی بێدەنگی لە تانەدان لە یەکێك لە هاوەڵان بە هۆکاری ڕووداوەکانی نێوانیان، ئەگەرچی بشزانرێت کە خاوەن حەق کێیە، لەبەر ئەوەی ئەو شەڕانە بە ئیجتیهاد کراوە، ئەویش لەنێوان پاداشتێك و دوو پاداشتدایە.

**٧**. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ بنُ بَطَّةَ رَحِمَهُ اللهُ عِنْدَ عَرْضِهِ لِعَقِيْدَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ والجَمَاعَةِ: «ومِنْ بَعْدِ ذَلِكَ نَكُفُّ عَمَّا شَجَرَ بَيْنَ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وقَدْ شَهِدُوا المَشَاهِدَ مَعَهُ، وسَبَقُوا النَّاسَ بالفَضْلِ فَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَهُم، وأَمَرَكَ بالاسْتِغْفَارِ لَهُم، والتَّقَرُّبِ إِلَيْهِ بِمَحبَّتِهِم، وفَرَضَ ذَلِكَ على لِسَانِ نَبِيِّهِ وهُوَ يَعْلَمُ ما سَيَكُونُ مِنْهُم أَنَّهُم سَيَقْتَتِلُوْنَ، وإِنَّمَا فُضِّلُوا على سَائِرِ الخَلْقِ لأَنَّ الخَطَأَ العَمْدَ قَدْ وُضِعَ عَنْهُم، وكُلُّ ما شَجَرَ بَيْنَهُم مَغْفُوْرٌ لَهُم»(١).

واتە: ئیمامی (ابن بطة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: دەبێت ڕووداوەکانی نێوان هاوەڵان باس نەکرێت، لەبەر بەشداربوونیان لە تێکۆشان بۆ دین لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و پێشینەی خێرییان، وە لێخۆشبوونی خوایی و فەرمانی خوایی بە داوای لێخۆشبوونکردن بۆیان، وە نزیکبوونەوەیان لێی بە خۆشەویستی ئەوان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەگەڵ ئەوەشدا خوا زانا بووە بەوەی کە لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، وە پلەبەرزییان بەسەر خەڵکدا ئەوەیە کە بە ئەنقەست و هەڵەکاری کاریان نەبووە.

  

(١) "الإبانة على أصول السنة والديانة" لابن بطة ص٢٦٨ .

# داد پــەروەری هــاوەڵان

## (تعديل الصحابة)

وشەی (عدالة الصحابة) واتە کەسایەتییەکی ڕاست و دروستی کامڵی دینی، کە لە ئاستێکی بەرزی کۆمەڵگاکەیان شوێنی متمانەی دینی و دونیایی خەڵکی بن، ئەو ئاستەش بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر و پڕ زانستی دینی و تێکۆشان بەدەست دێت.

ئەم وشەیە (عدالة) ناونیشانی پلە و ئاستی دینی و دونیایی هاوەڵانە، ئەو پلە و ئاستەش دروستکراو نییە بۆیان بە خەیاڵ، بەڵکوو دەستکرد نییە و پێبەخشینی خواییە، وە نە شایستەی ئەوەشن بخرێنە ئاستێکی سادەوساکاری ئەو خەڵکە و ئەو هەموو جیاوازی و پلەدارییەیان لێ زەوت بکرێت، بەڵکوو مافی خۆیان دەدرێتێ لەو ئاست و پلەیەی کە بەدەستیان هێناوە.

بەتایبەت ئەوان پلەوپایەدار کراون لە ڕێگەی قورئان و فەرموودەوە، کە ئیتر بۆخۆی شوێنی هیچ گومان و تێڕوانین و ڕەتکردنەوەیەك نییە، ڕەتکردنەوەی پلەوپایەیان دژایەتی و بەرامبەریەتی قورئان و فەرموودەیە و دەرچوونە لێیان.

ئەم پلەیەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو کارێکیان لە بازنەی پێکاندنی حەق و چاکە دەرناچێت، وە ئەو کارانەشیان کە بە هەڵە دەبینرێت هەر شوێنی گومانی باشە و شیکردنەوەی باشی بۆ دەکرێت، وە لە ئەوپەڕی بەکارهێنانی توانای خۆیان و ئیجتیهادی دینییە، گەیشتوونەتە ئەو کارانە بە پێکاندن و نەپێکاندن، ئەوان لەنێوان پاداشتێك و دوو پاداشتدان، وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ»[(١)].

---

(١) رواه البخاري (٧٣٥٢)، ومسلم (١٧١٦)، وأحمد في "المسند" (١٧٨١٦)، والطبراني في "الأوسط" (٣١٩٠)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥١)، وابن بطة في "الإبانة" (٦٩٦)، وابن الأعرابي في "المعجم" (٢٢٥٠)، وابن زنجوية في "الأموال" (١٢).

وە هەرچییەکیش لەبارەیانەوە نووسرابێت و نەقڵ کرابێت و نەگونجێت و لە ئاستی ئەواندا نەبێت، ئەوا پێش ناخرێت بەسەر ئەو هەموو وەسف و تەزکییەیەی خوا و پێغەمبەردا ﷺ، لەبەرئەوەی دەقەکان دڵنیایین (يقين)، ئەوانی تر گومانن، وە (الْيَقِينُ لَا يَزُولُ بِالشَّكِّ)[1].

واتە: دڵنیاییەکانیش بە گومان نارەوێنەوە.

کردەوە گەورە و گرانەکانیان و بەکارهێنانی هەموو تەمەن لە پێناویاندا هۆکاری سڕینەوە و نەخوێندنەوەی کارە زبرەکانە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «أَقِيلُو ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ إِلَّا الْحُدُودَ»[2].

واتە: هەڵەکان بپۆشن لە کەسە ناودارەکان، بێجگە لە حەددە گەورەکان نەبێت.

وە هەر بۆ ئەوانە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ۝٨﴾ [الحشر: ٨]، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۝٩﴾ [الحشر: ٩]، ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ﴾ [التوبة: ١٠٠]، ﴿مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ۝٢٩﴾ [الفتح: ٢٩]، ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ۝١٠٠﴾ [التوبة: ١٠٠]، ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ [الحديد: ١٠]، ﴿إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١١٧﴾ [التوبة: ١١٧]، ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ﴾ [آل عمران: ١١٠]، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ۝٣٣﴾ [الزمر: ٣٣].

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دَعُوا لِي أَصْحَابِي»، «أَحْسِنُوا إِلَى أَصْحَابِي»، «إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا»، «أَصْحَابِي أَمَنَةٌ لِأُمَّتِي»، «لَا تَزَالُونَ بِخَيْرٍ مَا دَامَ فِيكُمْ مَنْ رَآنِي وَصَاحَبَنِي»، «اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ».

---

(١) "الأشباه والنظائر" لابن نجيم ص٤٧، و "الفقيه والمتفقه" للخطيب البغدادي (١/ ٥٢٧).

(٢) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٤٦٥)، وأبو داود (٤٣٧٥)، والنسائي في "الكبرى" (٧٢٥٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٩٤)، وأحمد في "المسند" (٢٥٤٧٤)، والدارقطني في "السنن" (٣٤٧٣)، وأبو يعلى في "المسند" (٤٩٥٣)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٣٧٦)، والطبراني في "الأوسط" (٣١٣٩)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٧٢٢٩)، وفي "الشعب" (٧٩٥٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٩/ ٤٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١٠/ ٣٣٠)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٦٣٨)، و "صحيح الجامع الصغير" (١١٨٥).

لەگەڵ ئەوەشدا پلەی (معصوم)یەتیان پێ نادرێت و قابیل بەوەن هەڵە و لێتێکچوون و تاوان و هەموو ڕووداوەکانی سەر ئادەمیزاد بەسەریاندا بێت و لەسەروو یاسا و (حصانة)ی یاساییان پێ نادرێت لە ئاستی یاساکانی شەرعدا.

وەکوو ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «لو كان العدل من لا ذنب له لم نجد عدلاً، ولو كان كلّ مذنب عدلاً لم نجد مجروحاً، ولكنّ العدل من اجتنب الكبائر، وكانت محاسنه أكثر من مساويه»[(١)].

واتە: ئەگەر (عدالة) کامڵی و ڕاست و دروستی دینی کەسێك بێت کە تاوانی نەبێت، ئەوا (عادل)مان دەست ناکەوێت، وە گەر هەموو تاوانبارێکیش (عادل) بێت، ئەوا تاوانبار نامێنێت، بەڵام دادپەروەری دینی ئەوەیە تاوانی گەورەی نەبێت و چاکەکانی زیاتر بێت لە خراپەکانی.

وە خوێندنەوەی کەسانێکی سادەیشیان بۆ ناکرێت کە قابیلی هەموو هەڵە و ناتەواوییەکی دینی و دونیایی بن و شوێنی هیچ جۆرە متمانە و جێبەجێکردنێکی دین و گەیاندنی نەبن، ئەمانە نە فریشتەن وە نە ئادەمیزادە تاوانبارەکانن، بەڵکوو ئەولیا و ساڵح و خواناسە پاکەکانن و (پلە یەك)ن لەدوای پێغەمبەرانەوە عَلَيْهِمُ السَّلَامُ، وەکوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ [النساء: ٦٩].

ئەمە لە ئاستی تێڕوانین و هەڵوێست لە بەرامبەریان، وە لە ئاستی گواستنەوە و گەیاندنی دیندا ئەمەش بۆخۆی بەرهەمی ئەو پلەوپایەیەیە کە دەبێت هەر ڕیوایەت و نەقڵ و باسێکی دینی و یاساکانی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەبێت لێیان وەربگیرێت، بەبێ هیچ بەدواداچوونێك و پشکنینێك لەسەر کەسایەتییان لە ڕووی ڕەخنە و سارێژکردن (الجرح والتعديل)، کە بۆخۆی ئەمانە بۆ کەسانی دوای هاوەڵان بەکاردەهێنرێت، واتە گەر یەکێك لەوانەی هاوەڵانیان بینیوە (التابعي) وتی: یەکێك لە هاوەڵان دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو، ئەوا لێی وەردەگیرێت بەبێ ئەوەی بەدواداچوون بکرێت لەسەر ئەو هاوەڵە کە ناوی چییە، وە ئایا تاوانی هەیە یا نیەتی، وە ئایا لەبەری کردووە یا نووسیویەتییەوە، یاخود شایەتی کەسانی لەسەرە کە کەسێکە شایستەی وەرگرتنە یان نا، ئەمانەی هیچی بۆ ناکرێت و لە ئاستیدا ناخوێنرێتەوە، ئەمە لە ڕووی سەنەدەوە

(١) "الروض الباسم في الذب عن سنة أبي القاسم" لابن الوزير (١/ ٥٥).

(السند)، بەڵام لە ڕووی دەقەوە (متن) ئەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، بەوەی کە دەبێت: (أَنْ لَا يَكُوْنُ شَاذّاً وَلَا مُعَلَّلاً)[١].

واتە: نابێت دەقی فەرموودەکە پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و فەرموودە ناودارەکان و بنەماکان و جێگیرە دینییەکان (الثوابت) بێت.

گەر ئەمانەی تێدا بوو ئەوا لە کارپێکردن بەو فەرموودەیە دەوەستێت بە هۆکاری ئەم ڕووانەوە، بەڵام گەر سەنەدەکە تەواو بوو تا گەیشتە ئاستی هاوەڵان (صحابة)، ئەوا ناوی (صحابة)کە ببێت و نەبێت و نەناسرێت بە مەرجێك (صحابة)یەك یا (تابعي)یەك بڵێت لە یەکێك لە هاوەڵانەوە دەگێڕدرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێت، بەبێ ئەوەی ناوی ببات و بناسرێت، ئەوا (سند)ەکەی لە پلەی (صحیح) دانابەزێت، ئەمە لە زانستی فەرموودەناسیدا (علوم الحديث) پێی دەوترێت: (جهالة الصحابي لا تضر)[٢].

واتە: نەناسراوی هاوەڵان هیچ زیانێکی نییە، (لِأَنَّ أَكْثَرَ رِوَايَاتِهِمْ، عَنِ الصَّحَابَةِ)[٣].

لەبەرئەوەی گومان نابرێت (تابعي) لە تابعییەوە بیگێڕێتەوە، گەر وابێت دیاری دەکات، بەڵکوو هەمووی لە هاوەڵانەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام کەسە تابعییەکە هەموو یاساکانی (علوم الحديث) دەیگرێتەوە، وەکوو هاوەڵان ئاستی ناخوێنرێتەوە.

یاخود (صحابة)یەك لە (صحابة)یەکی ترەوە دەیگێڕێتەوە و ناوی دیاری ناکات، ئەم دوو جۆرە وەرگیراوە.

قَالَ (ابن حجر) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وقد اتفق المحدثون على أن مرسل الصحابي في حكم الموصول»[٤].

---

(١) "الاقتراح في بيان الاصطلاح" لابن دقيق العيد ص٥، و "النكت على كتاب ابن الصلاح" لابن حجر العسقلاني (١/ ٢٣٥)، و "شرح المنظومة البيقونية في مصطلح الحديث" للعثيمين ص٢٨، و "شرح الموقظة للذهبي" لأبو المنذر المنياوي ص١٠٥.

(٢) "التوضيح الأبهر لتذكرة ابن الملقن في علم الأثر" للسخاوي ص٤٠، و "اختصار علوم الحديث" لابن كثير ص٩٩، و "الكفاية" للخطيب البغدادي ص٩٣، و "مصطلح الحديث" للعثيمين ص٣٣، و "شرح الورقات" لمحمد حسن الددو (٤/ ٣٨).

(٣) "التوضيح الأبهر لتذكرة ابن الملقن في علم الأثر" للسخاوي ص٤٠، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٢٣٤).

(٤) "هدي الساري" لابن حجر ص٣٥٠.

واتە: (ابن حجر) ﷺ دەڵێت: کۆدەنگی زانایانی فەرمووده لەسەر ئەوەیە کە گەیەندراوەکان بە هاوەڵان، حوکمی گەیەندراوی و نەپچڕاوی دەدرێت بەسەریاندا.

وەکوو (الْأَثْرَمْ) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: بە ئیمام (أحمد بن حنبل)م ﷺ وت: «إِذَا قَالَ رَجُلٌ مِنَ التَّابِعِينَ: حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يُسَمِّهِ، فَالْحَدِيثُ صَحِيحٌ؟ قَالَ: نَعَمْ»[١].

واتە: گەر (تابعي)یەك وتی: یەکێك لە (صحابة)وە بۆی گێڕامەوە پێغەمبەر ﷺ وای فەرموو، ئەو فەرموودەیە بە (صحیح) هەژمار دەکرێت؟ وتی: بەڵێ، (بەڵام لەگەڵ ڕەچاوکردنی پلە و کەسایەتی تابعییەکە).

وَرَوَى الْبُخَارِيُّ، عَنِ الْحُمَيْدِيِّ، قَالَ: «إِذَا صَحَّ الْإِسْنَادُ، عَنِ الثِّقَاتِ، إِلَى رَجُلٍ مِنَ الصَّحَابَةِ، فَهُوَ حُجَّةٌ كَمَرَاسِيلِ الصَّحَابَةِ، وَإِنْ لَمْ يُسَمَّ ذَلِكَ الرَّجُلُ»[٢].

واتە: ئیمامی (بوخاری) لە مامۆستاکەیەوە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: گەر ڕیوایەتێك سەنەدەکەی (صحیح) بوو تا (صحابة)، وە گەر ناوی (صحابة)کەش دیاری نەبوو، یان ناوی نەبرد، ئەوا فەرموودەکە بەڵگەیە و (صحیح)ە، بە مەرجی سەلامەتی دەقەکەی.

ئائەمە کۆڕای زانایانی فەرموودەیە، کە هاوەڵان (علوم الحدیث)یان بەسەردا جێبەجێ ناکرێت، وە ئەمە بەرنامە و کار و ڕێڕەوی ئەهلی سوننەیە بەرامبەر (تعدیل الصحابة) ناسینی هاوەڵان بەو پلەبەرزییە، بە پێچەوانەی بەرنامەی فیرەقە گومڕا و بیدعەکارەکانەوە لە خەوارجەکان و ڕافیزە و موعتەزیلەکان، کە هەموویان کۆن لەسەر قسەوتن و حوکمدان بە (کفر وفسق ومرتد)ی بەسەر هاوەڵاندا.

---

(١) "التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد" لابن عبدالبر (٤/ ٩٤)، و "نيل الأوطار" لللشوكاني (١/ ٢١٤)، و "فتح المغيث" للسخاوي (١/ ١٩١)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٢٢٢)، و "شرح ألفية السيوطي" للولوي (١/ ١٣٥).

(٢) "فتح المغيث" للسخاوي (١/ ١٩١)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٢٢٢)، و "التقييد والإيضاح" للعراقي ص٧٤، و "ذخيرة العقبى في شرح المجتبى" للولوي (٧/ ١٦).

(ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «بَلْ الطَّوَائِفُ الْمَشْهُورَةُ بِالْبِدْعَةِ كَالْخَوَارِجِ وَالرَّوَافِضِ ... بَلْ هَؤُلَاءِ يُكَفِّرُونَ جُمْهُورَ السَّلَفِ. فَالرَّافِضَةُ تَطْعَنُ فِي أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعَامَّةِ السَّابِقِينَ الْأَوَّلِينَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ ... وَكَذَلِكَ الْخَوَارِجُ قَدْ كَفَّرُوا عُثْمَانَ وَعَلِيًّا وَجُمْهُورَ الْمُسْلِمِينَ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ»[١].

واتە: فیرەقە ناودارەکان بە بیدعەکاری، وەکوو خەوارج و ڕافیزەکان، هەموویان هەموو صەحابە کافر دەکەن، بەتایبەت ڕافیزەکان قسە بە (ئەبو بەکر و عومەر) ﭭ و هەموو پێشووە ساڵحەکانی کۆچەری و مەدینەییەکان دەڵێن، وە هەروەها خەوارج (عوسمان و عەلی) ﭭ کافر دەکەن و قسە بە کۆی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان دەڵێن.

بەتایبەت لە هاوەڵاندا بەشی زۆری قسەپێوتن دەکەوێتە سەر شانی خەلیفە ڕاشیدەکان، (ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ الْأَرْبَعَةُ اُبْتُلُوا بِمُعَادَاةِ بَعْضِ الْمُنْتَسِبِينَ إلَى الْإِسْلَامِ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ وَلَعْنِهِمْ وَبُغْضِهِمْ وَتَكْفِيرِهِمْ فَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ أَبْغَضَتْهُمَا الرَّافِضَةُ ... وَأَمَّا (عُثْمَانُ فَأَبْغَضَهُ أَوْ سَبَّهُ أَوْ كَفَّرَهُ أَيْضًا مَعَ الرَّافِضَةِ طَائِفَةٌ مِنْ الشِّيعَةِ الزَّيْدِيَّةِ وَالْخَوَارِجِ ... فَالْخَوَارِجُ تُكَفِّرُ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا وَسَائِرَ أَهْلِ الْجَمَاعَةِ»[٢].

واتە: چوار خەلیفەی ڕاشیدینەکان زیاتر گیرۆدەی قسەپێوتن و دژایەتیکردنی لایەنگرانی ئەم دینە بوون، بە ڕقلێبوون و کافرکردن، وەکوو ڕافیزەکان ڕقیان لە (ئەبو بەکر و عومەر) بووە، خەوارجەکانیش (عوسمان و عەلی) کافر دەکەن لەگەڵ سەرتاپا لایەنگران و هاوەڵانیان.

وە عەقلانییەکانیش وەکوو (ابن تيمية) ﵀ دەڵێت: «وَإِنَّمَا يُفَسِّقُ الصَّحَابَةَ بَعْضُ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ مِنْ الْمُعْتَزِلَةِ وَنَحْوِهِمْ»[٣].

واتە: هەندێك لە ئەهلی هەوا و ئارەززوپەرستەکانی موعتەزیلە و هاوشێوەکانیان صەحابە فاسق دەکەن، لەژێر ناونیشانی «مَنْزِلَةً بَيْنَ مَنْزِلَتَيْنِ»[٤].

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ١٥٣).
(٢) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٤٣٥، ٤٣٦).
(٣) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٢٨/ ٥١٤).
(٤) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٧/ ٤٨٤).

بەڵام ئەهلی سوننە وەکوو (ابن القيم) ﷀ دەڵێت: «أَنَّ أَهْلَ السُّنَّةِ يَعْرِفُونَ الْحَقَّ وَيَرْحَمُونَ الْخَلْقَ فَلَهُمْ نَصِيبٌ وَافِرٌ مِنَ الْعِلْمِ وَالرَّحْمَةِ»(١).

واتە: ئەهلی سوننە ئاشنان بەسەر حەقدا، وە بەبەزەیین بەسەر خەڵکدا، بەشی گەورەیان هەیە لە پێکاندنی حەق و زانست و بەزەیی و سۆزدا بە موسوڵمانان.

بەڵام بیدعەکاران وەکوو (ابن تيمية) ﷀ دەڵێت: «وأمّا أهل البدع: فهم أهل أهواء وشبهات، يتّبعون أهواءهم فيما يُحبّونه ويُبغضونه، ويحكمون بالظنّ والشبه؛ ... فكلّ فريقٍ منهم قد أصّل لنفسه أصلَ دينٍ صنعه؛ إمّا برأيه وقياسه ... وإمّا بذوقه وهواه ... وإمّا بما يتأوّله من القرآن، ... وإمّا بما يدّعيه في الحديث والسنّة ويكون كذباً وضعيفاً»(٢).

واتە: هەموو بیدعەکاران لەخۆگر و خاوەن هەوا و گومانەکانن، شوێنکەوتەی حەزەکانیانن لەوانەی پێیان خۆشە یاخود نا، وە حوکمەکانیان بە گومانەکان و لێکچووەکانە، هەموو تاقمێك بنەمایەکی بۆ خۆی داناوە لە دیندا و دروستی کردووە، یا بە ڕاوبۆچوون و پێوانەکان، یاخود بە حەز و ئارەزووەکانی، یاخود بە مانا بۆدۆزینەوەیەك لە تەفسیری قورئاندا بە ترازاندنی ماناکان لە شوێنی خۆیدا، یاخود بە ڕێگەی بەناو فەرمودە، کە هەمووی لە کۆتاییدا درۆ و هەڵبەسراو و کارپێنەکراوە.

ئێستاش بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی دادپەروەری هاوەڵان لەوەی کە شوێنی متمانە و بەکامڵ سەیرکردنن لە ڕووی دونیایی و وەرگرتنی دینییەوە، کە ئەمە بەرنامەی ئەهلی سوونەتە، چەند وتە و شیکردنەوەیەکی زانایان دەخەینە ڕوو:

١. قَالَ (الْخَطِيْب الْبَغْدَادي) ﷀ: «وَجَمِيعُ ذَلِكَ يَقْتَضِي طَهَارَةَ الصَّحَابَةِ، وَالْقَطْعَ عَلَى تَعْدِيلِهِمْ وَنَزَاهَتِهِمْ، فَلَا يَحْتَاجُ أَحَدٌ مِنْهُمْ مَعَ تَعْدِيلِ اللهِ تَعَالَى لَهُمُ الْمُطَّلِعِ عَلَى بَوَاطِنِهِمْ إِلَى تَعْدِيلِ أَحَدٍ مِنَ الْخَلْقِ لَهُمْ، ... الْقَطْعَ عَلَى عَدَالَتِهِمْ وَالِاعْتِقَادَ لِنَزَاهَتِهِمْ، وَأَنَّهُمْ أَفْضَلُ مِنْ جَمِيعِ الْمُعَدَّلِينَ وَالْـمُزَكَّيْنَ الَّذِينَ يَـجِيؤُنَ مِنْ بَعْدِهِمْ أَبَدَ الْآبِدِينَ. هَذَا مَذْهَبُ كَافَّةِ الْعُلَمَاءِ وَمَنْ يُعْتَدُّ بِقَوْلِهِ مِنَ

(١) "مختصر الصواعق المرسلة" لابن القيم ص٦٠٤، اختصره ابن الموصلي.

(٢) "النبوات" لابن تيمية (١/ ٤٢٠، ٤٢١).

الْفُقَهَاءِ»[١].

واتە: هەموو ئەو دەقانە ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵان پاك بوون و یەکلا بووەتەوە دادپەروەرییان و بێگەردییان، کەسێك بۆی نییە لەگەڵ تەزکییە و وەسفی خوای پەروەردگاردا بۆیان بەدواداچوون بکات لەسەریان، یەکلابوونەوەی کامڵییان و باوەڕ بە پاکییان و بەچاکزانینترینی کەسانێك زۆر لەوانەی کە تەزکییە و ڕیزبەندی چاکی بۆ خەڵکان دەکەن لە زانایانی دوای ئەوان باشتر و لەپێشترن هەتا هەتایە، ئەمە بۆچوونی هەموو زانایانە و لەوانەی لە ڕیزی فەقیهەکاندا دادەنرێت.

٢. قَالَ (ابْن الصَّلاَح) رَحِمَهُ اللَّهُ: «لِلصَّحَابَةِ بِأَسْرِهِمْ خَصِيصَةٌ، وَهِيَ أَنَّهُ لَا يُسْأَلُ عَنْ عَدَالَةِ أَحَدٍ مِنْهُمْ، بَلْ ذَلِكَ أَمْرٌ مَفْرُوغٌ مِنْهُ، لِكَوْنِهِمْ عَلَى الْإِطْلَاقِ مُعَدَّلِينَ بِنُصُوصِ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَإِجْمَاعِ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ فِي الْإِجْمَاعِ مِنَ الْأُمَّةِ»[٢].

واتە: هاوەڵان بە گشتی تایبەتمەندییەکیان هەیە، ئەویش لێنەپرسینەوەی ڕاست و دروستی دینییانە لە هەریەکێکیان، ئەم کارە بۆخۆی لێبووەتەوە لەسەر دادپەروەرییان بە دەقەکانی قورئان و فەرموودە و کۆدەنگی زانایان، ئەوانەی لە ڕیزی زانایان کۆدەنگییان کاری پێ دەکرێت.

٣. قَالَ (الْنَوَوِيُّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَلِهَذَا اتَّفَقَ أَهْلُ الْحَقِّ وَمَنْ يُعْتَدُّ بِهِ فِي الْإِجْمَاعِ عَلَى قَبُولِ شَهَادَاتِهِمْ وَرِوَايَاتِهِمْ وَكَمَالِ عَدَالَتِهِمْ»[٣].

وَقَالَ: «الصَّحَابَةُ كُلُّهُمْ عُدُولٌ، مَنْ لَابَسَ الْفِتَنَ وَغَيْرُهُمْ بِإِجْمَاعِ مَنْ يُعْتَدُّ بِهِ»[٤].

واتە: کۆدەنگی ئەهلی حەق و ئەوانەی ڕایان لە کۆدەنگی زانایاندا هەژمار دەکرێت؛ لەسەر ئەوەیە کە شایەتی و گێڕانەوەی فەرموودەکان و تەواوی کامڵی دینی هاوەڵان شوێنی کۆدەنگی زانایانە، ئەوانەی بەر کێشە و دووبەرەکایەتییەکان کەوتوون و ئەوانەی نەکەوتوون.

---

(١) "الكفاية في علم الرواية" للخطيب البغدادي ص٤٨.

(٢) "مقدمة ابن الصلاح" ص٢٩٤.

(٣) "شرح النووي على مسلم" (١٥/ ١٤٩).

(٤) "التقريب والتيسير" للنووي ص٩٢.

**٤. قَالَ (ابْنُ حَجَر) رَحِمَهُ اللهُ: «اتفق أهل السنّة على أنّ الجميع عدول، ولم يخالف في ذلك إلا شذوذ من المبتدعة»[(١)].**

**واتە: هەموو ئەهلی سوننە کۆدەنگن لەسەر دادوەری هاوەڵان، کەسێك نکوولّی لەمە ناکات مەگەر بیدعەکارانی نامۆ نەبێت.**

**٥. قَالَ (الْسَّخَاوِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «وهم رضي الله عنهم باتفاق أهل السنة عدول كلهم مطلقاً كبيرهم وصغيرهم لابس الفتنة أم لا وجوباً لحسن الظن»[(٢)].**

**واتە: هاوەڵان رضي الله عنهم دادپەروەرن بە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت بەگشتی گەورەیان و بچووکیان و ئەوەی تووشی کێشەکان بووبێت یان نا، ئەمە واجبە لەسەر موسوڵمانان، لەبەر پێویستی گومانی باش پێیان.**

**٦. قَالَ (الْذَّهَبِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «فَأَما الصَّحَابَة رَضِي الله عَنْهُم فبساطهم مطوي وَإِن جرى مَا جرى وَإِن غلطوا كَمَا غلط غَيرهم من الثِّقَات فَمَا يطاد يسلم أحد من الغلط لكنه غلط نَادِر لَا يضر أبدا إِذْ على عدالتهم وَقبُول مَا نقلوه الْعَمَل وَبِه ندين الله تَعَالَى»[(٣)].**

**واتە: هاوەڵان رضي الله عنهم کاریان پێچراوەتەوە، گەر هەرچی بووبێت، وە گەر هەڵەکاریش بێت، وەکوو ناودارەکان هەڵەیان کردبێت، کێ هەیە سەلامەت بێت لە هەڵە؟ دادپەروەری هاوەڵان و وەرگرتنی گێڕانەوەکانیان و کارپێکردنی، بەرنامەی دینداریمانە.**

**٧. قَالَ (الْشِّنْقِيْطِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «قال ابن قدامة رَحِمَهُ اللهُ: والذي عليه سلف الأمة وجمهور الخلف أن الصحابة رضي الله عنهم معلومة عدالتهم بتعديل الله تعالى وثنائه عليهم ... وعلى هذا فجهالة الصحابي لا تضر لأنهم كلهم عدول»[(٤)].**

**واتە: ئیمامی (الـشنـقيطي) رَحِمَهُ اللهُ لەسەر قسەی (ابن قدامة) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: ئەوەی ڕای زانایانی**

---

(١) "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (١/ ١٦٢).

(٢) "فتح المغيث" للسخاوي (٣/ ٨).

(٣) "الرواة الثقات" للذهبي ص٢٤.

(٤) "مذكرة في أصول الفقه" للشنقيطي (١/ ١٤٩)، و "روضة الناظر" لابن قدامة المقدسي (١/ ٣٤٥).

پێشووی ئەم ئوممەتەی لەسەرە و هەموو زانایانی ئەم دواییە، ئەوەیە کە هاوەڵان ئاشکرایە ڕاستگۆیی و دادپەروەرییان بە وەسف و تەزکییەی خوایی، لەسەر ئەمە نەناسراوی (صحابة) لە گێڕانەوەی فەرموودەدا هیچ زیانێکی نییە، لەبەرئەوەی هەموویان دادپەروەرن.

**٨.** قَالَ (الْشَّوْكَانِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «إِذَا تَقَرَّرَ لَكَ عَدَالَةُ جَمِيعِ مَنْ ثَبَتَتْ لَهُ الصُّحْبَةُ، عَلِمْتَ أَنَّهُ إِذَا قَالَ الرَّاوِي عَنْ رَجُلٍ مِنَ الصَّحَابَةِ، وَلَمْ يُسَمِّهِ كَانَ ذَلِكَ حُجَّةً وَلَا يَضُرّ الْجَهَالَة لِثُبُوْتِ عَدَالَتِهِمْ عَلَى الْعُمُوْمِ»[١].

واتە: کاتێك یەکلابوویتەوە لەسەر ئەوەی کەوا هاوەڵان دادپەروەرن، کەواتە هەرکاتێك ڕاوییەك فەرموودەیەکی لە یەکێك لە هاوەڵانەوە گێڕایەوە و ناوی نەبرد؛ ئەوا ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە و زیانی نییە نەناسراوی هاوەڵان، لەبەر دڵنیابوونی دادپەروەرییان.

وە دەڵێت: «عَدَالَةِ الرَّاوِي، إِنَّمَا هُوَ فِي غَيْرِ الصَّحَابَةِ، فَأَمَّا فِيهِمْ فَلَا؛ لِأَنَّ الْأَصْلَ فِيهِمُ الْعَدَالَةُ فَتُقْبَلُ رِوَايَتُهُمْ مِنْ غَيْرِ بَحْثٍ عَنْ أَحْوَالِهِمْ، حَكَاهُ ابْنُ الْحَاجِبِ عَنِ الْأَكْثَرِينَ، قَالَ الْقَاضِي: هُوَ قَوْلُ السَّلَفِ وَجُمْهُورِ الْخَلَفِ، وَقَالَ الْجُوَيْنِيُّ بِالْإِجْمَاعِ»[٢].

واتە: دادپەروەری هاوەڵان جێگیرە، بنەما لەواندا وەرگرتنی ڕیوایەتەکانە، بەبێ گەڕان بەدوایاندا، ئەمە ڕای پێشووان و ئەم دواییەی زانایانە، وە ئیمامی (الجويني) دەڵێت: کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

**٩.** قَالَ الحافظ (الْعَلاَئِي) رَحِمَهُ اللهُ: «والحق الذي ذهب إليه الأكثرون أن فضيلة صحبة النبي صلى الله عليه وسلم والفوز برؤيته لا يعدل بعمل. وأن من منحه الله تعالى ذلك فهو أفضل ممن جاء بعده على الإطلاق لوجوه:

أحدها: مشاهدة النبي صلى الله عليه وسلم.

وثانيها: فضيلة السبق إلى الإسلام.

---

(١) "إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ١٨٨).

(٢) "إرشاد الفحول إلي تحقيق الحق من علم الأصول" للشوكاني (١/ ١٨٥).

وثالثها: فضيلة الذب عن حضرته صلى الله عليه وسلم.

ورابعها: فضيلة الهجرة معه أو إليه أو النصرة له.

وخامسها: ضبطهم الشريعة، وحفظهم عن رسول الله صلى الله عليه وسلم.

وسادسها: تبليغهم إياه إلى من بعدهم.

وسابعها: السبق بالنفقة في أول الإسلام.

وثامنها: إن كل فضل وخير وعلم وجهاد ومعروف عُمل في هذه الشريعة إلى يوم القيامة، فحظهم منه أجل ونوالهم منه أجزل. لأنهم سنوا سنن الخير وفتحوا أبوابه. ونقلوا معالم الدين وتفاصيل الشريعة إلى من بعدهم»(١).

واتە: ئەو ڕاستییەی کە زۆرینەی زانایان بۆی چوون، ئەوەیە کە پلەوپایەی هاوەڵییەتی پێغەمبەر ﷺ و گەیشتن بە بینینی هیچ کارێك نایگاتێ، ئەوەی خوای گەورە پێی ببەخشێت زۆر پلەدارترە تا کەسانێك کە لەدوای ئەوەوە دێن، لەبەر:

١. **بینینی پێغەمبەر ﷺ.**
٢. **پلەداری پێشەنگییەتی.**
٣. **پاراستنی پێغەمبەر ﷺ و پشتیوانیکردنی.**
٤. **پلەی کۆچکردن لەگەڵیدا و سەرخستنی.**
٥. **وەرگرتنی یاساکانی ئیسلام و گەیاندنی لە پێغەمبەرەوە ﷺ.**
٦. **هەڵسان بە گەیاندنی بۆ دوای خۆیان.**
٧. **پێشینییەتی لە ماڵبەخشین لە سەرەتای ئیسلامدا.**
٨. **هەموو کار و خێر و عیبادەتێك و زانستێك پاداشتی ئەوانی تێدایە تا ڕۆژی کۆتایی.**

**١٠.** قَالَ (الآمدي) رَحِمَهُ اللهُ: «**اتَّفَقَ الجُمْهُورُ مِنَ الأَئِمَّةِ عَلَى عَدَالَةِ الصَّحَابَةِ**»(٢).

واتە: زانایان و پێشەوایان کۆدەنگن لەسەر دادوەری هاوەڵان.

---

(١) "تحقيق منيف الرتبة لمن ثبت له شريف الصحبة" للحافظ العلائي ص٧٥.

(٢) "الإحكام في أصول الأحكام" للآمدي (٢/ ٩٠).

**١١.** قَالَ (الْشَاطِبِي) رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «فَإِنَّ مَنْ بَعْدَ الصَّحَابَةِ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ عَدَلُوا الصَّحَابَةَ عَلَى الْإِطْلَاقِ وَالْعُمُومِ؛ فَأَخَذُوا عَنْهُمْ رِوَايَةً وَدِرَايَةً مِنْ غَيْرِ اسْتِثْنَاءٍ وَلَا مُحَاشَاةٍ»[١].

واته: ئەوەی لەدوای هاوەڵانەوە هاتووە لە ئەهلی سوننە، هەموویان هاوەڵانیان دادپەروەر کردووە، بەگشتی هەرهەموویان هەموو ڕیوایەت و ڕێگەیەکیان لێ وەرگیراوە بەبێ هیچ لێدەرکردنێك و سڕینەوەیەك.

وە دەڵێت: «وَقَوْلِهِ: ﴿أُمَّةً وَسَطًا﴾ [البَقَرَة: ١٤٣] إِثْبَاتُ الْعَدَالَةِ مُطْلَقًا، ... أَنَّهُمُ الْمُخَاطَبُونَ عَلَى الْخُصُوصِ»[٢].

واته: ئەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُمَّةً وَسَطًا﴾ ئەمە سەلمێنەری دادپەروەری هاوەڵانە بە شێوەیەکی گشتی، لەبەرئەوەی ئەوان گوفتار لەگەڵکراون بە پلەی یەکەم.

**١٢.** قَالَ (ابْنُ حبَّان) رَحِمَهُ ٱللَّهُ: «وفي قوله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "ألا ليبلغ الشاهد منكم الغائب"، أعظم الدليل على أن الصحابة كلهم عدول ليس فيهم مجروح ولا ضعيف إذ لو كان فيهم مجروح أو ضعيف ... أو كان فيهم أحد غير عدل لاستثنى في قوله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وقال ألا ليبلغ فلان وفلان منكم الغائب ... وكفى بمن عدله رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شرفا»[٣].

واته: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (هەرکەسێك لە ئێوە بیگەیەنێت بەوەی کە لێرە نییە)؛ ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو هاوەڵان دادوەرن، کەسێکی تۆمەتبار و لاواز لە فەرموودەدا نییە، خۆ ئەگەر کەسانێکی وایان تیادا بوایە؛ ئەوا دەبوو پێغەمبەر ﷺ لێی دەربکردایە و بە فلان و فلانی بفەرمووایە ئێوە بیگەیەنن، بەسە بۆ کەسانێك کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بۆ دادوەرییان بکات.

---

(١) "الموافقات" للشاطبي (٤/ ٤٤٨).

(٢) "الموافقات" للشاطبي (٤/ ٤٤٧).

(٣) "صحيح ابن حبان" (١/ ١٦٢).

**١٢.** قَالَ (ابْنُ عَبْدالْبَرّ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**وَلَا فَرْقَ فِيهِ بَيْنَ أَنْ يُسَمِّيَ التَّابِعَ الصَّاحِبَ الَّذِي حَدَّثَهُ أَوْ لَا يُسَمِّيَهُ فِي جَوَازِ الْعَمَلِ بِحَدِيثِهِ لِأَنَّ الصَّحَابَةَ كُلُّهُمْ عُدُولٌ مَرْضِيُّونَ وَهَذَا أَمْرٌ مُجْتَمَعٌ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ**»[(١)].

**واتە: جیاوازی نییە لەنێوان ئەوەی (تابعي) ناوی (صحابة) ببات لە گێڕانەوەی فەرموودەدا یان نا، فەرموودە کاری پێ دەکرێت، لەبەرئەوەی هاوەڵان هەموویان ڕاستگۆ و دادپەروەرن و شوێنی ڕەزامەندین، ئەمە کۆدەنگی زانایانی فەرموودەی لەسەرە.**



(١) "التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد" لابن عبدالبر (٢٢/ ٤٧)، و "الاستذكار" لابن عبدالبر (٣/ ٣٠١).

# حوكمی قسەوتن بە هاوەڵان

## ( حـكـم سـب الصحابة )

هاوەڵان ﷺ سێیەم نیشانە و هێمای دینین لەدوای خوا ﷻ و پێغەمبەرەكەی ﷺ، بۆیە لە بەڵگەشدا هەر سێیەمن (القرآن والسنة والإجماع)، وە هەروەها لە تەفسیری قورئانیشدا، بۆیە قسەوتن پێیان قسەوتنە بە پێغەمبەر ﷺ، وەكوو ئیمامی (الآجري) رحمه الله دەڵێت: «وَمَنْ سَبَّهُمْ فَقَدْ سَبَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[1].

وە هیچ هۆكارێك نییە لە قسەپێوتنیان بێجگە لەوە نەبێت كە هاوەڵی پێغەمبەرن ﷺ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «احْفَظُونِي فِي أَصْحَابِي»[2].

واتە: من بپارێزن لە هاوەڵانمدا.

واتە هاوەڵان وەكوو شوورا و قەڵغانێك وان بۆ پاراستنی پێغەمبەر ﷺ، كە قسە بەوان وترا دەگاتە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەكوو لە ڕیوایەتێكی (ضعیف) دا ئاماژە بۆ ئەمە دەكات: «وَمَنْ آذَاهُمْ فَقَدْ آذَانِي، وَمَنْ آذَانِي فَقَدْ آذَى اللَّهَ»[3].

ماناكەی تەواوە لەبەرئەوەی قسەوتنەكە دەگاتە خوا ﷻ، وەكوو ئیمامی (مالك) رحمه الله دەڵێت: «إنما هؤلاء أقوام أرادوا القدح في النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم فلم يمكنهم ذلك فقد حوا

---

(١) "الشريعة" للآجري (٥/ ٢٤٩٥).

(٢) رواه النسائي في "الكبرى" (٩١٨٢)، وابن ماجه (٢٣٦٣) وصححه شعيب الأرنؤوط، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٦٤٠)، والحاكم في "المستدرك" (٣٩٠)، والطبراني في "الكبير" (٥٦٤٠)، وابن بطة في "الإبانة" (١١٦)، والأجري في "الشريعة" (٢٠٠٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١١١٦)، وفي "صحيح الجامع الصغير" (٢٠٦).

(٣) رواه الترمذي (٣٨٦٢)، وابن حبان في "صحيحه" (٧٢٥٦)، وأحمد في "المسند" (١٦٨٠٣)، وفي "فضائل الصحابة" (١)، والبيهقي في "الشعب" (١٤٢٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٩٢)، والآجري في "الشريعة" (١٤٧٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٤٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٦٠)، وضعفه الألباني في "الضعيفة" (٢٩٠١)، و "ضعيف الجامع الصغير" (١١٦٠).

في أصحابه»[(١)].

واتە: ئەوانە نەیانتوانی قسە بە پێغەمبەر ﷺ بڵێن و مەبەستیشیان ئەو بوو، بۆیە قسەیان بە هاوەڵان وت.

وە ئیمام (أحمد) رحمه الله دەڵێت: «مَا انْتَقَصَ أَحَدٌ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَّا وَلَهُ دَاخِلَةُ سُوءٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم: "خَيْرُ النَّاس قَرْنِي" »[(٢)].

واتە: کەسێك قسە بە یەکێك لە هاوەڵان ناڵێت مەگەر نیيەتێکی پیسی لە ناخدا بێت.

وە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ﴾ [الفتح: ٢٩].

واتە: بێبڕواکان دەیانبوغزێنن.

ئیمامی (مالك) رحمه الله دەڵێت: «لِأَنَّهُمْ يَغِيظُونَهُمْ، وَمَنْ غَاظَ الصَّحَابَةُ فَهُوَ كَافِرٌ لِهَذِهِ الْآيَةِ»[(٣)].

واتە: ئەوانەی کە قسە بە هاوەڵان دەڵێن ئەوە ڕق و کینەی ئەوانی لە دڵدایە، وە ئەوەیشی بەو شێوەیە بێت ئەوە بێبڕوایە، لەبەرئەوەی بێبڕواکان ڕق و کینەی هاوەڵانیان لە دڵدایە.

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «لَعَنَ اللهُ مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي»[(٤)].

وە دەفەرموێت: «مَنْ سَبَّ أَصْحَابِي فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ، وَالْمَلَائِكَةِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[(٥)].

---

(١) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٧٠.

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٤٨).

(٣) "تفسير ابن كثير" (٧/ ٣٦٢)، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض حسن الشيخ (١/ ٧٥)، و "الإصابة في الذب عن الصحابة" لدكتور مازن بن محمد بن عيسى ص١٦٤.

(٤) رواه الطبراني في "الكبير" (١٣٥٨٨)، وفي "الأوسط" (٧٠١٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٤٨)، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٥١١١).

(٥) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٨)، والطبراني في "الكبير" (١٢٧٠٩)، وفي "الدعاء" (٢١٠٨)، والآجري في "الشريعة" (١٤٧٦)، وأبو بكر بن الخلال في "السنة" (٨٣٣)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٣٤٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٦٢٨٥).

واتە: نەفرەتی خوا ﷻ لەو كەسانە بێت كە قسە بە هاوەڵانم دەڵێن، وە نەفرەتی فریشتە و هەموو خەڵكیان لێبێت.

## زانایان بۆ حوكمی قسەوتن بە صەحابە ﷺ دەڵێن:

✍ «ذَهَبَ جَمْعٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ إلى القَوْلِ بِتَكْفِيْرِ مَنْ سَبَّ الصَّحَابَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم، أو انْتَقَصَهُم وطَعَنَ فِي عَدَالَتِهِم وصَرَّحَ بِبُغْضِهِم، ... وَإِلَى هَذَا القَوْلِ ذَهَبَ بَعْضُ العُلَمَاءِ مِنَ الحَنَفِيَّةِ، والمَالِكِيَّةِ، والشَّافِعِيَّةِ، والحَنَابِلَةِ، والظَّاهِرِيَّةِ ... وَذَهَبَ فَرِيْقٌ آخَر مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ إِلَى أَنَّ سَاب الْصَّحَابَة لَا يكْفر بِسَبِهِم، بَلْ يُفَسَّقُ وَيُضَلَّلُ، وَلَا يُعَاقَبُ بِالْقَتْلِ، بَلْ يُكْتَفَى بِتَأْدِيْبِهِ، وَتَعْزِيْرِهِ ...»[(١)].

واتە: ڕای زانایان دەبن بە دوو بەشەوە:

بەشی یەكەم: بە بێبڕوای دادەنێن، ئەم ڕایە لە هەرچوار مەزهەبەكەی ئەهلی سوننەدا هەیە.

بەشی دووەم: پێی بێبڕوا نابێت، بەڵكوو تاوانبار و گومڕایە و دەبێت تەمێ بكرێت تا دەگەڕێتەوە، بەڵام ناكوژرێ پێی.

بەڵام پێدەچێت ئەم جیاوازییانە بگەڕێتەوە بۆ كەسایەتی و كەم و زۆری ئەو هاوەڵانەی كە قسەیان پێ دەوترێت، وەكوو ناوداری و ئیسلام پێناسینی كەسەكان، وەكوو چوار خەلیفەی ڕاشیدین و ئەوانەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە.

بۆیە (الملا علي القارئ) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وإذا كان لكل فريق أدلته على ما ذهب إليه؛ فالقول الذى تطمئن إليه النفس؛ ويرتاح إليه القلب، أن من أبغضهم جميعاً أو أكثرهم أو سبهم سباً يقدح فى دينهم، وعدالتهم، فإنه يكفر بهذا، لأن هذا يؤدى إلى إبطال الشريعة بكاملها لأنهم هم الناقلون لها، أما من سب أحداً من الصحابة فهو فاسق، ومبتدع بالإجماع، إلا إذا اعتقد إنه مباح

(١) "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض حسن الشيخ (٢/ ٨٥٦)، و "عدالة الصحابة" للشربيني ص١٢٠، و "تسديد الإصابة فيما شجر بين الصحابة" لأبو صفوان الغامدي ص١٢٦.

أو يترتب عليه ثواب كما عليه بعض الشيعة أو اعتقد كفر الصحابة فإنه كافر بالإجماع»[(١)].

واتە: ئەگەرچی هەریەك لەو ڕایانە بەڵگەی خۆیان هەیە لەسەری، بەڵام ڕایەك دڵنیاییمانی لەسەر دروست بكات ئەوەیە: گەر هەركەسێ ڕقی لە هەموو هاوەڵان بێت بەگشتی، یان زۆرینەیان، وە قسەی زۆر برینداركاری دینییان پێ بڵێت، یان دان نەنێت بە هیچ جۆرە دادوەری و متمانەییەكیاندا، بەم كارانە پێی بێبڕوا دەبێت، لەبەر ئەوەی ئەمە هۆكارە بۆ بەتاڵكردنەوە و لەكارخستنی هەموو دین، بە هۆكاری ئەوەی ئەوان هۆكاری گەیاندنی ئەم دینەن، بەڵام گەر قسە بە یەكێك لە هاوەڵان بڵێت، ئەوە تاوانبار و بیدعەكارە بە كۆدەنگی زانایان، مەگەر باوەڕی وابێت ئەوە دروستە یاخود پاداشتی لەسەر وەردەگرێت وەكوو هەندێك لە شیعەكان، وە گەر باوەڕی بە بێبڕوایی و هەڵگەڕانەوەیان لە دین هەبێت، ئەوە بێبڕوایە بە كۆدەنگی زانایان.

وە (القاضي عياض) ﷬ دەڵێت: «وَكَذَلِكَ نقطع بتكفير كل قائل قَوْلًا يَتَوَصَّلُ بِهِ إِلَى تَضْلِيلِ الْأُمَّةِ، وَتَكْفِيرِ جَمِيعِ الصَّحَابَةِ»[(٢)].

واتە: ئەوە یەكلا دەكەینەوە لەسەر بێبڕوایی هەركەسێك كە هەموو هاوەڵان بە گومڕا بزانێت و بێبڕوایان بكات.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە قسەوتن بە هاوەڵان تاوانی گەورەیە و لە دیندانە بە ناڕاستەوخۆ و نیشانەی بێبڕوایی دڵیەتی و خاوەنەكەی لەسەر لێواری تیاچوون و دەرچوونە لە دین، لەبەرئەوەی ئەو فیرەقانەی كە قسەیان بە هاوەڵان وتووە لەسەر دەستی كەسانی بێبڕوا و داخ لەدڵی ئیسلام دروست بوون، لە (ابن سبأ)ی جوولەكە و مەجووسییەكان و خاوەن دینە ڕابوردووەكانن، یاخود گۆشكراوی دەستی فەیلەسووفە عەقلانییەكانی یۆنان و ڕۆمانییە هەسارە پەرستەكانن، یاخود كەسانی گومڕا و دوور لە شارەزایی بنەما دینییەكان و بێئاگا لە بنەمای قسەی تێڕوانینەكانن.

ئەگەرچی قسەوتن بە هەموو هاوەڵان وەك یەك نییە، لەبەر جیاوازی پلەوپایەیان، وە ئەگەرچی كەسەكان یەك حوكم نایانگرێتەوە لەبەر ئاستی زانست و ئاگایی دینییان و پاساوی زۆریان ... بەڵام ئەم كارە كارێكی ترسناك و هێڵی سوورە لە ئیسلامدا، بۆ زیاتری ئەم بابەتە، بۆچوون و

(١) "عدالة الصحابة" للشربيني ص١٢٠، و "مجموعة رسائل ابن عابدين كتاب تنبيه الولاة والحكام" (١/ ٣٦٧).

(٢) "الشفا بتعريف حقوق المصطفى" للقاضي عياض (٢/ ٦١٠).

شیکردنەوەی زانایان لەم بارەیەوە دەخەینە ڕوو:

١. قَالَ الإِمَام (الْذَّهَبِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «فَمن طعن فيهم أَو سبهم فقد خرج من الدين ومرق من مِلَّة الْمُسلمين لِأَن الطعْن لَا يكون إِلَّا عَن اعْتِقَاد مساويهم وإضمار الحقد فيهم وإنكار مَا ذكره الله تَعَالَى فِي كِتَابه من ثنائه عَلَيْهِم وَمَا لرَسُول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم من ثنائه عَلَيْهِم وفضائلهم ومناقبهم وحبهم وَلِأَنَّهُم أرْضى الْوَسَائِل من الْمَأْثُور والوسائط من الْمَنْقُول والطعن فِي الوسائط طعن فِي الأَصْل والازدراء بالناقل ازدراء بالمنقول هَذَا ظَاهر لمن تدبره وَسلم من النِّفَاق وَمن الزندقة والإلحاد فِي عقيدته»[1].

واته: هەرکەسێك قسەیان پێ بڵێت و تانەیان لێ بدات لە دین دەردەچێت و پەیوەندی بە موسوڵمانانەوە نامێنێت، لەبەرئەوەی ئەو کارە بە بنەمایەکی بیروباوەڕی یاخود قینێکی شاراوە لێیان یان ڕەددانەوەی وەسفەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە باسی پلەوپایە و بەڕێزییەکانیان و خۆشەویستییان مەبەستە، لەبەرئەوەی هاوەڵان باشترین هۆکاری گەیاندنی فەرموودە و نەقڵکردنی قورئانن، قسەوتن بە هۆکارەکان قسەوتنە بە بنەماکان، تانەدان لە نەقڵکاران تانەیە بۆ بابەتی نەقڵەکە، ئەمە ئاشکرایە بۆ کەسێك تێبفکرێت و سەلامەت بێت لە دووڕوویی و بێبڕوایی لە بیروباوەڕدا.

٢. قَالَ (ابن حزم) رَحِمَهُ اللهُ: «حكمه أن يعلم ويعرف فإن تمادى فهو فاسق وإن عاند في ذلك الله تعالى أو رسوله صلى الله عليه وسلم فهو كافر مشرك»[2].

واته: حوکمی ئەو کەسەی کە قسە بە هاوەڵان دەڵێت ئەوەیە کە فێر بکرێت و پێبناسرێت، گەر بەردەوام بوو لەسەری ئەوە تاوانبارە، وە گەر نکوڵی کرد و سوور بوو لەسەری ئەوە بێبڕوایە.

٣. قَالَ (القرطبي) رَحِمَهُ اللهُ: «فَمَنْ نَقَّصَ وَاحِدًا مِنْهُمْ أَوْ طَعَنَ عَلَيْهِ فِي رِوَايَتِهِ فَقَدْ رَدَّ عَلَى اللهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَأَبْطَلَ شَرَائِعَ الْمُسْلِمِينَ»[3].

---

(١) "الكبائر" للذهبي ص٢٣٨.
(٢) "الإحكام في أصول الأحكام" لابن حزم (١/ ١٤٩).
(٣) "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (١٦/ ٢٩٧) في تفسير سورة [الفَتْح : آيَة : ٢٩].

واتە: ئەوەی ناتەواوی بداتە پاڵ یەکێکیان، یاخود تانە و ڕەخنە لە ڕیوایەتە دینییەکانی بگرێت، ئەوە ڕەددی فەرموودەکانی خوای داوەتەوە و شەریعەتی ئیسلامی بەتاڵ کردووەتەوە.

**٤**. قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**فمن سبهم فقد زاد على بغضهم فيجب أن يكون منافقا لا يؤمن بالله ولا باليوم الآخر**»(١).

واتە: ئەوەی قسەیان پێ بڵێت ئەوە نیشانەی زیاد ڕقلێبوونیانە، ئەمە بە دڵنیاییەوە کەسێکی دووڕووە و باوەڕی بە خوا و ڕۆژی کۆتایی نییە.

**٥**. قَالَ (يَحْيَى بْن مَعِين) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**كُلُّ مَنْ شَتَمَ عُثْمَانَ أَوْ طَلْحَةَ أَوْ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَجَّالٌ لَا يُكْتَبُ عَنْهُ وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِيْنَ**»(٢).

واتە: هەرکەسێك قسە بە (عوسمان و تەڵحە) و یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بڵێت، ئەوە دەجالە، هیچ زانستێکی لێ وەرناگیرێت، نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێبێت.

**٦**. قَالَ (إِسْحَاق بْن رَاهَوَيْه) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**مَنْ شَتَمَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَاقِب وَيُحْبَس**»(٣).

واتە: ئەوەی قسە بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بڵێت، سزا دەدرێت و بەند دەکرێت.

**٧**. قَالَ الإِمَام (مَالِك وَسُحْنُون) رحمهما الله: «**مَنْ شَتَمَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى الله عليه وسلم أَبَا بَكْرَ، أَوْ عُمَرَ، أَوْ عُثْمَانَ، أَوْ مُعَاوِيَةَ، أَوْ عَمْرو بْنَ الْعَاصِ فَإِنْ قَالَ: كَانُوا عَلَى ضَلَالٍ وَكُفْرٍ قُتِلَ، وَإِنْ شَتَمَهُمْ بِغَيْرِ هَذَا مِنْ مُشَاتَمَةِ النَّاسِ نُكِّلَ نَكَالًا شَدِيدًا**»(٤).

واتە: ئەوەی قسە بە یەکێك لە هاوەڵان بڵێت، وەکوو (خولەفای ڕاشیدین و مەعاویە و عەمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، وە ئەگەر بڵێت: لەسەر گومڕایی و بێبڕوایی بوون، ئەوا دەکوژرێت، وە گەر قسەپێوتنەکە بەشێوەی ئەوە بێت کە لەنێوان خەڵکیدایە، ئەوا بە شێوەیەکی باش تەمێ دەکرێت.

---

(١) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٨١.

(٢) "تهذيب التهذيب" لابن حجر العسقلاني (١/ ٥٠٩)، وسبق تخريجه ص٧٦.

(٣) "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٦٨، و "الرد القويم على المجرم الأثيم" للتويجري ص٣٢.

(٤) "الشفا بتعريف حقوق المصطفى" للقاضي عياض (٢/ ٦٥٣).

وَرُوِيَ عَنْ مَالِكٍ: «مَنْ سَبَّ أَبَا بَكْرٍ جُلِدَ، وَمَنْ سَبَّ عَائِشَةَ قُتِلَ ... قِيلَ لَهُ: لِمَ؟ قَالَ: مَنْ رَمَاهَا فَقَدْ خَالَفَ الْقُرْآنَ، وَقَالَ ابْنُ شَعْبَانَ عَنْهُ: لِأَنَّ اللهَ يَقُولُ ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١٧﴾ [النور: ١٧]. فَمَنْ عَادَ لِمِثْلِهِ فَقَدْ كَفَرَ»(١).

**واتە: ئیمامی (مالك) رحمه الله دەڵێت: ئەوەی قسە بە (ئەبو بەکر) رضي الله عنه بلێت جەڵدی تەمێکردنی لێ دەدرێت، وە ئەوەی قسە بە (عائیشە) رضي الله عنها بلێت، دەکوژرێت، وتیان بۆ؟ وتی: لەبەرئەوەی ڕەددی قورئان دەداتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ئامۆژگاریتان دەکەم نەگەڕێنەوە سەر هاوشێوەی ئەمە هەتاهەتایە گەر ئێوە ئیماندارن، ئەوەی بگەڕێتەوە سەر هەمان شێوە ئەوە بێبڕوایە.**

قَالَ (ابْن القَيِّمْ) رحمه الله: «**وَاتَّفَقَتِ الْأُمَّةُ عَلَى كُفْرِ قَاذِفِهَا**»(٢).

**واتە: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە قسەوتن و تۆمەتبارکردنی دایکی ئیمانداران (عائیشە) رضي الله عنها پێی بێبڕوا دەبێت.**

**٨**. قَالَ الإِمَام (أَحْمَد بْنُ حَنْبَل) رحمه الله: «**لا يجوز لأحد أن يذكر شيئا من مساويهم ولا يطعن على أحد منهم بعيب ولا نقص فمن فعل ذلك فقد وجب على السلطان تأديبه وعقوبته ليس له أن يعفو عنه بل يعاقبه ويستتيبه فإن تاب قبل منه وإن ثبت أعاد عليه العقوبة وخلده الحبس حتى يموت أو يراجع**»(٣).

**واتە: دروست نییە بۆ کەس شتێك لە هەڵەکانیان یاخود تانەیان لێ بدات، ئەوەی ئەو کارە بکات ئەوا لەسەر دەسەڵات پێویستە کە تەمێی بکات و سزای بۆ دەرکات، وە نابێت بیبەخشێت، بەڵکوو دەبێت تەوبە و گەڕانەوەی پێ ئەنجام بدات و بەردەوام بەندی بکات و سزای بدات تا دەگەڕێتەوە.**

(١) "الشفا بتعريف حقوق المصطفى" للقاضي عياض (٢/ ٦٥٤)، و "الجامع لأحكام القرآن" للقرطبي (١٢/ ٢٠٥)، و "التحرير والتنوير" لابن عاشور (١٨/ ١٨٣).

(٢) "زاد المعاد في هدي خير العباد" لابن القيم (١/ ١٠٣).

(٣) "السنة" للإمام أحمد ص١٧، و"الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٦٨.

**٩**. قَالَ الإِمَام (الْنَوَوِيُّ) رَحِمَهُ اللهُ: «**وَاعْلَمْ أَنَّ سَبَّ الصَّحَابَةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ حَرَامٌ مِنْ فَوَاحِشِ الْمُحَرَّمَاتِ سَوَاءٌ مَنْ لَابَسَ الْفِتَنَ مِنْهُمْ وَغَيْرُهُ لِأَنَّهُمْ مُجْتَهِدُونَ ... قَالَ الْقَاضِي: وَسَبُّ أَحَدِهِمْ مِنَ الْمَعَاصِي الْكَبَائِرِ وَمَذْهَبُنَا وَمَذْهَبُ الْجُمْهُورِ أَنَّهُ يُعَزَّرُ وَلَا يُقْتَلُ**»[١].

**واتە: بزانە کە قسەوتن بە هاوەڵان حەرامە و یەکێکە لە تاوانەکان، ئیتر ئەو هاوەڵە کەوتبێتە کێشەوە یاخود نا، لەبەر ئەوەی کارەکانیان بە ئیجتیهادی دینی کردووە، ئیمام (قاضي عياض) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: قسەپێوتنی کەسێکیان لە تاوانە گەورەکانە، ڕاوبۆچوونی ئێمە و کۆی زانایان لەسەر ئەوەیە کە تەمێ بکرێت، بەڵام ناکوژرێت.**

  

(١) "شرح النووي على مسلم" (١٥/ ١٤٩).

# بەرگریکردنی هاوەڵان لە یەکتر

١. وَقَعَ بَيْنَ عبيد الله بن عمر وَبَيْنَ الْمِقْدَادَ كَلَامٌ، فَشَتَمَ عُبَيْدُ الله الْمِقْدَادَ، فَقَال عُمَرُ: «عَلَيَّ بِالحَدَّادِ أَقْطَعُ لِسَانَهُ، لَا يَجتَرِئُ أَحَدٌ بَعْدَهُ بِشَتمِ أَحدًا منْ أَصْحَابِ الْنَّبِيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسلَّم»، وَفِي رِوَايَة: فَهَمَّ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِقَطْعِ لِسَانِهِ، فَكَلَّمَهُ فِيهِ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «ذَرُونِي أَقْطَعْ لِسَانَ ابْنِي، حَتَّى لَا يَجْتَرِئَ أَحَدٌ مِنْ بَعْدِي يَسُبُّ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَدًا»[١].

**واتە: لە نێوان (عبيد الله ی کوڕی عومەر) و (میقداد)دا ﷺ کێشەیەك هەبوو، (عبيد الله) قسەی بە (میقداد) وت، کاتێك (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ ئەمەی بیست و هاوەڵان کەوتنە نێوانەوە، وتی: لێم گەڕێن با زمانی ئەو کوڕەم ببڕم، تاوەکوو کەس لەدوای ئەوەوە بوێری ئەوەی نەبێت کە قسە بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بلێت.**

٢. عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: «أَقْبَلَ سَعْدٌ مِنْ أَرْضٍ لَهُ، فَإِذَا النَّاسُ عُكُوفٌ عَلَى رَجُلٍ، فَاطَّلَعَ فَإِذَا هُوَ يَسُبُّ طَلْحَةَ وَالزُّبَيْرَ وَعَلِيًّا، فَنهَاهُ، فَكَأَنَّمَا زَادَهُ إِغْرَاءً، فَقَالَ: وَيْلَكَ مَا تُرِيدُ إِلَى أَنْ تَسُبَّ أَقْوَامًا هُمْ خَيْرٌ مِنْكَ، لَتَنْتَهِيَنَّ أَوْ لَأَدْعُوَنَّ عَلَيْكَ، فَقَالَ: هِيهِ، فَكَأَنَّمَا تُخَوِّفُنِي نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ. فَانْطَلَقَ فَدَخَلَ دَارًا، فَتَوَضَّأَ وَدَخَلَ الْمَسْجِدَ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا قَدْ سَبَّ أَقْوَامًا قَدْ سَبَقَ لَهُمْ مِنْكَ خَيْرٌ أَسْخَطَكَ سَبُّهُ إِيَّاهُمْ فَأَرِنِي الْيَوْمَ بِهِ آيَةً تَكُونُ آيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ. قَالَ: وَتَخْرُجُ بُخْتِيَّةٌ مِنْ دَارِ بَنِي فُلَانٍ نَادَّةً لَا يَرُدُّهَا شَيْءٌ، حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَيْهِ ، وَيَتَفرَّقُ النَّاسُ عَنْهُ، فَتَجْعَلُهُ بَيْنَ قَوَائِمِهَا، فَتطَؤُهُ حَتَّى طَفِئَ. قَالَ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ يَتْبَعُهُ النَّاسُ وَيَقُولُونَ: اسْتَجَابَ اللهُ لَكَ أَبَا إِسْحَاقَ، اسْتَجَابَ اللهُ لَكَ أَبَا إِسْحَاقَ»[٢].

---

(١) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٣٧٧)، و "مسند الفاروق" لابن كثير (٢/ ٥٢٤)، و "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٨٥.

(٢) "شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة" للالكائي (٢٣٦١)، و "المخلصيات" للبغدادي (١٧١٩).

واتە: (سعد بن أبي وقاص) ﷺ لە کارەکەی خۆی دەگەڕایەوە لە زەوییەکەیدا، بینی خەڵك قەرەباڵغییان کردووە لە پیاوێك، چووە پێشەوە بینی قسە بە (طلحة وزبیر وعلي بن أبي طالب) ﷺ دەڵێت، ئەویش ڕێگری لێکرد و ئاگاداری کردەوە، بەڵام ئەو زیاتر سوور بوو لەسەری، پاشان پێی وت: تۆ قسە بە کەسانێك دەڵێیت کە لە تۆ باشتر بوون، هاوار بۆ تۆ واز بێنە، گەر نا دووعات لێ دەکەم، ئەویش وتی: های! دەڵێی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران دەمترسێنێ، (سەعد)یش چووە ماڵەوە و دەستنوێژی گرت، چووە مزگەوت و دەستی هەڵبڕی و وتی: خوای پەروەردگار ئەگەر ئەو پیاوە قسەی بە کەسانێك وتووە لای تۆ بە چاك نووسراون و تووڕەی کردووی قسەکانی ئەمڕۆی، نیشانەیەکی بەسەر بێنی ببێت بە پەند بۆ ئیمانداران، دەڵێت: حوشترە مێیینەیەك لە ماڵێك هاتە دەرەوە بە یاخیبوویی، هیچ شتێك نەیدەگەڕاندەوە، ڕۆیشت تا گەیشتە سەر ئەو پیاوە، خەڵکی هەمووی ڕای دەکرد لێی، نیشتە سەر ئەو پیاوە لەژێر هەرچوار پەلیدا بوو، تا نەیکوشت وازی لێ نەهێنا، (عامر)ی کوڕی دەڵێت: بینیم خەڵك شوێن (سەعد)ی باوکم کەوتبوون دەیانوت: خوای گەورە وەڵامی دایتەوە و دووعاکەی لێ وەرگرتیت، باوکی (ئیسحاق) وەڵامت درایەوە و دووعاکەت قبووڵ بوو.

**٣.** خوای گەورە پشتیوانی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کردووە، لە ڕووداوێکی تردا: عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، قَالَ: «شَكَا أَهْلُ الكُوفَةِ سَعْدًا إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَعَزَلَهُ، وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ عَمَّارًا، فَشَكَوْا حَتَّى ذَكَرُوا أَنَّهُ لاَ يُحْسِنُ يُصَلِّي، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَبَا إِسْحَاقَ إِنَّ هَؤُلاَءِ يَزْعُمُونَ أَنَّكَ لاَ تُحْسِنُ تُصَلِّي، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: أَمَّا أَنَا وَاللَّهِ «فَإِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي بِهِمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَخْرِمُ عَنْهَا، أُصَلِّي صَلاَةَ العِشَاءِ، فَأَرْكُدُ فِي الأُولَيَيْنِ وَأُخِفُّ فِي الأُخْرَيَيْنِ»، قَالَ: ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ، فَأَرْسَلَ مَعَهُ رَجُلًا أَوْ رِجَالًا إِلَى الكُوفَةِ، فَسَأَلَ عَنْهُ أَهْلَ الكُوفَةِ وَلَمْ يَدَعْ مَسْجِدًا إِلَّا سَأَلَ عَنْهُ، وَيُثْنُونَ مَعْرُوفًا، حَتَّى دَخَلَ مَسْجِدًا لِبَنِي عَبْسٍ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ أُسَامَةُ بْنُ قَتَادَةَ يُكْنَى أَبَا سَعْدَةَ قَالَ: أَمَّا إِذْ نَشَدْتَنَا فَإِنَّ سَعْدًا كَانَ لاَ يَسِيرُ بِالسَّرِيَّةِ، وَلاَ يَقْسِمُ بِالسَّوِيَّةِ، وَلاَ يَعْدِلُ فِي القَضِيَّةِ، قَالَ سَعْدٌ: أَمَا وَاللَّهِ لَأَدْعُوَنَّ بِثَلاَثٍ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ عَبْدُكَ هَذَا كَاذِبًا، قَامَ رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَأَطِلْ عُمْرَهُ، وَأَطِلْ فَقْرَهُ، وَعَرِّضْهُ بِالفِتَنِ، وَكَانَ بَعْدُ

إِذَا سُئِلَ يَقُولُ: شَيْخٌ كَبِيرٌ مَفْتُونٌ، أَصَابَتْنِي دَعْوَةُ سَعْدٍ، قَالَ عَبْدُ المَلِكِ: فَأَنَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ، قَدْ سَقَطَ حَاجِبَاهُ عَلَى عَيْنَيْهِ مِنَ الكِبَرِ، وَإِنَّهُ لَيَتَعَرَّضُ لِلْجَوَارِي فِي الطُّرُقِ يَغْمِزُهُنَّ»(1).

واتە: خەڵکی کووفە سکاڵایان لەسەر (سعد بن أبي وقاص) ﷺ ناردە لای خەلیفە (عمر بن الخطاب) ﷺ، ئەویش چەند پیاوێکی ناردە کووفە و چوونە هەر مزگەوتێك لێی ڕازی بوون و وەسفیان دەدا، تا گەیشتنە مزگەوتی (بني عبس)، لەوێ پیاوێك لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوە کە ناوی (أسامة بن قتادة) بوو، وتی: بەڵام مادام ئێوە داوای ڕوونکردنەوەی تەواومان لێ دەکەن، ئەوا (سەعد) سریەیەك نانێرێت بۆ جیهاد، وە لە دابەشکردندا یەکسان نییە، وە لە حوکمداندا دادپەروەر نییە، (سەعد) ﷺ وتی: سوێند بە خوا سێ دووعات لێ دەکەم، دەستی هەڵبڕی و وتی: خوای پەروەردگار ئەگەر ئەم بەندەیەت درۆزنە و بۆ ڕیا و ناوبانگ هەستاوە، ئەوا تەمەنی درێژ بکەیت، وە بە درێژایی تەمەنی هەژار بێت، وە تووشی هەموو فیتنەیەکی بکەیت، (عبد الملك بن عمير) کە گێڕەرەوەی ڕووداوەکەیە دەڵێت: من لە کۆتایی تەمەنیدا بینیم هەردوو برۆی داکەوتبووە سەر چاوی لە پیرییەتیدا، لەسەر ڕێگاکاندا دەوەستا دەستی بۆ کچۆڵەکان دەبرد، گەر پرسیارت لێ بکردایە، دەیوت: پیاوێکی بەتەمەنم تووشی فیتنە بووم بە هۆکاری دووعاکەی (سەعد)ەوە.

بەم شێوەیە خوای گەورە تۆڵەی هاوەڵەکانی پێغەمبەری ﷺ کردووەتەوە، هاوەڵی بەڕێز (سعد بن أبي وقاص) ﷺ دووعای ڕەد نەدەبووەوە، لەدوای دووعاکەی پێغەمبەر ﷺ کە لە شەڕی (ئوحود)دا بۆی کرد، کە فەرمووی: «اللَّهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ»(2).

وە کاتێك لەپێش پێغەمبەرەوە ﷺ بەرگری لە پێغەمبەر دەکرد و تیری دەدایە پێی دەفەرموو: «ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي»(3).

---

(1) رواه البخاري (٧٥٥)، وأحمد في "المسند" (١٥١٨)، وأبو يعلى في "المسند" (٦٩٣)، وعبدالرزاق في "المصنف" (٣٧٠٧)، والطيالسي في "المسند" (٢١٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٤٨٣)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٦٠).

(2) رواه الترمذي (٣٧٥١)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٩٠)، والطبراني في "الأوسط" (٤٠٦٩)، واللالكائي في "كرامات الأولياء" (٧٦)، والهيثمي في "موارد الظمآن إلى زوائد ابن حبان" (٢٢١٥)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٦١٢٥)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" لصهيب عبد الجبار (١٥/ ٤٤٢).

(3) رواه البخاري (٤٠٥٥)، ومسلم (٢٤١١)، والترمذي (٢٨٢٩)، والنسائي في "السنن الكبرى" (٨١٥٩)، وابن حبان في =

واتە: تیرەکەیان تێبگرە دایك و باوکم بە قوربانت بن.

وَعَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: «مَا جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَاهُ وَأُمَّهُ لِأَحَدٍ إِلَّا لِسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، قَالَ لَهُ يَوْمَ أُحُدٍ: "ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي" »[(١)].

**واتە: (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دایك و باوکی بەقوربانی کەس نەکردووە تەنها (سەعد) نەبێت، کاتێك لە شەڕی (ئوحود)دا پێی فەرموو: تیرەکانیان تێگرە دایك و باوکم بە قوربانت بن.**

**٤.** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَرْوَى بِنْتَ أُوَيْسٍ، ادَّعَتْ عَلَى سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّهُ أَخَذَ شَيْئًا مِنْ أَرْضِهَا، فَخَاصَمَتْهُ إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا كُنْتُ آخُذُ مِنْ أَرْضِهَا شَيْئًا بَعْدَ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: وَمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: «مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنَ الْأَرْضِ ظُلْمًا، طُوِّقَهُ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ»، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: لَا أَسْأَلُكَ بَيِّنَةً بَعْدَ هَذَا، فَقَالَ: «اللهُمَّ، إِنْ كَانَتْ كَاذِبَةً فَعَمِّ بَصَرَهَا، وَاقْتُلْهَا فِي أَرْضِهَا»، قَالَ: «فَمَا مَاتَتْ حَتَّى ذَهَبَ بَصَرُهَا، ثُمَّ بَيْنَا هِيَ تَمْشِي فِي أَرْضِهَا، إِذْ وَقَعَتْ فِي حُفْرَةٍ فَمَاتَتْ»[(٢)].

**واتە: ئافرەتێك بەناوی (أروى بنت أويس) هەستا بە تۆمەتبارکردنی (سعيد بن زيد) ﷺ، کە یەکێکە لەو دە کەسانەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە، بەناوی ئەوەی پارچەیەك لە زەوی ئەمی**

= "صحيحه" (٦٩٨٨)، وأحمد في "المسند" (١١٤٧)، والبزار في "المسند" (٥٢٠)، والطبراني في "الكبير" (٣١٥)، وفي "الأوسط" (٥٦٢٧)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٠٧)، والآجري في "الشريعة" (١٧٧٧)، واللالكائي في "شرح أصول الإعتقاد" (٢٦٩٨)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٥١٢).

(١) رواه الترمذي (٢٨٢٩)، والنسائي في "الكبرى" (٩٩٥٠)، وابن ماجه (١٢٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٨٨)، وأحمد في "المسند" (٧٠٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، وفي "فضائل الصحابة" (١٣٠٤)، والطبراني في "الأوسط" (٥٦٢٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٦٧٤٧)، والطيالسي في "مسنده" (١٠٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٥٦١٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٠٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٩٢٠)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٦١٢٦).

(٢) رواه مسلم (١٦١٠)، وأبو يعلى في "المسند" (٩٦٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١١٥٣٣).

داگیر کردووە، ئەمەی گەیاندە لای (مروان بن الحکم)، (سەعید)یش وتی: من زەوی ئەو داگیر دەکەم پاش ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە؟! (مەروان) وتی: چیت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ (سەعید) وتی: بیستوومە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: هەرکەسێك بستێك زەوی بە ستەم داگیر بکات، خوای گەورە بە هەر حەوت چینی زەویدا ڕۆی دەچێنێ، (مەروان) پێی وت: لەدوای ئەمە داوای هیچ شایەتکارییەکت لێ ناکەم، (سەعید) دووعای لێکرد و وتی: خوایە ئەگەر ئەم ئافرەتە درۆزنە، چاوی کوێر کەیت و لە زەوییەکەی خۆیدا بیکوژیت، (هیشام) دەڵێت: ئەو ئافرەتە نەمرد تا چاوی کوێر بوو، پاشان ڕۆژێك لە زەوییەکەیدا کەوتە ناو چاڵێکەوە و مرد.

٥. (سَعِيدِ بْنُ الْمُسَيِّب) ﵀ گەورە پیاوانی (تابعين) دەڵێت: «إِنَّ هَذَا رَجُلٌ قَدْ سَوَّدَ اللهُ وَجْهَهُ، قُلْتُ: وَلِمَهْ؟ قَالَ: كَانَ يَقَعُ فِي عَلِيٍّ، وَطَلْحَةَ، وَالزُّبَيْرِ، فَجَعَلْتُ أَنْهَاهُ، فَجَعَلَ يَأْبَى، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَهُمْ سَوَابِقُ وَقَدَمٌ، فَإِنْ كَانَ مُسْخِطًا لَكَ مَا يَقُولُ فَأَرْبِهِ وَاجْعَلْهُ آيَةً قَالَ: فَسَوَّدَ اللهُ وَجْهَهُ»[(١)].

واتە: ئەو پیاوە ڕووی ڕەش بووە، (علي بن زيد) دەڵێت: وتم: بۆ؟ وتی: چونکە قسەی بە (علي وطلحة وزبير) دەوت، منیش هەر ڕێگریم لێ دەکرد، ئەویش هەر دەیوتەوە، منیش وتم: خوای گەورە ئەگەر ئەو پیاوانە پێشینەی چاکیان لای تۆ هەیە و خاوەن پلەوپایەن، وە ئەگەر کاری ئەم پیاوەت پێ ناخۆشە و تووڕەی کردووی، ئەوا خوایە بیکە بە پەند لەناو خەڵکیدا، پاش ئەمە ڕووی ڕەش بوو.

٦. عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي قُرَّةَ، قَالَ: كَانَ حُذَيْفَةُ بِالْمَدَائِنِ فَكَانَ يَذْكُرُ أَشْيَاءَ قَالَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِأُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فِي الْغَضَبِ، فَيَنْطَلِقُ نَاسٌ مِمَّنْ سَمِعَ ذَلِكَ مِنْ حُذَيْفَةَ فَيَأْتُونَ سَلْمَانَ فَيَذْكُرُونَ لَهُ قَوْلَ حُذَيْفَةَ، فَيَقُولُ سَلْمَانُ: حُذَيْفَةُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى حُذَيْفَةَ فَيَقُولُونَ لَهُ قَدْ ذَكَرْنَا قَوْلَكَ لِسَلْمَانَ فَمَا صَدَّقَكَ وَلَا كَذَّبَكَ، فَأَتَى حُذَيْفَةُ سَلْمَانَ وَهُوَ فِي مَبْقَلَةٍ فَقَالَ: يَا سَلْمَانُ، مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تُصَدِّقَنِي بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟

---

(١) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (١٧٣٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٧٠).

فَقَالَ سَلْمَانُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَغْضَبُ فَيَقُولُ فِي الْغَضَبِ لِنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَيَرْضَى فَيَقُولُ فِي الرِّضَا لِنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، أَمَا تَنْتَهِي حَتَّى تُوَرِّثَ رِجَالًا حُبَّ رِجَالٍ وَرِجَالًا بُغْضَ رِجَالٍ، وَحَتَّى تُوقِعَ اخْتِلَافًا وَفُرْقَةً؟ وَلَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ فَقَالَ: «**أَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي سَبَبْتُهُ سَبَّةً، أَوْ لَعَنْتُهُ لَعْنَةً فِي غَضَبِي، فَإِنَّمَا أَنَا مِنْ وَلَدِ آدَمَ أَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُونَ، وَإِنَّمَا بَعَثَنِي رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ، فَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ صَلَاةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ**» وَاللهِ لَتَنْتَهِيَنَّ أَوْ لَأَكْتُبَنَّ إِلَى عُمَرَ[1].

**واتە: (حوزەیفەی کوڕی یەمان) ﵁ لە شاری (مەدائن) بوو، کە (سەلمان پاك)ی ئێستا دەکات، چەند شتێکی ناوخۆی پێغەمبەری ﷺ باس دەکرد، کە فەرمووبووی لەکاتی تووڕەبوون و نارەزایدا لەسەر هەندێك لە هاوەڵان، خەڵکیش کە ئەمەی دەبیست دەچوون بۆ لای (سەلمانی فارسی) ﵀ بۆیان دەگێڕایەوە، سەلمانیش دەیگوت: (حوزەیفە) خۆی دەزانێت چی دەڵێت، خەڵکیش دەگەڕانەوە بۆ لای (حوزەیفە) و دەیان وت: (سەلمان) نە بەڕاستی دانایت و نە بەدرۆی خستیتەوە، ئەویش گەیشت بە (سەلمان) و وتی: بۆچی پشتیوانیم ناکەیت لەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووتە؟ (سەلمان)یش وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك تووڕە بووە لە هەندێك و لەو کاتەدا شتێکی وتووە و لە ڕازیبوونیشدا شتی وتووە بەرامبەر خاوەنەکانیان، بۆچی تۆ کارێك دەکەیت تا ئەو خەڵکە هەندێکیان لایەکیان خۆش بوێت و هەندێکیان ڕقیان لە هەندێکی تریان بێت؟! تا ئەبیتە هۆکاری دووبەرەکایەتی نێوان خەڵکی، خۆشت دەزانیت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێك لە موسوڵمانان گەر قسەیەکم پێ وت لە تووڕەبووندا، ئەوا من یەکێکم لە ئادەمیزادەکان تووڕەبوونم بەسەر دێت وەکوو یەکێك لە ئەوان، وە منیش بە هۆکاری بەزەیی و ڕەحمەت نێردراوم، خوای پەروەردکار ئەو قسانەم لەسەریان بۆ بکەیتە پلەبەرزییان لە ڕۆژی دواییدا" ، سوێند بە خوا واز دەهێنیت باشە، وە گەر نا ئەمە دەگەیەنمە خەلیفە (عومەری کوڕی خەتتاب) ﵁.**

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٢٣٤)، وفي "التأريخ الأوسط" (١/ ٧٢)، وأبو داود (٤٦٥٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، وأحمد في "المسند" (٢٣٧٠٦)، والطبراني في "الكبير" (٦١٥٦)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٧٥٨)، و"صحيح الأدب المفرد" (١٧٤).

ئەمە بووەتە هەڵوێستی ئەهلی سوننەت بەرامبەر هاوەڵان، کە بە هیچ شێوەیەك باسی کێشە و زبری و ڕووداوی نێوان هیچ کام لە هاوەڵان ناکرێت، وە بەتایبەت لە کاتی بۆنەکانی بیدعەکاران لەسەر ڕووداوەکانیان و باسکردنیان، وەکوو شەهیدبوونی ئیمامی (عەلی و حوسەین) ﵄، وە بەشداریکردن بە دوور و نزیك لەو باس و کاتانەدا ناووروژێنرێت، بەڵکوو لەبیر دەبرێتەوە و دەمرێنرێت.

قَالَ الْعَوَّامُ بْنُ حَوْشَبٍ ﵀: «أَدْرَكْتُ صَدْرَ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَقُولُونَ: اذْكُرُوا مَحَاسِنَ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى تَأَلَّفَ عَلَيْهِمُ الْقُلُوبُ، وَلَا تَذْكُرُوا مَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ فَتُجَسِّرُوا النَّاسَ عَلَيْهِمْ»[(١)].

واتە: تابعی ناودار (عەوامی کوڕی حەوشەب) ﵀ دەڵێت: بە هەرچی گەیشتم لە کەسانی سەرەتای ئەم ئوممەتە، هەندێکیان بە هەندێکیان دەوت: باسی چاکەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، تاوەکوو دڵەکان لەسەری خڕبێتەوە و باسی ڕووداوەکانی نێوانیان مەکەن، تا خەڵك هاندەن لەسەریان.

قَالَ الإِمَام أَحْمَد بْن حَنْبَل ﵀: «وَمِنَ الْسُّنَّةِ ذِكْرُ مَحاسِن أَصْحَاب رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلِّهِم أَجْمَعِين، وَالْكفّ عَن الَّذِي جَرَى بَيْنَهُمْ»[(٢)].

واتە: ئیمام (ئەحمەد) ﵀ دەڵێت: یەکێك لە شێوازی شوێنکەوتەیی سوننەت، باسی چاکەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەکرێت و باسی ڕووداوەکانی نێوانیان ناکرێت.

سُئِلَ الإِمَام (أَحْمَد) وَقِيْلَ لَهُ: مَا تَقُولُ فِيمَنْ زَعَمَ أَنَّهُ مُبَاحٌ لَهُ أَنْ يَتَكَلَّمَ فِي مَسَاوِئِ أَصْحَابِ

---

(١) "تفسير القرطبي" (١٨/ ٣٣) في تفسير سورة [الحشر : آية : ١٠]، و "الكشف والبيان عن تفسير القرآن" للثعلبي (٩/ ٢٨٢)، و "اللباب في علوم الكتاب" للنعماني (١٨/ ٥٩٨)، و "السنة" لأبي بكر بن الخلال (٣/ ٥١٣) برقم (٨٢٩)، و "الشريعة" للآجري (٥/ ٢٤٩٢) برقم (١٩٨١)، و "الإمامة والرد على الرافضة" للأصبهاني ص٣٧٥، و "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبد البر (٢/ ١١١٩) برقم (٢١٩٧)، "الإبانة" لابن بطة ص١٦٥.

(٢) "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٣٠)، و "السنة" لأحمد بن حنبل ص١٧، و "الصارم المسلول على شاتم الرسول" لابن تيمية ص٥٨٦، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لعبدالمحسن العباد ص١٩، و "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض (٢/ ٨٦٦).

رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «هَذَا كَلَامُ سُوءٍ رَدِيءٌ، يُجَانَبُونَ هَؤُلَاءِ الْقَوْمُ، وَلَا يُجَالَسُونَ، وَيُبَيَّنُ أَمْرُهُمْ لِلنَّاسِ»(١).

واته: پرسیار لە ئیمام (ئەحمەد) رَحِمَهُ اللهُ کرا و پێیان وت: چی دەڵێیت دەربارەی ئەوانەی دەڵێن: دروستە قسە لەسەر هەڵە و زبرییەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بکرێت؟ ئەویش وتی: ئەمە قسەیەکی خراپ و هەڵەیە، دوورەپەرێز بن لێیان و لەگەڵیان دامەنیشن و خەڵکیان لێ ئاگادار بکەنەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِذَا ذُكِرَ أَصْحَابِي فَأَمْسِكُوا»(٢)، وە فەرموویەتی: «أَحْسِنُوا إِلَى أَصْحَابِي»(٣).

واته: گەر باسی هاوەڵانم کرا، بێدەنگ بن، وە چاك بن لەگەڵ هاوەڵانمدا.

تاوانەکان کاریان ئاسانترە تاوەکوو قسەوتن بە هاوەڵان، لەبەرئەوەی تاوان (شهوات)ە، بەڵام قسەوتن بە هاوەڵان (شبهات) و گومڕاییە، وەکوو لەم ڕووداوەدا دەردەکەوێت: «إِنَّهُ كَانَ فِي جِيرَانِ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ رَجُلٌ، وَكَانَ مِمَّنْ يُمَارِسُ الْمَعَاصِيَ وَالْقَاذُورَاتِ، فَجَاءَ يَوْمًا مَجْلِسَ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَكَأَنَّ أَحْمَدَ لَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَدًّا تَامًّا، وَانْقَبَضَ مِنْهُ، فَقَالَ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ لِمَ تَنْقَبِضُ مِنِّي؟ إِنِّي قَدِ انْتَقَلْتُ عَمَّا كُنْتَ تَعْهَدُهُ مِنِّي بِرُؤْيَا رَأَيْتُهَا. قَالَ: وَأَيُّ شَيْءٍ رَأَيْتَ تَقَدَّمَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّوْمِ كَأَنَّهُ عَلَى عُلُوٍّ مِنَ الْأَرْضِ، وَنَاسٌ كَثِيرٌ أَسْفَلَ جُلُوسٌ، قَالَ: فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ رَجُلٌ مِنْهُمْ إِلَيْهِ، فَيَقُولُونَ: ادْعُ لَنَا حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنَ الْقَوْمِ غَيْرِي، قَالَ: فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُومَ فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْ قُبْحِ مَا كُنْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَقَالَ لِي: يَا فُلَانُ، لِمَ لَا تَقُومُ وَتَسْأَلُنِي أَدْعُو لَكَ؟ فَكَأَنِّي قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَقْطَعُنِي الْحَيَاءُ مِنْ قُبْحِ مَا أَنَا عَلَيْهِ، قَالَ: إِنْ كَانَ يَقْطَعُكَ الْحَيَاءُ فَقُمْ فَسَلْنِي أَدْعُو لَكَ، إِنَّكَ لَا تَسُبُّ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي، قَالَ: فَقُمْتُ فَدَعَا

---

(١) "السنة" لأبي بكر بن الخلال (٢/ ٤٣٨)، و "بداية الهداية" للغزالي (٢٨٦).

(٢) رواه الطبراني في "الكبير" (١٤٢٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٣٤)، وسبق تخريجه ص٥٨.

(٣) رواه النسائي في "الكبرى" (٩١٧٥)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٤٣٠)، وسبق تخريجه ص٥٧.

لِي، قَالَ: فَانْتَبَهْتُ، وَقَدْ بَغَّضَ اللهُ إِلَيَّ مَا كُنْتُ عَلَيْه، قَالَ: فَقَالَ لَنَا أَبُو عَبْدِ اللهِ: يَا جَعْفَرُ، يَا فُلَانُ، يَا فُلَانُ حَدِّثُوا بِهَذَا، وَاحْفَظُوا فَإِنَّهُ يَنْفَعُ»[١].

واتە: دراوسێیەکی ئیمام (ئەحمەد) هەبوو هەر خەریکی تاوانکردن بوو، ڕۆژێکیان هاتە دانیشتنەکەی ئیمام (ئەحمەد)ەوە و سڵاوی کرد، ئیمام بە شێوەیەکی تەواو وەڵامی نەدایەوە، ئەویش وتی: بۆچی ڕووم تێ ناکەی؟ خۆ من وازم هێناوە لەو کردەوانەی پێشووم، بە بۆنەی خەوێکەوە کە بینیومە، ئیمام وتی: چیت بینیوە؟ وتی: لە خەودا پێغەمبەرم ﷺ بینی، بەسەر بەرزییەکەوە و خەڵکێکی زۆر لە خوارییەوە دانیشتبوون، وە یەك یەك پیاوان دەچوونە لای و دەیانوت: دووعام بۆ بکە، بەم شێوەیە تاوەکوو هیچ کەسێك نەما، ویستم هەستم، شەرمم کرد لەبەر کردەوەکانم، پێغەمبەر ﷺ پێی وتم: ئەی فلان کەس بۆچی هەڵناسیت داوای دووعام لێ بکەیت؟ خۆ تۆ کەسێك نیت قسە بە هاوەڵانم بڵێیت، پاشان هەستام و دووعای بۆ کردم، پاشان خەبەرم بووەوە، ئیتر وازم لەو کردەوانەی پێشووم هێنا و خوای گەورە بوغزاندی لە دڵمدا، ئیمام (ئەحمەد) بە قوتابییەکانی وت: (جەعفەر و فلان و فلان) بینووسنەوە و بیگەیەنن، ئەوە سوودی هەیە.

کەواتە خاوەن تاوانە هەمەجۆرەکان لە کێشانەی خوادا سزا و کاریان ئاسانترە تاوەکوو فیرەقە گومڕاکانی ناو دین.

## قسەوتن بە هاوەڵان هۆکاری کەوتنەبەری ئەم دەقانەیە

١. قال الله تبارك وتعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾﴾ [الأحزاب: ٥٨].

واتە: ئەوانەی ئازاری ئیماندارانی پیاوان و ئافرەتان دەدەن، بەبێ هیچ هۆکارێك لەواندا، ئەوا هەڵگری تاوان و بۆهەڵبەستراوێکی ئاشکران.

(ابْنُ كَثِيرٍ) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «وَمِنْ أَكْثَرِ مَنْ يَدْخُلُ فِي هَذَا الْوَعِيدِ الْكَفَرَةُ بِاللهِ وَرَسُولِهِ، ثُمَّ

(١) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٣٧٢).

الرَّافِضَةُ، الَّذِينَ يَتَنَقَّصُونَ الصَّحَابَةَ، وَيَعِيبُونَهُمْ بِمَا قَدْ بَرَّأَهُمُ اللهُ مِنْهُ، وَيَصِفُونَهُمْ بِنَقِيضِ مَا أَخْبَرَ اللهُ عَنْهُمْ، فَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَخْبَرَ أَنَّهُ قَدْ رَضِيَ عَنِ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَمَدَحَهُمْ، وَهَؤُلَاءِ الْجَهَلَةُ الْأَغْبِيَاءُ يَسُبُّونَهُمْ وَيَتَنَقَّصُونَهُمْ، وَيَذْكُرُونَ عَنْهُمْ مَا لَمْ يَكُنْ وَلَا فَعَلُوهُ أَبَدًا، فَهُمْ فِي الْحَقِيقَةِ مَنْكُوسُو الْقُلُوبِ يَذُمُّونَ الْمَمْدُوحِينَ، وَيَمْدَحُونَ الْمَذْمُومِينَ»(١).

واتە: زۆری ئەوانەی بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە دەکەون بیبڕواکان و ڕافیزەکانن، کە ناتەواوی و توانج لە هاوەڵان دەگرن، بە پێچەوانەی وەسفەکانی خواوە باسیان دەکەن، خوای گەورە بە هەواڵی ڕازیبوون لێیان وەسفی کردوون، بەڵام ئەوان بێئاگایانە قسە و ناتەواوییەك دەدەنە پاڵیان کە تیایاندا نییە، ئەوانە لە ڕاستیدا دڵ هەڵگەڕاوەن، قسە بە چاکەکان دەڵێن، وەسفی خراپەکان دەکەن.

٢. قال الله تعالى: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ [الإسراء: ٣٦].

واتە: شوێنکەوتەی ئەوە مەبە کە زانیاریت بەسەریدا نییە، لەبەرئەوەی بیستن و بینین و دڵتان لێپرسینەوەی لەسەرە، ئەمە هێمایە بۆ ئەوەی شوێنی کار و کردەوە و هەواڵی کەس نەکەوێت، بەتایبەت هاوەڵان بە چەندەها سەدە لەپێشتر و بارودۆخی جیاواز ژیاون، تۆ ناتوانیت بچیتە ناو وردەکارییەکان و ڕاست و دروستی جیاکردنەوەیان.

٣. قال الله تعالى: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾﴾ [الحجرات: ١٢].

واتە: قسەوتن بە هاوەڵان و باسکردنیان بە شتێك کە تیایاندا نییە، بەر بۆهەڵبەستن دەکەوێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ، فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ»(٢).

---

(١) "تفسير ابن كثير" (٦/ ٤٨١) في تفسير سورة [الأحزاب: آية: ٥٨].

(٢) رواه مسلم (٢٥٨٩)، وأبو داود (٤٨٧٤)، والترمذي (١٩٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٤٥٤)، وأحمد في "المسند" (٧١٤٦)، والبزار في "المسند" (٨٣١٤)، وأبو يعلى في "المسند" (٦٤٩٣)، والبيهقي في "الشعب" (٦٩٩٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٦٠).

واتە: گەر باسەکەی تۆی تێدابێت ئەوە غەیبەتە، وە گەر تێیدا نەبێت ئەوە بوهتانە.

جا ئەگەر بۆ خەڵکی سادە بەو شێوەیە بێت، دەبێت بۆ هاوەڵان چۆن بێت کە دەقی ئایەت و فەرموودە وەسفیان دەکات؟!

٤. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»[(١)].

واتە: قسەوتن بە موسوڵمان تاوانە، وە شەڕکردن لەگەڵیدا بێبڕواییە.

دەبێت بۆ چاکترین چین و باشترین کەسانی ئەم ئوممەتە چۆن بێت کە فەرمانی لەسەرە قسەیان پێ نەوترێت، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَا تَسُبُّوا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِي»[(٢)].

واتە: قسە نەڵێن بە یەکێك لە هاوەڵانم.

٥. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ مِنْ أَرْبَى الرِّبَا الِاسْتِطَالَةَ فِي عِرْضِ الْمُسْلِمِ بِغَيْرِ حَقٍّ»[(٣)].

واتە: گەورەترین ڕیبا، زیادەڕەویکردن و پێڕاکێشانە لە قسەوتن بە ناڕەوا بە کەسێکی موسوڵمان.

بە درێژایی چەندەها سەدەیە فیرەقە گومڕاکان قسە بە هاوەڵان دەڵێن.

٦. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ

---

(١) رواه البخاري (٤٨)، ومسلم (٦٤)، والترمذي (١٩٨٣)، والنسائي في "الكبرى" (٣٥٥٤)، وابن ماجه (٦٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٩٣٩)، وأحمد في "المسند" (٣٦٤٧)، والبزار في "المسند" (١٦٦٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٩٩١)، والطبراني في "الكبير" (٣٢٥)، وفي "الأوسط" (٧٣٤)، والطيالسي في "مسنده" (٢٥٦)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٨٤٤)، والبيهقي في "الشعب" (٦٢٣٥)، وفي "السنن الكبرى" (١٥٨٥٢)، والحميدي في "مسنده" (١٠٤)، وإسحاق بن راهويه في "مسنده" (٤٠٠)، وابن بطة في "الإبانة" (٩٨٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٨٣٩)، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/ ٣٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٤٨).

(٢) رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٢٥٤١)، وسبق تخريجه ص٥٥.

(٣) رواه أبو داود (٤٨٧٦)، وأحمد في "المسند" (١٦٥١)، والبزار في "المسند" (١٢٦٤)، والطبراني في "الكبير" (٣٥٧)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٥٣٤٥)، والبيهقي في "الشعب" (٦٢٨٤)، والطحاوي في "معرفة السنن الآثار" (٢٠٢١٧)، وفي "السنن الكبرى" (٢١١٢٧)، وضياء الدين في "المختارة" (١١٠٦)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٠٤٥)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٢٠٣).

مِمَّا بَيْنَ الْمَشْرِقِ»(١).

واتە: کەسێك قسەیەك دەکات و ڕوونکردنەوەی لەسەری نییە، ئەو قسەیەی دەبێتە هۆکاری خستنە ناو دۆزەخیەوە بە دووری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

ئەو قسانەی کە بە هاوەڵان دەوترێت هیچ ڕوونکردنەوە و دڵنیایی و یەکلابوونەوەیەکی لای خاوەنەکانیان دەست ناکەوێت، کەواتە دەبێت خاوەنەکانیان چیان بەسەر بێت؟!

**٧. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ»(٢).**

واتە: موسوڵمان ئەو موسوڵمانەیە کە موسوڵمانان سەلامەت بن لە زمان و دەستی، ئەی ئەگەر ئەولیاکانی خوا سەلامەت نەبن لێیان؟!

**٨. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ»(٣).**

واتە: ئەوەندە بەسە بۆ کەسێك تووشی شەڕ بێت؛ کە برا موسوڵمانەکەی بە کەم و بێڕێز بزانێت، موسوڵمان لەسەر موسوڵمان حەرامە خوێن و ماڵ و کەسایەتی.

بۆچی کەسایەتی و خوێنی (خير القرون) ئەوەندە سووك و بێ قەدرە؟! دەبێت خۆیان بەو شێوەیە بن.

---

(١) رواه البخاري (٦٤٧٧)، ومسلم (٢٩٨٨)، والنسائي في "الكبرى" (١١٧٧٣)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٧٠٧)، وأحمد في "المسند" (٨٩٢٣)، والبيهقي في "الشعب" (٤٦٠٥)، وفي "السنن الكبرى" (١٦٦٦٤).

(٢) رواه البخاري (١٠)، ومسلم (٤١)، وأبو داود (٣٤٨١)، والترمذي (٢٥٠٤)، والنسائي في "الكبرى" (٨٦٤٨)، وابن حبان في "صحيحه" (١٨٠)، وأحمد في "المسند" (٦٥١٥)، والدارمي في "السنن" (٢٧٥٨)، والحاكم في "المستدرك" (٢٢)، والبزار في "المسند" (٨٩٤١)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤١٨٧)، والطبراني في "الكبير" (١١٣٧)، وفي "الأوسط" (٣٥٩٨)، وفي "الصغير" (٤٦٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (١٩٥١٩)، والبيهقي في "الشعب" (١٠٦١١)، وفي "السنن الكبرى" (٢٠٧٥٥)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٧٧٤)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٢٣)، والبغوي في "شرح السنة" (١/ ٢٧).

(٣) رواه مسلم (٢٥٦٤)، وأبو داود (٤٨٨٢)، وأحمد في "المسند" (٧٧٢٧)، والطبراني في "الكبير" (١٨٣)، والبيهقي في "الشعب" (٦٢٣٣)، وفي "السنن الكبرى" (١١٤٩٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٤٩).

**٩. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»[(١)].**

**واتە: ئەوەی باوەڕی بە خوا و ڕۆژی کۆتایی هەیە، با قسەی خێر بکات، یاخود بێدەنگ بێت.**

**هیچ هەڵوێستێك لەم دوو هەڵوێستە لە ئاستی (كنتم خير أمة) نەگێراوەتە بەر، بێجگە لە دوژمنکاری نەبێت.**

**١٠. قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي حَدِيْثٍ الْقُدْسِيِّ: «مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ»[(٢)].**

**واتە: ئەوەی ئازاری یەکێك لە ئەولیاکانم بدات و دوژمنکاری لەگەڵدا بکات، ئەوە بە ئاشکرا شەڕ لەگەڵ من دەکات.**

**دەشێت بە ڕقلێبوون ئەم دژایەتییە بکرێت، وەکوو (ابن حجر) ﷫ دەڵێت: «قَدْ تَقَعُ عَنْ بُغْضٍ يَنْشَأُ عَنِ التَّعَصُّبِ كَالرَّافِضِيِّ فِي بُغْضِهِ لِأَبِي بَكْرٍ وَالْمُبْتَدِعِ فِي بُغْضِهِ لِلسُّنِّيِّ»[(٣)].**

**واتە: ڕقلێبوونێکی دەمارگیری دەبێت، وەکوو ڕافیزەکان لە ڕقلێبوونی کوێرانەیان بۆ (ئەبو بەکر) ﷛، یاخوود بیدعەکارێك بۆ ئەهلی سوننەت.**

**١١. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا»[(٤)].**

**واتە: قسە بە مردووەکان مەڵێن، ئەوان بەرەو ئەوانە ڕۆیشتن کە پێشیان خستووە، بەڵام هاوەڵان هەر زیندوون لە قسەپێوتندا.**

---

(١) رواه البخاري (٦٤٧٥)، ومسلم (٤٧)، والنسائي في "الكبرى" (١١٧٧٩)، ومالك في "الموطأ" (٣٤٣٤)، وأحمد في "المسند" (٢٧١٦١)، والطبراني في "الكبير" (٤٨٣)، والبيهقي في "الشعب" (٩١٤٠).

(٢) رواه البخاري (٦٥٠٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٦٣٩٥) بلفظ: «مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ بَارَزَنِي بِالْحَرْبِ»، واللالكائي في "كرامات الأولياء" (٤٣)، وابن عساكر في "المعجم" (١٤٣٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٢٤٧).

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (١١/ ٣٤٢).

(٤) رواه البخاري (١٣٩٣)، والنسائي في "الكبرى" (٢٠٧٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٠٢١)، وأحمد في "المسند" (٢٥٤٧٠)، والدارمي في "السنن" (٢٥٥٣)، وإسحاق بن راهويه في "مسنده" (١١٩٩)، والحاكم في "المستدرك" (١/ ٥٤١)، والبزار في "المسند" (٢٤٩)، والطبراني في "الدعاء" (٢٠٦٤)، والبيهقي في "الشعب" (٦٢٥١)، وفي "السنن الكبرى" (٧١٨٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٥٠٩).

**١٢. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِطَعَّانٍ، وَلَا بِلَعَّانٍ، وَلَا الْفَاحِشِ الْبَذِيءِ»[(١)]، وَقَالَ: «لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ»[(٢)]، وَقَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِرُ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا»[(٣)].**

**واتە: ئیماندار نەفرەتکار و تانەدەر و زمان پیس نییە، وە نەفرەتکردنی ئیماندار وەکوو کوشتنی وایە، وە هەرکەسێك بە یەکێك بڵێت بێبڕوا ئەوا یەکێکیان دەگرێتەوە.**

**ئەم هەموو ژێرباری هەڕەشەیە و بێباکییە لەپێناوی چیدا، گەر گومڕایی و سەرلێشێواوی نەبێت؟!**

❁ ❁ ❁

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٣٨٣٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والطبراني في "الكبير" (١٣٠٦٣)، والبغدادي في "المخلصيات" (٢٣٧٣).

(٢) رواه البخاري في "الأدب المفرد" (٧٦٣)، وأحمد في "المسند" (١٦٣٨٥)، والدارمي في "السنن" (٢٤٠٦)، والبزار في "المسند" (٣٥١٨)، والطبراني في "الكبير" (١٣٣٠)، وصححه الألباني في "صحيح الأدب المفرد" ص٢٨٥.

(٣) رواه البخاري (٦١٠٤)، والترمذي (٢٦٣٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٤٩)، ومالك في "الموطأ" (٢٠٦٩)، وأحمد في "المسند" (٥٩٣٣)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٩٠٢)، وابن بطة في "الإبانة" (١٠٠٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٥٥١).

# پلەوپایەکانی نێوان هاوەڵان

پلەوپایەی دینی لە نێوان هاوەڵاندا ﷽ بەخشندەییەکی خواییە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾﴾ [الجمعة : ٤].

واتە: دەیبەخشێت بەوەی کە ویستی لەسەرە.

وە دەفەرمویێت: ﴿يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾ [آل عمران : ٧٤].

واتە: تایبەتمەندی دەکات بە ڕەحمەتی خۆی، ئەوەی ویستی لەسەرە.

وە دەفەرمویێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ [القصص : ٦٨].

واتە: خوای پەروەردگار ئەوەی ویستی لەسەرە دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت.

ئەم تایبەتمەندی و هەڵبژاردن و بەخشینە بەدەر لەوەی دانانێکی بوونەوەرییە (قدر الكوني)، هۆکاری کردەوەی باشی خۆیان و نییەتی پاکیشیان کاریگەرییەکی دیارە تیایاندا، وەکوو خوای پەروەدگار دەفەرمویێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾﴾ [الليل : ٥ - ٧].

واتە: گەر ببەخشن و تەقوای خوایان هەبێت و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بکەن، ئەوکات ئێمەش کاری ڕێگەی چاکیان بۆ ئاسان دەکەین.

وە خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾ [الكهف : ٨٨].

واتە: ئەوەی ئیمان بهێنێت و کاری چاکە بکات، پاداشتی چاکیان بۆ هەیە و کارئاسانی ئێمەشیان بۆ دەکرێت، ئەگەرچی بوونی هاوەڵان لەو سەردەمەدا و ژیانیان لەناو مەککەدا و هاوڕێیەتی (ئەبو بەکر) ﷺ هەر لە منداڵییەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و جۆری پێبەخشینی عەقڵ و شعوور و چۆنییەتی کەسەکان دەگەڕێتەوە بۆ قەدەری کەونی کە کەس دەسەڵاتی تیادا نییە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بەخشینێکی خواییە و هەریەکەی لە بوارێکدا پێی بەخشیوە، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾﴾ [الأعلى : ٢].

وە ئەم پلەکارییەی نێوان هاوەڵان مانای کەم قەدری نێوانیان نییە، تەنانەت بۆ خۆشیان لە سەردەمی خۆیاندا شوێنی دوودڵی و گومان نەبوو، بۆیە (عبدالله بن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «كُنَّا نُخَيِّرُ بَيْنَ النَّاسِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنُخَيِّرُ أَبَا بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، ثُمَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ»[١].

واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەڵبژاردنمان لە نێوان خەڵکیدا دەکرد، (ئەبو بەکر)مان هەڵدەبژارد، پاشان (عومەر)، پاشان (عوسمان)، خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

وە زۆری ڕای زانایان، بەڵکوو بە کۆدەنگ ناوی دەبەن؛ کە ئەم ڕیزبەندییە پلەوپایەکانیانە.

الشَّيْخ (ناصر بن علي عائض) دەڵێت: «فقد أجمع الصحابة رضي الله عنهم، ومن جاء بعدهم من أهل السنة والجماعة على أن أفضل الصحابة والناس بعد الأنبياء عليهم الصلاة والسلام أبو بكر، ثم عمر، ثم عثمان، ثم عليّ، ثم سائر العشرة، ثم باقي أهل بدر، ثم باقي أهل أحد، ثم باقي أهل بيعة الرضوان، ثم باقي الصحابة، هكذا إجماع أهل الحق»[٢].

واتە: کۆدەنگی هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوان لە ئەهلی سوننە لەسەر ئەوەیە کە باشترین کەس لە نێوان هاوەڵاندا دوای پێغەمبەران عليهم السلام (ئەبو بەکر، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان عەلی)ە، پاشان ئەوانەی ماون دوای خەلیفەکان کە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە (العشرة المبشرة بالجنة)، پاشان بەشداربووانی بەدر، پاشان بەشداربووانی ئوحود، پاشان بەشداربووانی ڕێککەوتننامەی حودەیبییە، پاش ئەمانیش چی ماوە لە هاوەڵان بە گشتی، خوای گەورە لە هەرهەموویان ڕازی بێت.

---

(١) رواه البخاري (٣٦٥٥)، وأبو داود (٤٦٢٨)، والترمذي (٣٧٠٧)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٥٥)، والطبراني في "الكبير" (١٣١٣٢)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١١٩٠)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٣٦٠١)، والآجري في "الشريعة" (١٤٥٣).

(٢) "عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام" لناصر بن علي عائض (١/ ٢٣٩).

وە بۆ (إجماع) لەسەر ئەمە بڕوانە: "لوامع الأنوار البهية" للسفاريني (٢/ ٣١٢)، و"أصول الدين" للبغدادي ص٣٠٤، و"الفرق بين الفرق" لعبد القاهر ص٣٥٩، و"تأريخ الخلفاء" للسيوطي ص٤٤.

وَعَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَكْتُبُ إِلَى عُمَّالِهِ: «مَنْ فَضَلَنِي عَلَى أَبِي بَكْرٍ فَاضْرِبُوهُ حَدَّ الْمُفْتَرِي، أَوْ قَالَ أَرْبَعِينَ سَوْطًا»(١).

واتە: ئیمامی (عومەر) ﷺ بۆ کاربەدەستەکانی دەنووسی: ئەوەی من بە بەرێزتر دابنێ بەسەر (ئەبو بەکر)دا، چل داری حەددی لێ بدەن.

قَالَ علي ابن أبي طالب ﷺ: «لَا يبلغني عَنْ أَحَدٍ أَنَّهُ فَضَّلَنِي عَلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ إِلَّا جَلَدْتُهُ جَلْدَ الْمُفْتَرِي»(٢)، وە دەیوت: «خَيْرُ هَذِهِ الْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ»(٣).

واتە: ئیمامی (عەلی) ﷺ دەیوت: پێم بگات لای هەرکەسێکەوە کە منی بە بەرێزتر و باشتر دانابێت بەسەر (ئەبو بەکر و عومەر)دا، داری تەمێکردنی درۆی لێ دەدەم.

وە دەیوت: باشترین کەسانی ئەم ئوممەتە لەپاش پێغەمبەر ﷺ (ئەبو بەکر و عومەر)ن رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا.

تەنانەت ڕیزبەندکردنی خەلیفە ڕاشیدەکان لەپاش پێغەمبەر ﷺ بە شێوەی خۆی کە کۆدەنگی هەموو هاوەڵانی سەردەمی خۆی لەسەر بووە بەرنامەی ئەهلی سوننەیە، ئەوەی پێش و پاشی بخات، وەکوو شیعە و خەوارجەکان، ئەوا بیدعەکار و گومڕایە.

قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «أهل السنة ... أنهم يؤمنون أن الخليفة بعد رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أبو بكر وعمر ثم عثمان ثم علي، ومن طعن في خلافة أحد من هؤلاء؛ فهو أضل من حمار أهله»(٤).

(١) "أنساب الأشراف" للبلاذري (١٠/ ٨٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٠/ ٣٦٩)، و "مسند الفاروق" لابن كثير (٢/ ٥٢٢).

(٢) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٤٩)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٥٨، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢/ ٥٧٥)، وابن عساكر في "تاريخ دمشق" (٢٦/ ٣٤٣)، والآجري في الشريعة (١٨١٣)، وفي "شرح العقيدة الطحاوية" لابن أبي العز الحنفي ص٤٩٠، و "التمسك بالسنن والتحذير من البدع" للذهبي ص١٢٦، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٥/ ٥١١).

(٣) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (٤٣)، وفي "المسند" (٨٣٦)، والبزار في "المسند" (٤٨٨)، والطبراني في "الكبير" (١٧٨)، وفي "الأوسط" (٢٧٢٨)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣١٩٥٠)، والدولابي في "الكنى والأسماء" (٨٧٣)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٥٦٢)، والآجري في "الشريعة" (٤/ ١٧٣٧)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٦٠٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ١٩٨)، وفي "فضائل الخلفاء الراشدين" (١٦٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٢٠١).

(٤) "العقيدة الواسطية" لابن تيمية ص١٤٦.

واتە: ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە کە خەلیفەکان پاش پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی)ن ﵃، وە هەرکەس تانە لە خەلیفایەتی یەکێکیان بدات؛ ئەوە گومڕاترە لە گوێدرێژی خاوەنەکەی.

وَقَالَ: «اتَّفَقَ عَامَّةُ أَهْلِ السُّنَّةِ مِنْ الْعُلَمَاءِ وَالْعِبَادِ وَالْأُمَرَاءِ وَالْأَجْنَادِ عَلَى أَنْ يَقُولُوا: أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ عُمَرُ؛ ثُمَّ عُثْمَانُ؛ ثُمَّ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ»[١].

واتە: کۆدەنگی گشت زانایانی ئەهلی سوننەت لە زانا و عابیدەکان و ئەمیرەکانیان؛ لەسەر ئەوەیە کە دەڵێن: (ئەبو بەکر، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان عەلی) ﵃.

وَقَالَ (اَلشَّافِعِيّ) ﵀: «أَقُولُ فِي الْخِلَافَةِ وَالتَّفْضِيلِ بِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ»[٢].

واتە: دەڵێم: لە پلەوپایە و خەلیفایەتیشدا (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) ﵃.

... قَالَ: «سَأَلْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ مَنْ تُفَضِّلُ؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَهُمُ الْخُلَفَاءُ ...»[٣].

واتە: پرسیار لە ئیمام (أحمد) کرا لە بارەی پلەوپایەی هاوەڵانەوە، وتی: (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی)، ئەوانە جێنشینەکانن.

وَقَالَ أَبُوْ زُرْعَةَ: «نَقُولُ: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ فِي الْخِلَافَةِ وَالتَّفْضِيلِ جَمِيعًا هَذَا دِينِي الَّذِي أَدِينُ اللهَ بِهِ وَأَرْجُو أَنْ يَقْبِضَنِي اللهُ عَلَيْهِ»[٤].

واتە: دەڵێین: (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) لە خەلیفایەتی و پلەوپایەدا، ئەمە ئەو دینەیە کە بەرپرسیارم لای خوا لەسەری، داواکارم لە خوا بەم باوەڕەوە بمرم.

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٣/ ٤٠٦).

(٢) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (٢٣٢١).

(٣) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (٢٣١٥).

(٤) "جامع بيان العلم وفضله" لابن عبدالبر (٢٣١٥).

ئەم ڕیزبەندییە بۆ خەلیفە ڕاشیدەکان لە سەردەمی خۆشیاندا لەسەر زمانی خۆشیان کارێکی ئاشکرا بووە، وەکوو (محمد الحنفية) کوڕی خەلیفە (علي بن أبي طالب) ﷺ دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: «قُلْتُ لِأَبِي أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: "أَبُو بَكْرٍ"، قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: "ثُمَّ عُمَرُ"، وَخَشِيتُ أَنْ يَقُولَ عُثْمَانُ، قُلْتُ: ثُمَّ أَنْتَ؟ قَالَ: "مَا أَنَا إِلَّا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ" »[1].

واتە: بە باوکمم وت: کێ چاکترین کەسە لەدوای پێغەمبەر ﷺ؟ وتی: (ئەبو بەکر)، وتم: پاشان کێ؟ وتی: (عومەر)، منیش ترسام بڵێ (عوسمان)، وتم پاشان تۆ؟ وتی: من هیچ شتێك نیم، بەدەر لەوەی پیاوێکم لە موسوڵمانان.

قَالَ الإِمَامُ (الطَّحَاوي) رَحِمَهُ اللهُ: «وَنُثْبِتُ الْخِلَافَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلًا لِأَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، تَفْضِيلًا لَهُ وَتَقْدِيمًا عَلَى جَمِيعِ الْأُمَّةِ، ثُمَّ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، ثُمَّ لِعُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، ثُمَّ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَهُمُ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ، وَالْأَئِمَّةُ الْمَهْدِيُّونَ»[2].

وَقَالَ (ابْنُ أَبِي الْعِزِ) رَحِمَهُ اللهُ شَارِح الطَّحَاوِيَّة: «وَتَرْتِيبُ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ أَجْمَعِينَ فِي الْفَضْلِ، كَتَرْتِيبِهِمْ فِي الْخِلَافَةِ. وَلِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا مِنَ الْمَزِيَّةِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ سُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، وَلَمْ يَأْمُرْنَا فِي الِاقْتِدَاءِ فِي الْأَفْعَالِ إِلَّا بِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقَالَ: «اقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي: أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ»، وَفَرْقٌ بَيْنَ اتِّبَاعِ سُنَّتِهِمُ وَالِاقْتِدَاءِ بِهِمْ، فَحَالُ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ فَوْقَ حَالِ عُثْمَانَ وَعَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ أَجْمَعِينَ»[3].

واتە: ڕیزبەندکردنی خەلیفەکان لە چاکی و پلەوپایەدا وەکوو ڕیزبەندکردنیان وایە لە

---

(١) رواه البخاري (٣٦٧١)، وأبو داود (٤٦٢٩)، وأحمد في "فضائل الصحابة" (٤٤٥)، والطبراني في "الأوسط" (٨١٠)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٦٧، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٥١٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٩٩٣)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٨٧١).

(٢) (٣) "شرح العقيدة الطحاوية" لأبي العز الحنفي ص٤٨٠ - ٤٩٥.

خەلیفایەتیدا، (ئەبو بەکر و عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تایبەتمەندییەکیان هەیە، ئەویش فەرمانمان پێ کراوە کە شوێنکەوتەی خەلیفەی ڕاشیدین بین، فەرمانمان پێ نەکراوە لە چاولێکردن و پێهەڵگرتنیان بێجگە لە (ئەبو بەکر و عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا نەبێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێهەڵگری ئەو دوانە بن لەدوای من (ئەبو بەکر و عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، حاڵ و چۆنێتی (ئەبو بەکر و عومەر) لە سەروو حاڵ و چۆنێتی (عەلی و عوسمان)ەوەیە ڕەزای خوا لە هەموویان بێت.





# بەشی سێیەم

## بەڵا دانراوەکانی سەر هاوەڵان

## (المصائب المقدرة على الصحابة)

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢﴾ [العنكبوت: ٢].

واتە: خەڵکان وا گومان دەبەن کە تووشی نارِەحەتی و تاقیکردنەوە نابن، لە کاتێکدا دەڵێن باوەڕدارین و ئیمانمان هەیە.

وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَ﴾ [الفرقان: ٢٠].

واتە: هەندێکمان کردووە بە فیتنە بۆ هەندێکتان، ئایا ئارام دەگرن؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّ عَذَابَ هَذِهِ الْأُمَّةِ جُعِلَ فِي دُنْيَاهَا»[1].

واتە: سزای ئەم ئوممەتە لە دونیادا لەسەریان دانراوە لەبری رِۆژی دوایی.

وە دەفەرموێت: «إِنَّ أُمَّتِي أُمَّةٌ مَرْحُومَةٌ لَيْسَ عَلَيْهَا فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ، إِنَّمَا عَذَابُهَا فِي الدُّنْيَا الزَّلَازِلُ، وَالْقَتْلُ، وَالْبَلَاءُ»[2].

واتە: ئوممەتی من (موسوڵمانان) خوای گەورە بەزەیی خۆی رِژاندووە بەسەریاندا، سزای سەختی نارِەحەتییەکانی قیامەتیان لەسەر نییە، بەڵاو سزاکانیان بۆ خراوەتە دونیا، لە فیتنە و کوشتن و نارِەحەتییەکان و بومەلەرزە کە روویان تێ دەکات.

---

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (١٥٦)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَا أَعْلَمُ لَهُ عِلَّةً وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ وَلَهُ شَاهِدٌ صَحِيحٌ، وقال الذهبي: على شرطهما ولا علة له، ورواه القضاعي في "مسند الشهاب" (١٠٠٠)، والبيهقي في "الشعب" (٩٣٤١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٢١٠٩).

(٢) رواه أبو داود (٤٢٧٨)، وأحمد في "المسند" (١٩٦٧٨)، والحاكم في "المستدرك" (٧٦٤٩) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والبزار في "المسند" (٣٠٩٩)، وأبو يعلى في "مسنده" (٧٢٧٧)، والطبراني في "الأوسط" (٤٠٥٥)، والبيهقي في "الشعب" (٩٣٤٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" برقم (٩٥٩).

وە دەفەرموێت: «مَا يَزَالُ البَلَاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ»(١).

واتە: بەردەوام بەڵا بەسەر پیاو و ئافرەتی ئیمانداروەیە، لە خۆی و منداڵی و ماڵی، تا دەگاتە خوا ﷻ و هیچ تاوانێکی بەسەرەوە نەماوە.

وە دەفەرموێت: «أَشَدُّ النَّاسِ بَلَاءً الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صَلَابَةٌ زِيدَ صَلَابَةً، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ، خُفِّفَ عَنْهُ، وَلَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَمْشِيَ عَلَى الْأَرْضِ مَا لَهُ خَطِيئَةٌ»(٢).

واتە: قورسترین بەڵا بەسەر پێغەمبەرانەوە بووە، پاشان هاوشێوەی ئەوان، هەموو کەس بەگوێرەی دینەکەی بەڵادار دەبێت، گەر دینەکەی پتەو بوو بەڵاکەی قورس دەبێت، وە گەر دینەکەی نەرمییەکی تێدا بوو، بە هێندەی دینەکەی بەڵادار دەبێت، بەڵا بە بەندەیەکەوە لکێنراوە و لێنابێتەوە تا دەگاتە ئەوەی بەسەر زەویدا دەڕوات و تاوانی پێوە نەماوە.

وە دەفەرموێت: «بِحَسْبِ أَصْحَابِي الْقَتْلُ»(٣).

واتە: هاوەڵانم بەشی کوشتنیان بۆ بڕاوەتەوە لە دونیادا لە بریتی هەموو شت.

---

(١) رواه الترمذي (٢٣٩٩)، وابن حبان في "صحيحه" (٢٩٢٤)، والحاكم في "المستدرك" (٧٨٧٩)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، والبيهقي في "الشعب" (٩٣٧٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (٧/ ٩١)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٢٢٨٠)، و "صحيح الجامع الصغير" (٥٨١٥)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٤١٤).

(٢) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٢٩٠١)، وأحمد في "المسند" (١٤٨١)، والدارمي في "السنن" (٢٨٢٥)، والحاكم في "المستدرك" (١٢١)، والطيالسي في "مسنده" (٢١٢)، وابن نصر في "المنتخب" (١٤٦)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٢٠٢)، والشاشي في "المسند" (٦٩)، والبيهقي في "الشعب" (٩٣١٨)، وفي "السنن الكبرى" (٦٥٣٤)، و"الآداب" (٧٣٠)، وضياء الدين في "المختارة" (١٠٥٦)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٦٨)، والبغوي في "شرح السنة" (١٤٣٤)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٤٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (٩٩٢)، و "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٤٠٢).

(٣) رواه أحمد في "المسند" (١٥٨٧٦)، والطبراني في "الكبير" (٣٤٦)، والبزار في "المسند" (١٢٦١)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٣٥٤)، وضياء الدين في "المختارة" (١١١)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٩٣)،، وفي "الآحاد والمثاني" (١٣٠٧)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٣٤٦)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٨١٦).

وە دەفەرموێت: «عَذَابُ هَذِهِ الْأُمَّةِ جُعِلَ بِأَيْدِيهَا فِي دُنْيَاهَا»[١].

واتە: سزای ئەم ئومەتە خراوەتە دەستی خۆیان هەر لە دونیادا.

بە مانای ئەم دەقانە ڕوون و ئاشکرایە کە دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە و موسوڵمانیش بەڵادارە تیایدا، وە بەگوێرەی کەمی و کاملی ئیمانەکەی بەڵاکەی لەسەر دادەبەزێت، بەم پێوانەیە هاوەڵان خاوەنی ئەو پلەوپایە ئیمانییە بەرزە بوون کە زانیمان، کەواتە گومان نییە کە لە پێشینە و مەشخەڵی بەڵاداریدان زیاد لە هەموو موسوڵمانێك، کەواتە هەرچییەکیان بەسەردا هاتبێت و ڕوویدابێت هەمووی بۆ گیانی ئەوان بەڵا بووە و ئەوان لەپێشتر بوون لە هەموو کەس کە تووشبن، وەکوو ئیمامی (الشافعي) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت:

وَفِي السَّماءِ نُجُومٌ لا عِدَادَ لَهَا — وَلَيْسَ يُكْسَفُ إلاَّ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ[٢]

واتە: لە ئاسمانەکاندا ئەستێرە زۆرە، لە ژمارە نایەت، بەڵام گیرانیش بێت بەسەردا بەس ڕۆژ و مانگ دەگیرێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە تەمەن و ژیانی هاوەڵان خۆیاندا هەواڵی بەڵا و بەسەرهات و شەهیدبوونی پێ گەیاندوون، کە ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەرچییەکیان بەسەردا هاتبێت هیچ دەسەڵاتی خۆیانی تێدا نەبووە و دەبوایە بهاتایە بەسەریاندا، وە لەلایەکیشەوە گۆڕانکارییەکانیش با بووەستێت لە نەمانی هاوەڵان و هاتنی خەڵکی تازەی بێئاگا لە هەموو بنەماکان و خەڵکی و سەرەتای کارەکان بە هۆکاری فراوانبوونی پانتایی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، وە هەڵکەندنی خەڵکی بە تازەیی لەسەر دینی ڕابوردوو و ئاشنانەبوونیان بەسەر ئیسلامدا و مانەوەی کاریگەرییەکانی ڕابوردوو لە نەتەوە و دین و بیروبۆچوونەکان هۆکار دەبێت لەسەر هەموو ڕووداوەکان، ئەمەش هەر بە گەرماوگەرمی بە شەهیدبوونی خەلیفە (عمر بن الخطاب)دا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەردەکەوێت و باقی خەلیفەکانیش تێدەکەون بەرەو قووڵایی زیاتر و ڕووداوی ئاڵۆزتر، وە پێش

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (٧٦٥٠)، وقال الذهبي: على شرط البخاري ومسلم، وصححه الألباني في "الصحيحة" (٩٥٩)، و "صحيح الجامع الصغير" (٣٩٩٤).

(٢) "ديوان الإمام الشافعي" ص١٣٢.

بە ڕووداوەکانیش ناگیرێت، وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ إِلَّا الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ»(١).

وفي رواية: «مَا مِنْ عَامٍ إِلَّا وَالَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ»(٢).

واتە: ئارام بگرن،ساڵ نییە بەسەرتاندا بێت هەر ئەوەی دوای خۆی شەڕی زیاترە لەوەی پێشووتر، تاوەکوو دەگەن بە خوای خۆتان.

وە گەر ڕەخنەیەکیش بگری، ئەوا وەڵامەکەی (ئادەم) بۆ (موسا) عليهما السلام وەڵامێکی یەکلاکەرەوەیە بۆی، کاتێك (موسا) عليه السلام ڕەخنە لە ئادەم دەگرێت لەسەر بوون بە هۆکاری هاتنە سەر زەوی و ئەو هەموو ڕووداوانە، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: «... فَقَالَ لَهُ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى، اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلَامِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى" »(٣).

واتە: تۆی ئەو (موسا)یەی کە خوای گەورە هەڵی بژاردووی بۆ پەیامەکەی و فەرموودەکانی بۆ نووسیتەوە لە ئەلواحەکاندا "کە ڕوونکراوەی هەموو شتێکی تێدایە، بە چەند ساڵ خوای گەورە تەوراتی نووسیوەتەوە پێش ئەوەی من درووست بکات؟ (موسا) عليه السلام وتی: بە چل ساڵ، (ئادەم) عليه السلام وتی: ئایا تیایدا بینیوتە ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ١٢١﴾ [طه: ١٢١] واتە: ئادەم فەرمانەکەی خوا دەشکێنێت و لەبیری دەچێت، (موسا) عليه السلام وتی: بەڵێ"(٤)، (ئادەم) عليه السلام وتی: ئەوە لۆمەم

(١) (٢) رواه البخاري (٧٠٦٨)، والترمذي (٢٢٠٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٥٩٥٢)، وأحمد في "المسند" (١٢٣٤٧)، والبزار في "المسند" (٧٤٨٢)، وابن عساكر في "المعجم" (١٢٨٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (٤٠٣٧)، وأبو بكر المالكي في "المجالسة وجواهر العلم" (٣٣٠)، والبيهقي في "الشعب" (٩٢٨٠)، والبغوي في "شرح السنة" (٤٢٩٠).

(٣) رواه البخاري (٣٤٠٩)، ومسلم (٢٦٥٢) واللفظ له، وأبو داود (٤٧٠١)، والترمذي (٢١٣٤)، والنسائي في "الكبرى" (١١٠٦٥)، وابن ماجه (٨٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٩)، وأحمد في "المسند" (٧٥٨٨)، والدارمي في "الرد على الجهمية" (٢٩٣)، والبزار في "المسند" (٧٨٨٨)، والطبراني في "مسند الشاميين" (٣٠٦٠)، وابن خزيمة في "التوحيد" (١/ ١٢٠)، وابن بطة في "الإبانة" (١٣٨٠)، وأبو يعلى في "مسنده" (١٥٢١)، والبيهقي في "الشعب" (١٨١)، وفي "القضاء والقدر" (١٦)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٠)، والآجري في "الشريعة" (٣٥٤)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٦٩٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (٣/ ٣٥٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٦٨).

(٤) ئەم زیادەیە ڕیوایەتەکەی لای ئیمامی (مسلم)ە بە ژمارە (٢٦٥٢).

دەکەیت لەسەر کارێك کە خوای گەورە لەسەری نووسیوم پێش ئەوەی دروست بکرێم بە چل ساڵ؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئادەم) بەڵگەی بەهێزی هەبوو بەسەر (موسا)دا.

ئەمانە و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پیاوانە خاوەنی پێشینە و کاملییەك و زانستێکی دینی گەورەن و تەمەنیان لە پێناودا بردووەتە سەر، کە بوارێك ناهێڵێتەوە شوێنی گومان و تێڕوانینێکی سادەوساکاری دونیایی بن، وە لە سەرچاوەیەکەوە وەسف و باسی چاکەیان کراوە کە هیچ شتێك پێشی ناکەوێت، ئەویش قورئان و فەرموودەیە.

گەر ئەو دەقانە بخەینە ڕوو کە باس لە بەسەرهات و بەڵای یەك لەدوای یەکی هاوەڵان دەکات؛ دڵنیاییەکی زیاترمان بۆ بەدەست دێت لەسەر بەرییەتی و پاکی هاوەڵان و کامڵی و پلە بەرزییان، دوور لە هەموو گومان و پاساوهێنانەوەیەك بۆیان، ئەوان زۆر لەوە گەورەترن بخرێنە ئەو ئاستەوە، چینێکی بێ وێنە و نمونە لە مێژوودا، چینێك کە دوژمنانیان موشریکەکانی مەککە و دووڕووەکانی مەدینە و گومڕا خاوەن هەوا و ئارەزووە دونیاییەکانە، وەکوو خەوارج و ڕافیزە و موعتەزیلە ... و فیرەقە بیدعەکارەکان، ئەوەندە بەس بێت کە خاوەنی وەسفی تەورات و ئینجیل و قورئان و فەرموودە بن، دۆستیان کەسانی خاوەن دین و ئیمان و عیبادەت و زانایان و کاملانی چوار سەدەن (خير القرون) کە خێرترین سەدەیە، وە خێرترین کەس لایەنگریانە.

## لە خەلیفەی ڕاشیدینەوە باسی بەڵاکانیان دەکەین:

### - هەواڵی شەهیدکردنی (عمر بن الخطاب) رضي الله عنه:

١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَعِدَ أُحُدًا، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ، فَقَالَ: «اثْبُتْ أُحُدُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ، وَصِدِّيقٌ، وَشَهِيدَانِ»[1].

واتە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان)دا رضي الله عنهم دەچێتە سەر شاخی ئوحود، شاخی ئوحود دەلەرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لە شوێنی خۆت بە ئوحود، کێت لەسەرە بێجگە لە پێغەمبەر و ڕاستگۆیەك و دوو شەهید نەبێت.

---

(١) رواه البخاري (٣٦٧٥)، وأبو داود (٤٦٥١)، والترمذي (٣٦٩٧)، والنسائي في "الكبرى" (٣٠٦/٧)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٨٦٥)، وأحمد في "المسند" (١٢١٠٦)، وفي "فضائل الصحابة" (٢٤٦)، والبزار في "المسند" (٧٠٩٤)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٩٦٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (١٤٣٧)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٩٠١).

**لێرەدا هەواڵ بە شەهیدبوونی خەلیفە (عومەر و عوسمان) دەدات.**

**٢.** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ لَمَّا نَفَرَ مِنْ مِنًى، أَنَاخَ بِالأَبْطَحِ، ثُمَّ كَوَّمَ كُومَةً مِنَ الْبَطْحَاءِ، فَأَلْقَى عَلَيْهَا طَرْفَ رِدَائِهِ، ثُمَّ اسْتَلْقَى وَرَفَعَ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ قَالَ: «**اللَّهُمَّ، كَبِرَتْ سِنِّي، وَضَعُفَتْ قُوَّتِي، وَانْتَشَرَتْ رَعِيَّتِي، فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مُضَيِّعٍ وَلا مُفَرِّطٍ**»[(١)].

قَالَ عُمَرُ ﷺ: «**اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**»[(٢)].

قَالَتْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: قُلْتُ: وَأَنَّى يَكُونُ هَذَا؟ قَالَ: «**يَأْتِي بِهِ اللهُ إِذَا شَاءَ**»[(٣)].

قَالَ سَعِيدُ بْن الْمُسَيِّب رَحِمَهُ اللهُ: «**فَمَا انْسَلَخَ ذُو الْحِجَّةِ حَتَّى طُعِنَ فَمَاتَ**»[(٤)].

**واتە: (سەعیدی کوڕی موسەییب) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: کاتێك خەلیفە (عومەری کوڕی خەتتاب) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە حەج گەڕایەوە، لە تەختایی مەککە تەپۆڵکەیەکی بچکۆلە لە لمی خڕ کردەوە و چمکێکی سەرشانەکەی دا بەسەردا و ڕاکشا و سەری خستە سەری و دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی: خوای پەروەردگار تەمەنم زۆر بووە و هێزی لاشەم کەم بووە و میللەتەکەم زۆر و بەربڵاو بووە، خوای پەروەردگار بمگێڕەوە بۆ لای خۆت، بەبێ لەدەستدانی کارێکم و کەمتەرخەمیم.**

**وە لە دووعاکانیدا فەرمووی: خوای پەروەردگار شەهیدیم پێ ببەخشە لە پێناوی تۆدا و مردنیشم لە شارەکەی پێغەمبەرەکەت ﷺ بێت.**

---

(١) رواه مالك في "الموطأ" (٣٠٤٤)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٣/ ٨٧٢)، والفاكهي في "أخبار مكة" (١٨٣١)، وابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٩٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٥٤)، وابن سعد في "الطبقات" (٣/ ٢٥٥)، والخطيب البغدادي في "تأريخ بغداد" (٦/ ١٢٦)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٤٤/ ٣٩٦)، وابن الأثير في "أسد الغابة" (٤/ ١٥٦)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٢/ ١٥٣)، و "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٤١٣).

(٢) رواه البخاري (١٨٩٠)، وابن كثير في "مسند الفاروق" (١/ ٥٣٣)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٤٤/ ٤٠٥)، والنووي في "تهذيب الأسماء" (٢/ ٩)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٢/ ١٥٣)، و "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٤١٤).

(٣) رواه ابن الجوزي في "المناقب" ص٢١٢، وابن سعد في "الطبقات" (٣/ ٢٥٥)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٣/ ٨٧٢)، والطبراني في "الأوسط" (٢٧٩٥)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٥٣)، وأبو القاسم في "سير السلف" ص١٤٣.

(٤) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤١٣)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢/ ١٥٣).

(حەفسە)ی کچی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وتی: چۆن شتی وا دەبێت؟ (واتە: بێبڕوا نەماوە لە مەدینە)، ئەویش فەرمووی: گەر خوا ویستی لێبێت دەبێت.

(سەعیدی کوڕی موسەییب) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: مانگی (ذُوالحِجَّة) کە سەرەتای تێپەڕبوونی حەجەکەی بوو، ئەو مانگە تێپەڕ نەبوو تاوەکوو (أبو لؤلؤة المجوسي) «**طُعِنَ عُمَرُ بِخِنْجَرٍ لَهُ رَأْسَانِ**»[(١)].

واتە: بە خەنجەرێکی دووسەر لە نوێژی بەیانیدا خەلیفە (عومەر)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ شەهید کرد و وادەکە و دووعاکەی پێغەمبەر ﷺ قبووڵ بوو و هاتە دی.

## - هەواڵی شەهیدکردنی (عثمان بن عفان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ:

**٣.** عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ حَائِطًا لِلأَنْصَارِ فَقَضَى حَاجَتَهُ، فَقَالَ لِي: «**يَا أَبَا مُوسَى أَمْلِكْ عَلَيَّ البَابَ فَلَا يَدْخُلَنَّ عَلَيَّ أَحَدٌ إِلَّا بِإِذْنٍ**». فَجَاءَ رَجُلٌ فَضَرَبَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: «**ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ**». فَدَخَلَ وَبَشَّرْتُهُ بِالجَنَّةِ، وَجَاءَ رَجُلٌ آخَرُ فَضَرَبَ البَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا عُمَرُ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: «**افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ**». فَفَتَحْتُ البَابَ وَدَخَلَ وَبَشَّرْتُهُ بِالجَنَّةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ آخَرُ فَضَرَبَ البَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: عُثْمَانُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هَذَا عُثْمَانُ يَسْتَأْذِنُ، قَالَ: «**افْتَحْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ**»[(٢)].

وفي رواية: «**فَحَمِدَ اللهَ، ثُمَّ قَالَ: اللهُ الْمُسْتَعَانُ**»[(٣)]، وفي رواية: «**فَجَعَلَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ صَبْرًا حَتَّى جَلَسَ**»[(٤)].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤١٤)، و "السنن الصغير" للبيهقي (١١٢٦)، و "معرفة السنن والآثار" للطحاوي (٧٤٥٨)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٤٤/ ٤٠٨)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢/ ١٥٣).

(٢) (٣) (٤) رواه البخاري (٣٦٩٣)، والترمذي (٣٧١٠)، والنسائي في "الكبرى" (٨٠٧٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩١٢)، وأحمد في "المسند" (١٩٦٤٣، ١٩٥٠٩)، وفي "فضائل الصحابة" (٢٨٩، ٢٠٧)، والبزار في "المسند" (٣٠٥٤)، وابن أبي شيبة في "تأريخ المدينة" (٣/ ١٠٧٠، ١٠٧٣)، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٥٧)، وابن عساكر في "المعجم" (٩٣٣)، و معمر بن راشد في "الجامع" (٢٠٤٠٢)، والآجري في "الشريعة" (١٤٢٣)، والطبراني في "الكبير" (١٤٥٣٤).

واتە: (أم الفضل)، ئەم ئافرەتە خەوێك دەبینێت و بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: وام بینی وەكوو پارچەیەك لە تۆ بكرێتەوە و خرایە باوەشی منەوە، فەرمووی: خێرت بینیوە، (فاتیمە) إن شاء الله منداڵێكی كوڕی دەبێت، دەكەوێتە باوەشی تۆوە، ئەوە بوو (فاتیمە) ئیمامی (حوسەین)ی بوو، ڕۆژێك خستمە باوەشی پێغەمبەرەوە ﷺ، لە كتوپڕدا ئاوڕم دایەوە بینیم فرمێسك بە چاوەكانی پێغەمبەردا دێتە خوارەوە، وتم: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئێستا (جبریل) عليه السلام هات و هەواڵی پێدام كە گەلەكەم ئەم كوڕەم دەكوژن، وتم: ئەمە؟ فەرمووی: بەڵێ، وە هەندێك لە خۆڵەكەی بۆ هێنام كە سوور بوو، لەسەر ڕووباری فوڕات.

ئەمانە هەمووی ڕووداوانێكن كە لە لایەن خواوە بڕاوەتەوە و تاقیكردنەوەیەكن كە كەس دەسەڵاتی تێدا نییە و هەموو هۆكارەكانیشی بۆ ڕەخساوە.

هەروەك چۆن لە شەڕی بەدردا خوای گەورە هۆكارەكانی درووستبوونی ئەو ڕووداوە باس دەكات، دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٤٤﴾ [الأنفال: ٤٤].

واتە: لە شەڕی بەدردا بە شێوەیەك بێبڕواكانمان پیشان دەدان كە زۆر كەم بن، وە ئێوەشمان لەبەرچاو ئەواندا زۆر كەم پیشان دەدا، بۆ ئەوەی ئەو كارە بێتە دی كە لەمەوپێش خوای گەورە لەسەری نووسیوە.

بۆیە (عبد الله بن مسعود) رضي الله عنه دەڵێت: «قُلِّلُوا فِي أَعْيُنِنَا حَتَّى قُلْتُ لِرَجُلٍ: أَتَرَاهُمْ يَكُونُونَ مِائَةً؟»[1].

---

= وأبو يعلى في "مسنده" (٣٦٣)، وضياء الدين في "المختارة" (٧٥٨)، وقال: إسناده حسن، وابن حجر في "اتحاف المهرة" (١٤٥٥٤)، وفي "تهذيب التهذيب" (٢/ ٣٤٧)، والشاذلي في "كنز العمال" (٣٤٣٢١)، والهيثمي في "غاية المقصد في زوائد المسند" (٣٧٢٠)، وفي "كشف الأستار عن زوائد البزار" (٢٦٤١)، و "مجمع الزوائد" (١٥١١٢)، وفي "أربع مجالس للخطيب البغدادي" (٤٣)، و "إمتاع الأسماع" للمقريزي (١٤/ ١٤٤)، و "الخصائص الكبرى" للسيوطي (٢/ ٢١٤)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٥/ ١٠٢)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ٢١٧)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٤/ ١٨٨)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (١٦/ ٩)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١١٧١).

(١) "تفسير الطبري" (١١/ ٢١٢) في تفسير سورة [الأنفال: آية: ٤٤]. ورواه الطبراني في "الكبير" (١٠٢٦٩)، والبيهقي في "دلائل النبوة" (٣/ ٦٧)، وفي "السيرة النبوية" لابن كثير (٢/ ٤٠٦)، و "الخصائص الكبرى" للسيوطي (١/ ٣٢٨)، =

وفي رواية: «قَالَ: فَأَسَرْنَا رَجُلًا مِنْهُمْ، فَقُلْتُ كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ: أَلْفًا»[(١)].

واتە: بە شێوەیەك كەم بوون لەبەر چاومان تا بە یەكێكم وت: تۆ بلێی بگەنە سەد كەس؟ تاوەكوو پیاوێكمان بە دیل لێ گرتن، وتمان: چەند كەس بوون؟ وتی: هەزار كەس.

وە تەنانەت (أبو جهل) وتی: «وَقَالَ: يَا قَوْمُ لَا تَقْتُلُوهُمْ بِالسِّلَاحِ، وَلَكِنْ خُذُوهُمْ أَخْذًا، فَارْبِطُوهُمْ بِالْحِبَالِ»[(٢)].

واتە: ئەی خەڵكینە هاوەڵانی (محمد) مەكوژن، بەڵكوو بیانگرن و بیانبەستنەوە بە حەبلەكان.

ئەمەی لە ئەوپەڕی بەكەمزانین و بێدەسەڵاتی موسوڵمانانیدا دەوت.

وە لە ئایەتەكانی سەرەتای ئەم باسەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ [الأنفال: ٤٢].

واتە: گەر وادەی دیاریكراو لە نێوانتاندا ببوایە؛ پێچەوانەی وادەكە دەجووڵانەوە، بەڵام ئەم كارە ڕەخسا بەبێ وادەی دیاریكراو، بۆ ئەوەی ئەوەی لە ئەزەلدا بۆی نووسیون بێتە دی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

تەنانەت بە خەویش پیشانی پێغەمبەر ﷺ درا بە ژمارەی كەم، وەكوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٤٣﴾ [الأنفال: ٤٣].

واتە: لە خەودا بە ژمارەی كەم پیشانمان دایت، گەر بە ژمارەی زۆر پیشان بدرایتایە ئەوا هەرەستان دەهێنا و دووبەرەكایەتی دەكەوتە نێوانتانەوە لە بەرامبەر وەستانیاندا، بەڵام خوای پەروەردگار بەم هۆكارەوە پاراستنی و سەلامەتی كردن[(٣)].

بە هەمان شێوە كاتێك دووڕووەكان دەیانەوێت بچن بۆ جیهاد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵاندا، خوای پەروەردگار هۆكارەكانیان بۆ ڕێك ناخات، لەبەر سەرگرتنی كارەكە و پاراستنی

---

= و "البداية والنهاية" لابن كثير (٣/ ٣٢٩).

(١) (٢) "تفسير الطبري" (١١/ ٢١١) في تفسير سورة [الأنفال: آية: ٤٤].

(٣) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٢٢ في تفسير سورة [الأنفال: آية: ٤٣].

لە هەموو هۆکارێکی تێکدان، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَرَادُواْ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُواْ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة: ٤٦ - ٤٧].

واتە: گەر ئەو دووڕووانە بیانویستایە ڕێکبکەون بۆ جیهاد؛ هۆکارەکانیان دەگرتە بەر (لە شەڕی تەبوکدا)، بەڵام هۆکارەکەی ئەوەبوو کە خوای گەورە پێی ناخۆش بوو بەڕێکەون بۆ ئەم جیهادە، بۆیە ڕێگری لێکردن و لاشە قورس و گرانی کردن، لە قەدەرەوە پێیان وترا دانیشن لەگەڵ دانیشتووەکاندا، ئەمەش بە هۆکاری ئەوەی خوای گەورە زانایە بەسەر دووڕوویی و فێڵیان لە موسوڵمانان و ئیسلام، وە گەر بچوونایە زیانیان هەبوو، سوودمەندییان نەدەبوو، هیچیان زیاد نەدەکرد بێجگە لە تێکدان و دووبەرەکایەتی نەبێت لە نێوانتاندا، وە لە نێوانیشتاندا هەبوو گوێڕایەڵییان بکات(١).

وە بۆ دڵنیابوونیان خوای گەورە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە ئەو ڕێگرییەی کە لێی کردن و دەفەرموێت: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُاْ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلْأُمُورَ﴾ [التوبة: ٤٨].

واتە: هەر لەمەوپێشیش پێشینەیەکی شەڕیان هەبوو، مەبەستیان دووبەرەکایەتی بوو، هەموو کارێك و هۆکارێکی بەتاڵکەرەوەی دینەکە دەگرنە بەر(٢).

کەواتە بەم شێوەیە قەدەر و دانانی خوایی هۆکاری تەمەڵکردن و لاشەقورسی دووڕووەکان بووە، بۆ دوورخستنەوەیان لە شەڕی تەبووك، تا وەکوو شەڕی ئوحودی لێنەیەت، کە یەك لەسەر سێی خەڵکیان گێڕایەوە، بووە هۆکاری ئەو ڕووداوانەی کە ڕوویدا.

نموونەی سێیەم وەکوو ئەو چەند هەزار کەسەی کە لە ترسی مردن ڕۆیشتنە دەرەوەی شار: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾﴾ [البقرة: ٢٤٣].

---

(١) "تفسير الطبري" (١١/ ٤٨١) في تفسير سورة [التوبة: آية: ٤٦]، و "تفسير ابن كثير" (٤/ ١٥٩) في تفسير سورة [التوبة: آية: ٤٦].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص٣٣٩ في تفسير سورة [التوبة: آية: ٤٨].

خوای گەورە بەسەرهاتی ئەوانمان بۆ دەگێڕێتەوە: قَالَ ابْنُ عَبَّاس: «كَانُوا أَرْبَعَةَ آلَافٍ خَرَجُوا فِرَارًا مِنَ الطَّاعُونِ»[(١)].

واتە: چوار هەزار کەس بوون، لە ترسی نەخۆشی تاعوون لە شارەکەیان چوونە دەرەوە بۆ ئەوەی سەلامەت بن لە مردن.

بەڵام خۆپاراستن سوودی نییە لە قەدەر، بۆیە کاتێك گەیشتنە شوێنی بەناو سەلامەتی؛ قەدەریان لەوێ بوو، خوای گەورە فەرمانی دا بە مردنیان[(٢)].

ویستیان بە هۆکارەکان بەرەنگاری لە قەدەر بکەن کە مردنە، نەیانزانی قەدەری مردنەکەیان لەو شوێنەیە کە بە باش و سەلامەتی دەزانن و بۆی دەڕۆن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾﴾ [التغابن: ١١].

واتە: هەر بەڵایەك تووشی هەرکەسێك بێت (قال ابن عباس: قدره ومشيئته)، بە قەدەر و دانان و ویستی خوایە، وە گەر ئیمان و باوەڕ و ویستی وابێت ئەمە لای خواوەیە و ڕازی بێت پێی؛ هیدایەتی دڵی دراوە بەوەی (قَالَ ابْنُ عَبَّاس: فَيَعْلَمْ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ) باوەڕی وایە ئەوەی تووش بووە بە هەڵە تووشی نەبووە، وە ئەوەیشی تووشی نەبووە دانراوە کە تووشی نەبێت[(٣)].

وە بۆ یەکلاکردنەوەی هەمووی دەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾﴾ [الحديد: ٢٢].

واتە: ئەی خەڵکینە ئەوەی کە تووشتان دەبێت لەسەر زەوی لە گرانی و تێکچوون و ... یاخود لە خۆتاندا بە نەخۆشی و هیلاکی و ... هەمووی لە (اللوح المحفوظ)دا نووسراوە، پێش

(١) "تفسير الطبري" (٤/ ٤١٤) في تفسير سورة [البقرة: آية: ٢٤٣]، و "تفسير ابن كثير" (١/ ٦٦١)، ورواه الحاكم في "المستدرك" (٣١١٣)، وفي "مختصر تلخيص الذهبي" (٢٩٣).

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص١٠٦ في تفسير سورة [البقرة: آية: ٢٤٣].

(٣) "تفسير ابن كثير" (٢٣/ ١٢) في تفسير سورة [التغابن: آية: ١١].

ئەوەی دروست بکرێن: قَالَ ابْنُ عَبَّاس: «هُوَ شَيْءٌ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَ النَّفْسَ»[(١)].

هۆکاری ئەم قەدەر و دانانەش تاقیکردنەوەی موسوڵمانان و ئادەمیزادە بە گشتی، وەکوو باسی یەکێك لە هۆکارەکانی شکستی و نارەحەتییەکانی شەڕی ئوحود دەکات و دەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ﴾ [آل عِمران: ١٧٩].

واتە: لە حیکمەت و دانایی خوایی نییە ئیمانداران بەو شێوە تێکەڵییە بهێڵێتەوە، تاوەکوو جیایان نەکاتەوە لە یەکتری، ئیماندار لە دووڕوو، ڕاستگۆ لە درۆزن، وە لە داناییشی نییە ئاگادارتان بکاتەوە بەسەر غەیبدا بۆ ناسینی بەندەکانی، بە جۆرەها بەڵا و تاقیکردنەوە[(٢)].

ئاگادارمان دەکاتەوە کە سوننەت و کاری خوا وەکوو کاری بەندەکانی نییە، کە هەرکەسێك موسوڵمان بێت ئیتر هەموو خوێندنەوە و حسابێکی موسوڵمانانەی بۆ بکرێت و پێویستی بە تاقیکردنەوە نەبێت، بەڵکوو هەموو تاقیکردنەوەیەکی دێنێتە ڕێ، تاوەکوو پاك و پیس لە یەك جیابێتەوە، ئەمە یەکێکە لە قەدەرە کەونییەکانی خوا ﷻ بەرامبەر بەندەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ [الأعراف: ٥٤].

واتە: موڵکی خوایە درووستکراوەکانی و هەر لای ئەویشە کاری بەڕێوەبردنیان.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ [الإنسان: ٣٠]

واتە: هیچ ویست و ئیرادەیەك نییە بێجگە لە ویست و ئیرادەی خوا نەبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ»[(٣)].

---

(١) "تفسير الطبري" (٢٢/٤١٨) في تفسير سورة [الحديد: آية: ٢٢].

(٢) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص١٥٨ في تفسير سورة [البقرة: آية: ١٧٩].

(٣) رواه الترمذي (٢٥١٦)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وأحمد في "المسند" (٢٦٦٩)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، ورواه الفريابي في "القدر" (١٥٨)، وضياء الدين في "المختارة" (١٢)، وابن بطة في =

واتە: بزانە گەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە لەسەر ئەوەی سوودێك بە تۆ بگەیەنن، ناتوانن پێت بگەیەنن، مەگەر شتێك نەبێت کە خوای گەورە بۆتی نووسیبێت، وە گەر کۆیش ببنەوە لەسەر ئەوەی زیانێك بە تۆ بگەیەنن، ناتوانن پێت بگەیەنن، مەگەر شتێك نەبێت کە خوا لەسەرتی نووسیوە، قەڵەم هەڵگیراوە و لاپەڕە ووشك بووەتەوە.

بۆیە خوای پەروەردگار فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا﴾ [التوبة: ٥١].

واتە: ئەی (محمد ﷺ) پێیان بڵێ هیچ کارێك نییە تووشی ئێمە ببێت بێجگە لەوەی کە لەسەرمان نووسرابێت، هەر ئەوە سەرخەر و پارێزەری ئێمە[1].

لەژێر ڕۆشنایی ئەم زانستییە خواییەدا، ڕوون و ئاشکرایە کە هەرچییەك بەسەر هاوەڵاندا هاتووە؛ لەم چوارچێوەیە دەرناچێت، خۆی دانا و زانایە بەسەر بەندەکانیدا و پلەوپایە دەبەخشێت بە بەندەکانی بە جۆرەها هۆکاری جیاواز، کە تێگەیشتنی سادە و ساکاری بەندەکان ناتوانێت هەڵسەنگاندن و دەرکی پێ بکات، هەموو بوونەوەر دەستەوەستانە لە ئاستی هۆکار و ڕووداوەکاندا.

بۆیە دەبینین (عائیشە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا لە باسەکەی خەلیفە (عوسمان)دا رضي الله عنه کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەماڵەکەیدا پێ دەدات؛ پێی دەڵێن: بۆ ئەمەت باس نەکردووە لە کاتی ڕووداوەکەیدا؟ دەڵێت: «نُسِيتُهُ» لەبیرم برایەوە، وە هەروەها (زبیر بن العوام) رضي الله عنه کاتێك خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) رضي الله عنه بیری دەخاتەوە، دەڵێت: «أُنْسِيْتُهُ»، لەبیرم برایەوە، ئەمە هەمان هۆکاری ڕووداوەکەی پێغەمبەر (یوسف)ە عليه السلام، کە خوای گەورە شەیتانی کردە هۆکاری لەبیربردنەوەی، تاوەکوو ئەو ماوەیە لە بەندیدا بباتە سەر، وەکوو دەفەرموێت: ﴿فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِى ٱلسِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾﴾ [يوسف: ٤٢].

---

= "الإبانة" (١٥٠٨)، وأبو يعلى في "مسنده" (٢٥٥٦)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٠٩٥)، والآجري في "الشريعة" (٤١٣)، وابن الأثير في "أسد الغابة" (٣/ ٢٩١)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٥٣٠٢)، وفي "ظلال الجنة" (٣١٦).

(١) "تفسير البغوي" (٢/ ٣٥٦) في تفسير سورة [التوبة: آية: ٥١].

وە هەرچی هۆکاریش هەیە بۆ گرتنەبەری ڕوونەدانی کارەکە سوودی نییە، وەکوو پێغەمبەر (یەعقوب) ﷺ ئامۆژگاری کوڕەکانی دەکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ٦٧ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ﴾ [يوسف: ٦٧، ٦٨].

واتە: کوڕەکانم لە یەك دەرگاوە مەچنە ژوورەوە ... کاتێك بەو شێوەیە چوونە ژوورەوە کە باوکیان پێیانی ڕاگەیاندبوو؛ نەبووە هۆکاری ئەوەی لە قەدەرەکانی خوا پارێزراو بن، بەڵکوو ئەمە پێویستی و حەزێکی (یەعقوب) خۆی بووە، تاوەکوو بە شێوەی هۆکار بیگرێتە بەر، واتە هۆکارەکانیش زۆر جار هیچ کاریگەرییەکیان نییە.

وەکوو (ابن تیمیة) ﷺ دەڵێت: «وَالْفِتْنَةُ إِذَا وَقَعَتْ عَجَزَ الْعُقَلَاءُ فِيهَا عَنْ دَفْعِ السُّفَهَاءِ، فَصَارَ الْأَكَابِرُ عَاجِزِينَ عَنْ إِطْفَاءِ الْفِتْنَةِ وَكَفِّ أَهْلِهَا، وَهَذَا شَأْنُ الْفِتَنِ»[1].

واتە: گەر فیتنە و بەڵا کەوتەوە؛ عاقڵەکان دەستەوەستان دەبن لە ڕێگری خراپەکاراندا و بێتوانا دەبن لە کوژاندنەوەی فیتنەکە و دوورخستنەوەی کەسانی لێی، ئەمە سروشتی هەموو فیتنەیەکە.

ڕەنگە هەر ئەوەندە بکرێت خۆیان ون کەن و دوورەپەرێز بن، وەکوو (ابن سیرین) ﷺ دەڵێت: «هَاجَتِ الْفِتْنَةُ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةُ آلَافٍ، فَمَا حَضَرَهَا مِنْهُمْ مِائَةٌ، بَلْ لَمْ يَبْلُغُوا ثَلَاثِينَ»[2].

واتە: کاتێك فیتنە ڕووی کردە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ؛ ژمارەی هاوەڵان ﷺ لەو کاتەدا دە هەزار کەس دەبوون، لەو ژمارەیە سەد کەسیان ئامادەی فیتنەکە نەبوون، بەڵکوو نەگەیشتە سی کەسیش.

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٤/ ٣٤٣).

(٢) "العلل ومعرفة الرجال" لأحمد بن حنبل (٣/ ١٨٢) برقم (٤٧٨٧)، و "تأريخ المدينة" لابن أبي شيبة (٤/ ١٢٧١)، و "السنة" لأبي بكر بن الخلال (٧٢٨)، و "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٦/ ٢٣٦).

(ابن تيمية) ﷺ دەڵێت: «خِيَارَ الْمُسْلِمِينَ لَمْ يَدْخُلْ وَاحِدٌ مِنْهُمْ فِي دَمِ عُثْمَانَ لَا قَتَلَ وَلَا أَمَرَ بِقَتْلِهِ، وَإِنَّمَا قَتَلَهُ طَائِفَةٌ مِنَ الْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ مِنْ أَوْبَاشِ الْقَبَائِلِ وَأَهْلِ الْفِتَنِ»(١).

واتە: پیاوە ساڵحەکانی هاوەڵان و ناوداران هیچ کامیان تێوە نەگلان لە خوێنی خەلیفە (عوسمان)دا بە شێوەی فەرمان و بەشداریکردن، بەڵکوو کۆمەڵێك لە ئاژاوەگێڕان و خراپەکارانی هۆزەکان و فیتنەگێڕان بوون.

بۆیە هاوەڵان خۆشیان دڵنیا بوون لەوەی کە پاکن و بەرین لەو فیتنەیە و قەدەری خوا بالادەست بووە بەسەریاندا، وەکوو (علي بن أبي طالب) ﷺ دەڵێت: «﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١﴾ [الأنبياء: ١٠١]. قَالَ: أَنَا مِنْهُمْ، وَعُمَرُ مِنْهُمْ، وَعُثْمَانُ مِنْهُمْ، وَالزُّبَيْرُ مِنْهُمْ، وَطَلْحَةُ مِنْهُمْ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ مِنْهُمْ، أَوْ قَالَ: سَعْدٌ مِنْهُمْ»(٢).

واتە: ئەو کەسانەی کە هەر لە ئەزەلەوە لە ڕیزی چاکەکاراندا نووسراون؛ دوورن لە ئاگری دۆزەخ، پاشان وتی: من یەکێکم لەوانە، وە هەروەها (عومەر و عوسمان و زوبێر و تەڵحە و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) ﷺ هەموویان لەو کەسانەن.

وَقَالَ الشَّعْبِيُّ ﷺ: «أَدْرَكْتُ خَمْسَ مِئَةٍ أَوْ أَكْثَرَ مِنَ الصَّحَابَةِ يَقُوْلُوْنَ عَلِيٌّ وَعُثْمَانُ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ فِي الجَنَّةِ»(٣).

واتە: ئیمامی (شەعبی) ﷺ دەڵێت: بە خزمەتی پێنج سەد صەحابە یان زیاتر گەیشتووم کە دەیانوت: (عەلی و عوسمان و تەڵحە و زوبێر) ﷺ لە بەهەشتدان، لەگەڵ بوونی ڕووداوەکانی نێوانیان.

وە خۆپاراستن لە قەدەرەکان لە سنووری دیاریکراودایە، ئەگەر بە هۆکار نووسرابێت، وە گەرنا؛ خۆبەدەستەوەدان بۆ قەدەر ڕێگەچارەی کۆتایی کارەکان و عوزرهێنانەوە بۆ خاوەنەکانیان

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٤/ ٣٢٣).

(٢) "تفسير ابن كثير" (٥/ ٣٧٨) في تفسير سورة [الأنبياء: آية: ١٠١]، و "زاد الميسر" (٣/ ٢١٥)، و "تفسير ابن أبي حاتم" (٨/ ٢٤٦٩)، و "الدر المنثور" للسيوطي (٥/ ٦٨١).

(٣) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٣/ ٤٥).

و هەڵگرتنی هەموو باسێکی ئەو بابەتەیە، تا وەکوو دووڕووەکان کار و تێڕوانینمان هەر باس و سەرزەنشت و گلەیی و حەسرەت و دوودڵی نەبێت، وەکوو خوای گەورە لە باسی دووڕووەکاندا دەفەرمویت: ﴿وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾ [آل عمران: ١٥٤].

واتە: کۆمەڵێك لەبەر لاوازی ئیمانیان هەموو خەمێکیان بۆ خۆیان بوو، دەیانوت: کوا ئێمە سەرکەوتن و دەرکەوتنمان پێ دەبەخشرێت؟ ئەمە بە هۆکاری گومانی خراپیان بوو بە خوا، دەیانوت: گەر سەرکەوتن و حەق بەم دینە بوایە لێرەدا نەدەکوژراین، خوای گەورە فەرمووی: ئەی (ﷺ) بڵێ گەر لە ماڵەکانی خۆتاندا بوونایە ئەوانەی لەسەرتان نووسراوە کە دەبێت بکوژرێن؛ دەبوایە دەرکەوتنایە و بهاتنایە بۆ ئەو شوێنەی کە لەسەرتان نووسراوە کە دەبێت تیایدا بکوژرێن، وایان دەزانی بە هۆکارەکان دەپارێزرێن لە قەدەر، بەڵام هۆکار کاتێك سوودی هەیە کە دژایەتی قەدەر نەکات[1].

وا گومانیان دەبرد گەر لە ماڵەوە بوونایە و دوور لەم شەڕە نەدەکوژران و تووشی هیچ شتێك نەدەبوون، بەڵام لە ڕاستیدا هیچکام لەو لێکدانەوە و بۆچوونانە هۆکار و ڕێگەی تێگەیشتنی ووردەکاری کارەکە نییە، بەڵکوو «قَدَّرَ اللهُ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ» دانانی خواییە، وە ئەوەی ویستی لێبێت دەبێت ببێت.

  

(١) "تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان" للسعدي ص١٥٣ في تفسير سورة [آل عمران: آية: ١٥٤].

# ڕووەکانی لێدانی هاوەڵان
## (وجوه الطعن في الصحابة)

گومان نییە لەوەی ژیان لەناو ئادەمیزاددا پڕ لە چەندێتی و چۆنێتییەکی جیاوازە، لە ڕووی ڕێژەی عەقڵەکان و هەوا و ئارەزووەکانەوە، وە لەلایەکی ترەوە پێویستییەکانی ژیان و کاریگەرییەکانی لەسەر ئادەمیزاد و هۆکارەکانی بوونی، ئەمانە هەمووی هۆکار و کاریگەرە لەسەر کەسەکان، وە لە هەمووی گرنگتریش بوونەکان، توخمی زۆر و زاڵبوو کارلێکارە، بۆیە دەستەوەستان و وەستان لە ئاستیدا دروست دەکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾﴾ [الحجرات: ٤]، ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ [البقرة: ١٠٠]، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾﴾ [الأنعام: ١١١]، ﴿أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾﴾ [الأنعام: ٣٧]، ﴿وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾﴾ [التوبة: ٨]، ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ [يوسف: ١٠٦]، ﴿وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ ﴿٨٣﴾﴾ [النحل: ٨٣]، ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾﴾ [الأنبياء: ٢٤]، ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾﴾ [الشعراء: ٨]، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٨﴾﴾ [الزخرف: ٧٨].

بەم شێوەیە زانیمان ڕێژەی زۆری ئادەمییەکان دوور لە ناسینی حەق پەیوەستبوو پێوەن، بەڵکوو ڕقلێبوو و دژایەتیکردن و نەویستن کاری کۆدەنگی هەموانە، بۆیە لە بەرامبەردا ڕێژەی کەم؛ هەڵگر و ویستی حەق و ناسینییەتی، وەکوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾ [سبأ: ١٣]، ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾﴾ [البقرة: ٨٨]، ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾﴾ [النساء: ٤٦]، ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾﴾ [السجدة: ٩]، ﴿بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾﴾ [الفتح: ١٥]، ﴿وَقَلِيلٌ مِّنَ الْآخِرِينَ ﴿١٤﴾﴾ [الواقعة: ١٤]، ﴿قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾﴾ [غافر: ٥٨].

بەم شێوەیە ژمارەی کەم تێگەیشتوو و خاوەن ئیمان و سوپاسگوزار و لەبیری خوا دان، ئەمە سوننەتی کەونی خوایە بۆ دونیا، پێویستە ئەم یاسایە لەبیر نەکرێت لە هەڵسەنگاندن و مامەڵەکردن

لەگەڵ خەڵکی و لە کاری بانگەوازیدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «النَّاسُ كَإِبِلٍ مِائَةٍ، لَا تَكَادُ تَجِدُ فِيهَا رَاحِلَةً»(١).

واتە: خەڵکی وەکوو سەد حوشتر وان، ئەگەر یەکێك لەو سەد حوشترە هەبێت بار باش ببات.

وە دەفەرموێت: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ»(٢).

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە موسوڵمانان لەسەر حەق دەمێننەوە.

وە دەفەرموێت: «لَتَفْتَرِقَنَّ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ»(٣).

واتە: موسوڵمانان دەبنە حەفتاوسێ بەشەوە، هەموویان دەچنە دۆزەخ بێجگە لە یەك کۆمەڵ نەبێت.

کەواتە (طائفة وفرقة) ژمارەیەکی کەم حەقویست و مانەوەن لەسەر حەقەکە.

بەم شێوەیە زانیمان خاوەن حەق و زانست و کاملان ژمارەیان زۆر کەمە لەناو خەڵکیدا، بەڵکوو ژمارەی زۆر و ڕەها ستەمکار و نەزان و بێئاگا لە ڕاست و دروستییەکانن.

لەبەرئەوە دژایەتی پێغەمبەران و زانایان و خواناسە ساڵحەکان لە لایەنی زۆرینەوە کارێکی سرووشتی دونیا بووە، بۆیە هەر لە سەرەتای ئەم دینەوە موشریکەکانی مەککە کاریان ئازار و

---

(١) رواه مسلم (٢٥٤٧)، والترمذي (٢٨٧٢)، وابن ماجه (٣٩٩٠) واللفظ له، وابن حبان في "صحيحه" (٦١٧٢)، وأحمد في "المسند" (٤٥١٦)، والطبراني في "الأوسط" (٣٣٢٧)، وفي "الصغير" (٤١٢)، وفي "مسند الشاميين" (١٧٦٥)، والطيالسي في "مسنده" (٢٠٢٦)، والدولابي في "الكني والأسماء" (١٣٧٠)، والشافعي في "مسنده" (١٩٢)، والحميدي في "مسنده" (٦٧٨)، ومعمر بن راشد في "جامعه" (٢٠٤٤٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٧٧٩٠)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/ ٣٣٤)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٤٦٧).

(٢) رواه البخاري (٧٣١١)، ومسلم (١٩٢٠)، والترمذي (٢٢٢٩)، وأحمد في "المسند" (١٦٩١٢)، والدارمي في "السنن" (٢٤٧٧)، والحاكم في "المستدرك" (٨٣٨٩)، وسعيد بن منصور في "سننه" (٢٣٧٢).

(٣) رواه ابن ماجه (٣٩٩٢)، والطبراني في "الكبير" (١٢٩)، وفي "مسند الشاميين" (٩٨٨)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٦٣)، وفي "الجامع الصحيح للسنن والمسانيد" (٢/ ٣٢٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٤٩٢)، و "صحيح وضعيف سنن ابن ماجه" (٣٩٩٢)، و "الظلال" (٦٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (١٠٨٢).

ڕاونان و ناشرینكردنی هاوەڵان بووە، وە لە مەدینەش بە هەمان شێوە دووڕووەكان و جوولەكەكانی مەدینە كاریان دژایەتیكردن و گەڕان بۆ هەلی لێدانی هاوەڵان بووە، دەیانوت:

﴿وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ﴾ [هُود: ٢٧].

واتە: شوێنكەوتووانی (ﷺ) كەسانی بێ قەدر و سادەن و خاوەنی ڕاوبۆچوون عەقڵ نین.

وە لەپاش ئەو سەردەمەشەوە فیرەقە گومڕاكان، كۆكەرەوەی كاری هەموویان لێدانی هاوەڵان بووە، هەریەكەی بە شێوەیەك، وە بۆ ئەم لێدانە دوو نییەت هەبووە، یەكێكیان كەسانی بناغەدارێژەری فیرەقەكان بووە كە مەبەستیان لێدانی ئیسلام بووە، بەڵام نەیانتوانیوە بە ئاشكرا لە ئیسلام بدەن، ویستوویانە لەو ڕێگەیەوە دژایەتی و ژەهری خۆیان بڕێژن، وەكوو كۆنە مەجووسی و جوولەكە و گاوورەكان، وە لەم دواییەشدا بەناوی توێژینەوەی ڕاست و دروستی باسەكان و بەرگریكردن لە ئیسلام لەو بابەتانەی كراونەتە ڕەخنە و هەڵە بەسەر دینی ئیسلامەوە، وەكوو كێشەكان و ڕووداوەكانی نێوان هاوەڵان، ئەویش لە ڕێگەی ئەو نەقڵە جۆراوجۆر و باسانەی كە لەسەریان كۆكراوەتەوە بەبێ پاڵفتەكردن و خوێندنەوەی وورد بۆی.

### لێدانی هاوەڵان لە دوو ڕێگاوە خۆی دەبینێتەوە:

یەكەم: لە ڕووە زانستییەكەیەوە.

دووەم: لە ڕووە سیاسییەكەیەوە.

لە ڕووە زانستییەكەوە سەرمەشخەڵیان هاوەڵی بەڕێز (أبو هريرة)یە رضي الله عنه، وە لە ڕووە سیاسییەكەوە هاوەڵی ناودار (معاوية بن أبي سفيان)ە رضي الله عنه، لەبەرئەوە پێویست دەكات ڕوونكردنەوەیەك لەسەر ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزە بخەینە ڕوو، ئەگەرچی وەكوو شاعیر دەڵێت:

وَلَسْتَ بِنَاجٍ مِنْ مَقَالَةِ طَاعِنٍ ... وَلَوْ كُنْتَ فِي غَارٍ عَلَى جَبَلٍ وَعْرِ

وَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْجُو مِنَ النَّاسِ سَالِمًا ... وَلَوْ غَابَ عَنهُمْ بَيْنَ أَجْنِحَةِ النَّسْرِ

قَدْ تَنْكُرُ الْعَيْنَ ضَوْءَ الْشَّمْسِ مِنْ رَمَدٍ ... وَيَنْكُرُ الْفَمَّ طَعْمَ الْمَاء مِنْ سَقَمِ (١)

---

(١) "موسوعة الرقائق والآداب" للحمداني ص٢٠٥٨.

واتە: ڕزگاربوونم نییە لـە قسەی تانەدەر، ئەگەر لـە ئەشکەوتیشدا بم بەسەر شاخێکی سەختەوە، کێ هەیە ڕزگاری بێت لـە خەڵکی بە سەلامەتی، گەر لـەنێو باڵی داڵیشدا بە ئاسمانەوە خۆی حەشار بدات، ئەبێت نکوڵی لە تیشکی خۆر بکات چاوێك کە داهاتبێت، وە دەمێکیش نکوڵی لە تامی خواردنێك بکات بە هۆکاری نەخۆشی.

  

# بەشی چوارەم

## هاوەڵی بەڕێز (أَبُو هُرَيْرَةَ) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ

**ناوی:** (عبدالرحمن ی کوڕی صخر بن دوس اليماني) بووە[١]، ناو براوە بە (ئەبو هورەیرە)، وەکوو پرسیار لە خۆی دەکرێت بۆچی وا ناونراویت؟ دەڵێت: «كُنِّيتُ بِأَبِي هُرَيْرَةَ، لأَنِّي وَجَدْتُ هِرَّةً فَحَمَلْتُهَا فِي كُمِّي، فَقِيلَ لِي: أَبُو هُرَيْرَةَ»[٢].

واتە: ناو نرام بە (أبو هريرة)، لەبەرئەوەی پشیلەیەکم دۆزییەوە و بە چمکی جلەکانم هەڵمگرت، پێیان وتم (أبو هريرة)، واتە باوکی پشیلە.

لەسەر دەستی (طفيل بن عمر الدوسي) موسوڵمان بووە، لە ساڵی حەوتی کۆچیدا لەگەڵ (طفيل) و هەشتا ماڵێك کۆچیان کرد لە یەمەنەوە بۆ مەدینە، لە شەوانی شەڕی خەیبەردا گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ و بەشداری ئەو شەڕەیان بۆ دانرا و ئەو کاتە دەڵێت: «قَدِمْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخَيْبَرَ سَنَةَ سَبْعٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ زِدْتُ عَلَى الثَّلَاثِينَ سَنَةً سَنَوَاتٍ»[٣].

واتە: لە ساڵی حەوتدا گەیشتمە پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو کاتەدا لە خەیبەر بوو، من تەمەنم لە سەروو سی ساڵییەوە بووە.

چوار ساڵ هاوەڵێیەتی پێغەمبەری ﷺ کردووە، لە شەڕی خەیبەرەوە کە لە (جُمَادَى الأُولَى)ی ساڵی حەوتی کۆچییە تا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، لە (رَبِيعُ الأَوَّل)ی ساڵی یازدەی کۆچی، کە دەکاتە چوار ساڵ

(١) "جمهرة أنساب العرب" لابن بشر الكلبي ص٣٥٨، و "الاستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٤/ ١٧٦٨)، و "تأريخ ابن خلدون" (٢/ ٢٥٣).

(٢) "أبو هريرة راوية الإسلام" لمحمد عجاج خطيب ص٦٧، و "الاستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٤/ ١٧٦٩)، و "أسد الغابة" لابن الأثير ص٦٧، و "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٧/ ٣٤٩).

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١١)، و "الإستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٤/ ١٧٧١)، و "طبقات الكبرى" لابن سعد (١/ ٣٥٩)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٥٥).

نزیکەی دوو مانگ کەم[١].

پیاوێکی کەمدەست و هەژار بوو، خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، لە نێوان هاوەڵاندا هاتوچۆی دەکرد بۆ فێربوونی قورئان، وە بەرپرسیاری ئەهلی (سوفه) بوو، هەر کارێك پێغەمبەر ﷺ بیویستایە لە ئەهلی سوفه (ئەبو هورەیرە)ی دەنارد بۆ خڕبوونەوە و دابەشکردنی شتومەك بەسەریاندا[٢].

(أَهْلُ الصُّفَّةِ) ئەو کەسانە بوون کە: «كَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مُهَاجِرًا إِلَى الْمَدِينَةِ، وَلَيْسَ لَهُ مَكَانٌ يَأْوِي إِلَيْهِ، فَيُقِيمُ بِالصُّفَّةِ إِلَى أَنْ يَتَيَسَّرَ لَهُ أَهْلٌ أَوْ مَكَانٌ يَأْوِي إِلَيْهِ ثُمَّ يَنْتَقِلُ»[٣]، «فَكَانَتْ فِي مُؤَخَّرِ مَسْجِدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَمَالِيِّ الْمَسْجِدِ بِالْمَدِينَةِ النَّبَوِيَّةِ»[٤].

واتە: ئەو موسوڵمانە کۆچەرییانە بوون کە کاتێك کۆچیان دەکرد شوێن نەبوو تیایدا بژین، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەشی کۆتایی سەرووی مزگەوتەکەدا شوێنی بۆ کردبوونەوە تا کاتێك بارودۆخێکیان بۆ دەڕەخسا، «وَلَمْ يَكُنْ أَهْلُ الصُّفَّةِ نَاسًا بِأَعْيَانِهِمْ يُلَازِمُونَ الصُّفَّةَ بَلْ كَانُوا يَقِلُّونَ تَارَةً وَيَكْثُرُونَ أُخْرَى وَيُقِيمُ الرَّجُلُ بِهَا زَمَانًا ثُمَّ يَنْتَقِلُ»[٥]، «وَنَزَلَهَا أَبُو هُرَيْرَةَ وَغَيْرُهُ»[٦]، «وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ ضُيُوفَ الْإِسْلَامِ يَبْعَثُ إِلَيْهِمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا يَكُونُ عِنْدَهُ فَإِنَّ الْغَالِبَ كَانَ عَلَيْهِمْ الْحَاجَةُ لَا يَقُومُ مَا يَقْدِرُونَ عَلَيْهِ مِنْ الْكَسْبِ بِمَا يَحْتَاجُونَ إِلَيْهِ مِنْ الرِّزْقِ»[٧].

واتە: ئەهلی (سوفه) کەسانێکی دیاریکراو نەبوون کە خاوەنی یەك سیفات و چۆنێتی بن، بەڵکوو ژمارەیان زیادی دەکرد و کەمی دەکرد، ماوەیەك کەسێکی تیادا دەمایەوە و پاشان چۆڵی

(١) "عدالة الصحابة" للشربيني ص٧٧، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٥٨٩).

(٢) "حلية الأولياء" لأبو نعيم (١/ ٣٧٦).

(٣) "الفتاوى الكبرى" لابن تيمية (٢/ ٨١).

(٤) "مجموعة الرسائل والمسائل" لابن تيمية (١/ ٢٧)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٣٨)، و "السيرة النبوية" لعلي محمد الصلابي (٣٠٣).

(٥) "الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان" (١/ ٩)، و "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ١٦٦).

(٦) "مجموعة الرسائل والمسائل" لابن تيمية (١١/ ١٦٦).

(٧) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (١١/ ٤٥).

دەكرد، یەكێك لەوانە (ئەبو هورەیرە) بوو، ئەهلی (سوفە) میوانانی ئیسلام بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ شتێكی شك ببردایە دەینارد بۆیان، زۆری حاڵیان نەبوونی بوو، كارێكی ئەوتۆیان بە دەستەوە نەبوو كە ببێتە هۆكاری ڕزق و ڕۆزییان.

(ئەبو هورەیرە) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ خۆی دەڵێت: «وَكُنْتُ فِي سَبْعِينَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الصُفَّةِ مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ رِدَاء، إِمَّا بُرْدَةٌ، أَوْ كَسَاءٌ قَدْ رَبَطُوْهَا فِي أَعْنَاقِهِمْ»[١].

واتە: من یەكێك بووم لەو حەفتا پیاوەی ئەهلی (سوفە)، كە هەریەكەیان كراسێك یان عابایەكی پێوە بوو گرێیان دابوو لە ملیاندا.

وە دەڵێت: «كَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ أَهْلِ الإِسْلَامِ، إِنْ كُنْتُ لَأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الأَرْضِ مِنَ الجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لَأَشُدُّ الحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الجُوعِ، وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْمًا عَلَى طَرِيقِهِمُ الَّذِي يَخْرُجُونَ مِنْهُ، فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهَّ، مَا سَأَلْتُهُ إِلَّا لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ، ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهَّ، مَا سَأَلْتُهُ إِلَّا لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ فَلَمْ يَفْعَلْ، ثُمَّ مَرَّ بِي أَبُو القَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي، وَعَرَفَ مَا فِي نَفْسِي وَمَا فِي وَجْهِي، ثُمَّ قَالَ: «**يَا أَبَا هِرٍّ**» قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهَّ، قَالَ: «**الحَقْ**» وَمَضَى فَتَبِعْتُهُ، فَدَخَلَ، فَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنَ لِي، فَدَخَلَ، فَوَجَدَ لَبَنًا فِي قَدَحٍ، فَقَالَ: «**مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ؟**» قَالُوا: أَهْدَاهُ لَكَ فُلاَنٌ أَوْ فُلاَنَةُ، قَالَ: «**أَبَا هِرٍّ**» قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهَّ، قَالَ: «**الحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ لِي**» قَالَ: وَأَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ الإِسْلَامِ، لاَ يَأْوُونَ إِلَى أَهْلٍ وَلاَ مَالٍ وَلاَ عَلَى أَحَدٍ، إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئًا، وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ وَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا، فَسَاءَنِي ذَلِكَ، فَقُلْتُ: وَمَا هَذَا اللَّبَنُ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ، كُنْتُ أَحَقُّ أَنَا أَنْ أُصِيبَ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ شَرْبَةً أَتَقَوَّى بِهَا، فَإِذَا جَاءَ أَمَرَنِي، فَكُنْتُ أَنَا أُعْطِيهِمْ، وَمَا عَسَى أَنْ يَبْلُغَنِي مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ طَاعَةِ اللهَّ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بُدٌّ، فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ فَأَقْبَلُوا، فَاسْتَأْذَنُوا فَأَذِنَ لَهُمْ، وَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ مِنَ البَيْتِ، قَالَ: «**يَا أَبَا هِرٍّ**» قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهَّ، قَالَ: «**خُذْ فَأَعْطِهِمْ**» قَالَ:

---

(١) "أبو هريرة راوية الإسلام" لمحمد عجاج خطيب ص٨١.

فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ، فَجَعَلْتُ أُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، فَأُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رَوِيَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، فَأَخَذَ الْقَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، فَنَظَرَ إِلَيَّ فَتَبَسَّمَ، فَقَالَ: «**أَبَا هِرٍّ**» قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: «**بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ**» قُلْتُ: صَدَقْتَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: «**اقْعُدْ فَاشْرَبْ**» فَقَعَدْتُ فَشَرِبْتُ، فَقَالَ: «**اشْرَبْ**» فَشَرِبْتُ، فَمَا زَالَ يَقُولُ: «**اشْرَبْ**» حَتَّى قُلْتُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ، مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكًا، قَالَ: «**فَأَرِنِي**» فَأَعْطَيْتُهُ الْقَدَحَ، فَحَمِدَ اللهَ وَسَمَّى وَشَرِبَ الْفَضْلَةَ»(١).

**واتە: ئەهلی (سوفە) میوانەکانی ئیسلام بوون، ماڵ و حاڵیان نەبوو، سوێند بە خوا خۆم دەکوتا بە زەویدا لەتاو ئازاری برسییەتی و بەردم دەبەست بە سکمەوە، ڕۆژێك لەسەر ڕێگای هاتنەدەرەوەیان لە مزگەوت وەستام، (ئەبو بەکر) تێپەڕ بوو، پرسیارم لە ئایەتێکی قورئان لێکرد، مەبەستم پرسیار نەبوو، بەڵکوو بۆ ئەوەی بمباتەوە بۆ ماڵەوە، نەیبردمەوە، پاشان (عومەر) هات بە هەمان شێوە پرسیارەکەم لێکرد بۆ ئەوەی بمباتەوە، ئەویش تێپەڕ بوو و نەیبردمەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ بوو، لەگەڵ منی بینی پێکەنی و فەرمووی: (ئەبو هورەیرە)، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: لەگەڵم وەرە، شوێنی کەوتم تا گەیشتمە ماڵەوە، ئیزنی دام چوومە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ جامۆڵکەیەك شیری بینی، فەرمووی: ئەم شیرەتان لەکوێ بوو؟ وتیان: فلان کەس بۆی ناردووین، فەرمووی: (ئەبو هورەیرە) بڕۆ ئەهلی (سوفە)م بۆ بانگ بکە، ئەهلی (سوفە) میوانانی ئیسلام بوون، پێغەمبەر ﷺ گەر شتێکی بۆ بهاتایە لە خێر و خێرات لێی نەدەخوارد، دەینارد بۆ ئەهلی (سوفە)، وە گەر دیاری و بەخشین بوایە بەشداری تێدا دەکرد و دەیبەخشی بە ئەهلی (سوفە)، منیش کاتێك ناردمی بە دوایاندا پێم ناخۆش بوو، دەموت: ئەم جامۆڵکە شیرە چییە تا بیگەڕێنم بەسەر ئەهلی (سوفە)دا و بەشی من بمێنێتەوە، بەڵام خۆ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ هیچ لێدەرچوونێکی تێدا نییە، ڕۆیشتم بەدوایاندا و هاتن و هەریەکەی لە شوێنی خۆی**

(١) رواه البخاري (٦٤٥٢)، والترمذي (٢٤٧٧)، والنسائي في "الكبرى" (١١٨٠٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٥٣٥)، وأحمد في "المسند" (١٠٦٧٩)، والحاكم في "المستدرك" (٤٢٩١)، والبيهقي في "الشعب" (٩٨٤١)، وفي "السنن الكبرى" (٤٣٣٩)، والآجري في "الشريعة" (١٠٦١).

دانیشت، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەبو هورەیرە) ئەو جامە هەڵگرەو پێیان بدە، منیش یەکە یەکە بەسەریاندا گەڕاندم تا هەموویان تێر بوون، گەیشتمەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەویش جامەکەی خستە سەر دەستی و سەری هەڵبڕی و پێکەنی و فەرمووی: (ئەبو هورەیرە) بخۆ، منیش خواردم، پاشان تێی کردەوە و فەرمووی: بخۆ، بەم شێوەیە بەردەوام خواردم، تاوەکوو وتم: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئیتر شوێنی نابێتەوە تا بخۆم، پاشان جامەکەی وەرگرت و سوپاسی خوای کرد و ئەویش خواردییەوە.

وە دەڵێت: «وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَنِّي لَأَخِرُّ فِيمَا بَيْنَ مَنْزِلِ عَائِشَةَ وَبَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَغْشِيًّا عَلَيَّ مِنَ الْجُوعِ، ...»(١).

واتە: دەبینرا من دەکەوتم لە نێوان ژوورەکەی (عائیشە)و مینبەرەکەی پێغەمبەردا ﷺ لەتاو برسییەتی.

(ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه دایکیشی بەهۆی ئەوەوە موسوڵمان بوو، هەروەکوو خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: «كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الْإِسْلَامِ فَتَأْبَى عَلَيَّ، فَدَعَوْتُهَا الْيَوْمَ فَأَسْمَعَتْنِي فِيكَ مَا أَكْرَهُ، فَادْعُ اللهَ أَنْ يَهْدِيَ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «اللهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ» فَخَرَجْتُ مُسْتَبْشِرًا بِدَعْوَةِ نَبِيِّ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا جِئْتُ فَصِرْتُ إِلَى الْبَابِ، فَإِذَا هُوَ مُجَافٌ، فَسَمِعَتْ أُمِّي خَشْفَ قَدَمَيَّ، فَقَالَتْ: مَكَانَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ وَسَمِعْتُ خَضْخَضَةَ الْمَاءِ، قَالَ: فَاغْتَسَلَتْ وَلَبِسَتْ دِرْعَهَا وَعَجِلَتْ عَنْ خِمَارِهَا، فَفَتَحَتِ الْبَابَ، ثُمَّ قَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، قَالَ فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَتَيْتُهُ وَأَنَا أَبْكِي مِنَ الْفَرَحِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَبْشِرْ قَدِ اسْتَجَابَ اللهُ دَعْوَتَكَ وَهَدَى أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ خَيْرًا، قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ادْعُ اللهَ أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيُحَبِّبَهُمْ إِلَيْنَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «اللهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هَذَا – يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ – وَأُمَّهُ إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِمِ الْمُؤْمِنِينَ»،

---

(١) رواه البخاري (٧٣٢٤)، والبيهقي في "الشعب" (١٠٢٠٦) واللفظ له، وأبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٧٩).

فَمَا خُلِقَ مُؤْمِنٌ يَسْمَعُ بِي وَلَا يَرَانِي إِلَّا أَحَبَّنِي»[(١)].

واتە: دایکمم بانگەواز دەکرد بۆ ئیسلام هێشتا هەر بێبڕوا بوو، ڕۆژێك داوام لێکرد موسوڵمان بێت، قسەیەکی بە پێغەمبەر ﷺ وت، زۆرم پێ ناخۆش بوو، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە گریانەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی دایکمم کردووە بەڵام قسەیەکی بە تۆ وتووە پێم ناخۆش بووە، دووعام بۆ بکە خوای گەورە هیدایەتی بدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە هیدایەتی دایکی (ئەبو هورەیرە) بدەی، ڕۆیشتم موژدە بدەم بە دایکم بە دووعاکەی پێغەمبەر ﷺ، گەیشتمە بەردەم دەرگاکەمان، سەیرم کرد دەرگا داخراوە، کە دایکم گوێی لە تەقەی پێڵاوەکانم بوو وتی: (ئەبو هورەیرە) لە شوێنی خۆت بووەستە، گوێم لە خوڕەی ئاو بوو، پاش ئەوەی خۆی شۆرد و کراسەکەی لەبەرکرد و سەرپۆشی دادایەوە دەرگاکەی کردەوە، وتی: «أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، منیش گەڕامەوە لە خۆشیدا دەگریام و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەت لێبێت خوای گەورە دووعاکەی لێ وەرگرتیت دایکم موسوڵمان بوو، پێغەمبەر ﷺ سوپاسی خوای کرد و وەسف و سەنای کرد و قسەی خێری کرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووعام بۆ بکە کە خۆم و دایکم خۆشەویست بین لای موسوڵمانان و موسوڵمانانیش لای ئێمە خۆشەویست بن، فەرمووی: خوایە ئەم بەندەیەی خۆت و دایکی خۆشەویست بکەی لای موسوڵمانان، وە موسوڵمانانیش لای ئەمان خۆشەویست بن، هیچ ئیماندارێك نییە خوا دروستی کردبێت ناوی منی بیستبێت و نەشیبینیبێتم ئیلا خۆشی ویستووم.

ئەم دووعایەی پێغەمبەر ﷺ بووە بە هێما و بەرنامەکاری ئەهلی سوننە، ئەوەی (ئەبو هورەیرە)ی خۆش بوێت نیشانەی ئیمانداری تەواو و شوێنکەوتەی فەرموودە و ڕێڕەوی هاوەڵانە، وە بە پێچەوانەشەوە ناتەواوی ئیمان و پەیوەستنەبوونە بە دینەوە و دژایەتی فەرموودە و بەرنامە و دینی هاوەڵان کاریەتی، بەمە دەبێتە بیدعەکار و خاوەن هەواو ئارەزوو و گومڕا لە دیندا، وەکوو ڕافیزە و خەوارج و قورئانییەکان و عەقلانییەکان ... کە هەموویان لە لێدانی هاوەڵاندا یەك بەرنامەن، بەتایبەت ئەو هاوەڵانەی کە دیار و دەرکەوتە و کارامەی کاری دینی بوون، وەکوو (ئەبو هورەیرە) ﵁ لە گێڕانەوەی فەرموودەدا.

---

(١) رواه مسلم (٢٤٩١)، وابن حبان في "صحيحه" (٧١٥٤)، وأحمد في "المسند" (٨٢٥٩)، والحاكم في "المستدرك" (٤٢٤٠)، والبزار في "المسند" (٩٣٨٧)، والطبراني في "الكبير" (٧٦).

(محمد بن سيرين) رحمه الله دەڵێت: «كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ لَيْلَةً، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي هُرَيْرَةَ، وَلِأُمِّي، وَلِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُمَا قَالَ لِي مُحَمَّدٌ: فَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُ لَهُمَا حَتَّى نَدْخُلَ فِي دَعْوَةِ أَبِي هُرَيْرَةَ»[(١)].

واتە: شەوێك لای (ئەبو هورەیرە) بووین، دووعای کرد وتی: خوایە لە (ئەبو هورەیرە) و دایکی خۆش بیت و لەو کەسەیشی کە داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات، (محمدی کوڕی سیرین) دەڵێت: ئێمەش دووعای لێخۆشبوونمان بۆ دەکردن بۆ ئەوەی بکەوینە بەر دووعاکەی (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه.

(ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه گەر تێپەڕ بوایە بە لای دایکیدا دەوەستا و دەیوت: عن أبي مُرَّةَ؛ مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ ابْنَةِ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَكِبَ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ إِلَى أَرْضِهِ بـ (العقيق) فَإِذَا دَخَلَ أَرْضَهُ صَاحَ بِأَعْلَى صوته: «السَّلَامُ عَلَيْكِ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ يَا أُمَّتَاهُ! تَقُولُ: وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ. يَقُولُ: رَحِمَكِ اللهُ كَمَا رَبَّيْتِنِي صَغِيرًا. فَتَقُولُ: يَا بُنَيَّ! وَأَنْتَ. فَجَزَاكَ اللهُ خَيْرًا وَرَضِيَ عَنْكَ، كَمَا بَرَرْتَنِي كَبِيرًا»[(٢)].

واتە: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێبێت ئەی دایکە، ئەویش دەیوت: لەسەر تۆش بێت ئەی کوڕم ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، (ئەبو هورەیرە) دەیوت: بەر ڕەحەتی خوا بکەویت کە بە منداڵی منت گەورە کردووە، ئەویش دەیوت: تۆش بەر ڕەحمەتی خوا بکەویت وا بە گەورەیی لەگەڵم باشیت.

وە تەنانەت هەر خزمەتی دەکرد و حەجیشی نەکرد تاوەکوو دایکی وەفاتی کرد[(٣)].

(ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه بە ڕۆژ زیکر و یادی خوای زۆر دەکرد، تەنانەت هەموو ڕۆژێك «يُسَبِّحُ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أَلْفَ تَسْبِيحَةٍ، وَيَقُولُ: أُسَبِّحُ بِقَدْرِ ذَنْبِي»[(٤)].

---

(١) رواه البخاري في "الأدب المفرد" ص٢٨ برقم (٣٧)، وقال الألباني: صحيح الإسناد.

(٢) رواه البخاري في "الأدب المفرد" ص١٠ برقم (١٥)، وقال الألباني: حسن الإسناد.

(٣) "طبقات ابن سعد" (٤/ ٥٥٨٢).

(٤) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤٣٩)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٢/ ١١٢)، و "المنتظم في تأريخ الملوك والأمم" لابن الجوزي (٥/ ٣١٥)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ٣٥٥)، و "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٧/ ٣٦٠).

واتە: دوانزەهەزار جار تەسبیحاتی خوای دەکرد و دەیوت: زیکر و یادی خوا دەکەم بەگوێرەی تاوانەکانم.

(ابن رجب) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «وكان أبو هريرة يسبح كل يوم اثني عشر ألف تسبيحة بقدر ديته يفتك بذلك نفسه»(١).

واتە: ئەو ژمارە تەسبیحاتەی بەگوێرەی نرخی خوێنەکەی خۆی بووە، واتە خوێنی کەسێك لەو ڕۆژەدا دوانزەهەزار درهەم بووە، ئەمیش لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾ [التوبة: ١١١]. خوای پەروەردگار نەفسی ئیمانداران دەکڕێتەوە بە بەهەشت، ڕۆژانە دوانزەهەزار تەسبیحاتی دەکرد.

لە خزمەتکردنی میوانیشدا: قَالَ الطُّفَاوِيّ: «نَزَلْتُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ بِالْمَدِيْنَةِ سِتَّةَ أَشْهُرٍ، فَلَمْ أَرَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُوْلِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً أَشَدَّ تَشْمِيْراً، وَلاَ أَقْوَمَ عَلَى ضَيْفٍ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ»(٢).

واتە: (الطِّفَاوِيّ) دەڵێت: شەش مانگ لای (ئەبو هوڕەیرە) بووم لە مەدینە، نەمبینی هیچ کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گورجوگۆڵ و خزمەتی میوان بکات بە ئەندازەی (ئەبو هوڕیرە).

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّهُ مَرَّ بِقَوْمٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ شَاةٌ مَصْلِيَّةٌ، فَدَعَوْهُ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ، وَقَالَ: «خَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الدُّنْيَا وَلَمْ يَشْبَعْ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ»(٣).

واتە: (ئەبو هوڕەیرە) رضي الله عنه بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی کە مەڕی برژاویان لەبەردەستدا بوو،

---

(١) "لطائف المعارف" لابن رجب الحنبلي ص٢٨٥.

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤٢٨)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢/ ٣٣٦)، وهو في "المسند" للإمام أحمد برقم (١٠٩٧٧)، وفي "التأريخ الكبير" لأبي خيثمة (١/ ٤٩٣)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٢٧)، و "تذكرة الحفاظ" للذهبي (١/ ٣٠)، و "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٧/ ٣٥٥)، ورواه أبو داود في "سننه" برقم (٢١٧٤)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٤٠٩٨).

(٣) رواه البخاري (٥٤١٤)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٥٢٧٠).

بانگیان کرد و ئەویش نەیخوارد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تا لە دونیا دەرچوو سکی تێر نەبوو لە نانی جۆ.

(ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه دەیوت: «نَشَأْتُ يَتِيمًا، وَهَاجَرْتُ مِسْكِينًا، وَكُنْتُ أَجِيرًا لِابْنَةِ غَزْوَانَ بِطَعَامِ بَطْنِي، فَزَوَّجَنِيهَا اللهُ»[(١)].

واتە: بە هەتیوی گەورە بووم، کۆچم کردووە بە هەژاری، کرێکاری (بسرة ی کچی غەزوان) بووم لە بەر خواردنی سکم، خوای گەورە کارێکی کرد بووە خێزانم.

عَنْ مُضَارِبِ بْنِ حَزْنٍ، قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَسِيرُ مِنَ اللَّيْلِ إِذَا رَجُلٌ يُكَبِّرُ، فَأَلْحَقْتُهُ بَعِيرِي، قُلْتُ: مَنْ هَذَا الْمُكَبِّرُ؟ قَالَ: «أَبُو هُرَيْرَةَ»، قُلْتُ: مَا هَذَا التَّكْبِيرُ؟ قَالَ: «شُكْرًا»، قُلْتُ: عَلَى مَهْ؟ قَالَ: «عَلَى أَنِّي كُنْتُ أَجِيرًا لِبُسْرَةَ بِنْتِ غَزْوَانَ بعُقْبَةِ رِجْلِي، وَطَعَامِ بَطْنِي، فَكَانَ الْقَوْمُ إِذَا رَكِبُوا، سُقْتُ لَهُمْ، وَإِذَا نَزَلُوا خَدَمْتُهُمْ، فَزَوَّجَنِيهَا اللهُ فَهِيَ امْرَأَتِي الْيَوْمَ»[(٢)].

واتە: (مضارب) دەڵێت: شەوێك دەڕۆیشتم، گوێم لێبوو پیاوێك (أَللّٰه أكبر)ی دەکرد، وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: (ئەبو هورەیرە)، وتم: ئەی ئەم (أَللّٰه أكبر)ە چییە؟ وتی: سوپاسگوزاری خوایە، وتم: بۆ؟ وتی: لەبەرئەوەی من کرێکاری (بسرة ی کچی غەزوان) بووم خوای گەورە کردییە خێزانم.

لە عیبادەتیشدا: عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، قَالَ: «تَضَيَّفْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ سَبْعًا، وَكَانَ هُوَ وَامْرَأَتُهُ وَخَادِمُهُ يَعْتَقِبُونَ اللَّيْلَ أَثْلَاثًا، يَقُومُ هَذَا وَيَنَامُ هَذَا، وَيَقُومُ هَذَا وَيَنَامُ هَذَا»[(٣)].

---

(١) رواه ابن ماجه (٢٤٤٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والبيهقي في "السنن الكبير" (١١٦٥٥)، وفي "الصغير" (٢١٦٢)، وفي "الشعب" (٤٢٥٦)، وفي "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٨)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٤/ ٢٤٣)، ورواه أبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٧٩)، وفي "معرفة الصحابة" (٤٧٥٩)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٤/ ٣٥٢)، وفي "تذكرة الحفاظ" (١/ ٢٩)، و "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦٢٨).

(٢) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٧١٥٠)، وصححه الألباني، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٦٥)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦١٢)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٦٠).

(٣) رواه البخاري (٥٤٤١)، وأحمد في "المسند" (٨٦٣٣)، واسحاق بن راهويه في "مسنده" (١٣)، والبيهقي في "السنن الصغير" (٨٠١)، وفي "الشعب" (٢٨٢٠)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٢/ ٥٦٠)، و "تذكرة الحفاظ" (١/ ٣١)، و "السير" (٢/ ٦٠٩)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٦٠).

واتە: (ئەبو عوسمانی نەهدی) دەڵێت: میوان بووم لە ماڵی (ئەبو هورەیرە)، شەوی کردبوو بە سێ بەشەوە، بۆ خۆی و خێزانی و خزمەتکارەکەی، هەریەکەی لە بەشێکیدا شەونوێژیان دەکرد.

لە خێرو خێراتیشدا لە کۆتایی تەمەنیدا ماڵێکی هەبوو کردییە خێر و بەخشی بە عەبدەکانی[١].

وە جارێکیان (مەروانی کوڕی حەکەم) ئەمیری مەدینە سەد دیناری نارد بۆ (ئەبو هورەیرە)، بۆ سبەینێ بەردەستەکەی نارد بۆ لای و وتی: پێی بڵێ من هەڵەم کردووە بۆ تۆ نەبووە، (ئەبو هورەیرە) ﷺ وتی: «قَدْ أَخْرَجْتُهَا فَإِذَا خَرَجَ عَطَائِي فَخُذْهَا مِنْهُ»[٢].

واتە: هەموویم کردووە بە خێر، ئەگەر ساڵانەکەمت دەرکرد لێی دەر بکە، (مەروانی کوڕی حەکەم)یش مەبەستی تاقیکردنەوەی (ئەبو هورەیرە) بوو، وە هەر بۆ ئەوی ناردبوو.

## ژیانی زانستی (أَبُوْ هُرَيْرَة) رَضِيَ اللُه عَنْهُ

(ئەبو هورەیرە) ﷺ نزیکەی چوار ساڵ لە مەدینە نەچووە دەرەوە، بێجگە لە جارێك نەبێت، پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی هەشتی کۆچیدا لەگەڵ (الْعَلاءُ بْن الْحَضْرَمِيّ) ناردی بۆ بەحرەین[٣]، ئیتر پاشماوەی تەمەنی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بردە سەر، بەتایبەت ئەو نیشتەجێی ناو مزگەوت بوو لەگەڵ ئەهلی (سوفە)دا، ئامادەی هەموو نوێژە جەماعەتەکان و جومعە و جەژن و بۆنە و ڕووداوەکان بوو، بە شێوەیەك کە ئەو هیچ شتێکی لێ ون نەدەبوو لە کار و کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە بەتایبەت لە فەرموودەکانیدا، وە بۆ خۆیشی لە دەستبەتاڵیدا زۆر تینووی شارەزایی شەرعی بوو، هەوڵدەر بوو بۆ دەرککردن بە ووردەکارییە دینییەکان، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەی دەزانی لە (ئەبو هورەیرە)دا، بۆیە وەڵامی هەموو پرسیارێکی دەدایەوە، وەك دەڵێت: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ القِيَامَةِ؟ فَقَالَ: «لَقَدْ ظَنَنْتُ، يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَنْ لاَ يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ

---

(١) "طبقات ابن سعد" (٤/ ٢/ ٦٣)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤٤٣).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٢٢).

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٢١)، و "طبقات ابن سعد" (٤/ ٧٦).

حِرْصِكَ عَلَى الحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ، خَالِصًا مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ»(١).

واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ زۆر کامەران و بەشی زۆرە لە شەفاعەتی تۆ لە ڕۆژی دواییدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەبو هورەیرە) گومانم برد کە یەکەم کەس پرسیاری ئەم باسەم لێ نەکات تۆ نەبێت، لەبەرئەوەی ئەبینم زۆر هەوڵ ئەدەیت بۆ زیاتر شارەزابوون لەسەر فەرموودەکان، زۆرترین کەس کە بەشی هەبێت لە شەفاعەتمدا لە ڕۆژی دوایی؛ ئەو کەسەیە کە بلێت (لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ) لە ناخی دڵییەوە.

هەروەك پیاوێك بە (ابن عمر)ی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وت: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عُمَرَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الْحَدِيثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: «أُعِيذُكَ بِاللهِ أَنْ تَكُونَ فِي شَكٍّ مِمَّا يَجِيءُ بِهِ، وَلَكِنَّهُ اجْتَرَأَ وَجَبُنَّا»(٢).

واتە: (ئەبو هورەیرە) فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، (ابن عمر) وتی: پەنات ئەدەم بە خوا ئەگەر گومانت هەبێت لەو فەرموودانە، بەڵام ئەو بەتوانا و نەترس بوو، ئێمە ترساین.

وە تەنانەت (ئەبو هورەیرە) ﷺ خۆیشی هەستی بەم نیعمەتە دەکرد و دەیوت: «الْحَمْدُ للهِ الَّذِي هَدَى أَبَا هُرَيْرَةَ لِلإِسْلام، الْحَمْدُ للهِ الَّذِي عَلَّمَ أَبَا هُرَيْرَةَ الْقُرْآنَ، الْحَمْدُ للهِ الَّذِي مَنَّ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ»(٣).

---

(١) رواه البخاري (٩٩، ٦٥٧٠)، والنسائي في "الكبرى" (٥٨١١)، وأحمد في "المسند" (٨٨٥٧)، والبزار في "المسند" (٨٤٦٩)، وابن خزيمة في "التوحيد" (٢/ ٦٩٩)، واللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٠٤٥)، والآجري في "الشريعة" (٧٨٨)، وابن منده في "الإيمان" (٩٠٥)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٨٢٥)، وابن عبد البر في "الجامع" (١٤٠٦)، والبغوي في "شرح السنة" (٤٣٣٦).

(٢) رواه ابن خزيمة في "صحيحه" (١١٢٠)، والحاكم في "المستدرك" (٦١٦٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٨٨٧)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٩)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (١/ ٤٠)، وصححه الألباني في "التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان" (٧١١١)، وفي "سير السلف الصالحين" للأصبهاني ص٥٤١.

(٣) رواه أحمد في "الزهد" ص٢٢٦، وفي "تأريخ الكبير" لأبي خيثمة (١/ ٤٤٥)، و"تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٦٤).

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی (ئەبو هورەیرە)ی دا بۆ ئیسلام، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە (ئەبو هورەیرە)ی فێری قورئان کرد، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منەتێکی گەورەی بەسەردا بەخشیم بە گەیشتنم بە (ﷺ).

(ئەبو هورەیرە) ﵁ دەڵێت: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهَّ، إِنِّي أَسْمَعُ مِنْكَ حَدِيثًا كَثِيرًا أَنْسَاهُ؟ قَالَ: «ابْسُطْ رِدَاءَكَ» فَبَسَطْتُهُ، قَالَ: فَغَرَفَ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «ضُمَّهُ» فَضَمَمْتُهُ، فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا بَعْدَهُ[١].

واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی زۆرت لێ دەبیستم و لەبیرم دەچێتەوە، فەرمووی: عاباکەت ڕابخە، منیش عاباکەم ڕاخست و بە هەردوو دەستی بە شێوەی شت بەتاڵکردن کردییە ناو عاباکەم و فەرمووی: کۆی کەرەوە و بیلکێنە بە سنگتا، منیش لاکانیم هێنایەوە یەك و لکاندم بە سنگمدا، ئیتر لەدوای ئەوەوە هیچم لەبیر نەدەچووەوە.

وە یەکێك لە کارەکانی پیاچوونەوەی فەرموودە بووە، وەك دەڵێت: «جزأت الليل ثلاثة أجزاء: ثلثاً أصلي، وثلثاً أنام، وثلثاً أذاكر فيه حديث رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ»[٢].

واتە: شەوم کردبووە سێ بەشەوە، بەشێکیان نوێژم دەکرد، بەشێکی دەخەوتم و بەشێکی پیاچوونەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرم ﷺ دەکرد.

هەر لە سەردەمی خۆیشیدا بە هۆکاری دووعا و کاری پێغەمبەر ﷺ بۆ لەبیرنەچوونەوەی فەرموودەکان خاوەنی بیر و لەبەرکردنێکی بەهێز بوو، بە شێوەیەك دەرکەوتوو بوو لەناویاندا، وە لە ڕووی هەستکردن بە لێپرساوی دینییەوە لۆمە و بیرخستنەوە دەکرا، بەڵام لە کۆتایی هەموویدا هەموویان دانیان دەنا بەوەی کە هەموو فەرموودەکانی تەواوە و لە دەست و زمانێکی متمانەدایە، وەکوو ئەوەی خوای پەروەردگار ئەم کەسەی دروست کردبێت بەتایبەت بۆ پاراستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و گەیاندنی دینەکەی.

(١) رواه البخاري (١١٩)، وابن عبد البر في "الاستيعاب" (٤/ ١٧٧١).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٣)، و "الجامع" للخطيب (٢/ ٢٦٤).

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: يَقُولُ النَّاسُ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، فَلَقِيتُ رَجُلًا، فَقُلْتُ: بِمَا قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ البَارِحَةَ فِي العَتَمَةِ؟ فَقَالَ: لاَ أَدْرِي؟ فَقُلْتُ: لَمْ تَشْهَدْهَا؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: لَكِنْ أَنَا أَدْرِي «قَرَأَ سُورَةَ كَذَا وَكَذَا»[(١)].

**واته: هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه دەڵێت: خەڵكی دەڵێن (ئەبو هورەیرە) زۆر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، گەیشتم بە یەكێك وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ چی خوێند لە نوێژی عیشای دوێنێ شەودا؟ وتی: نازانم، وتم: لەوێ نەبوویت؟ وتی: بەڵێ لەوێ بووم، وتم: دە من دەزانم چی خوێند، سوورەتی فلاّن و فلاّنی خوێند.**

وَعَنْ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ مَرَّ بِأَبِي هُرَيْرَةَ وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: **«مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَصَلَّى عَلَيْهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ، فَإِنْ شَهِدَ دَفْنَهَا، فَلَهُ قِيرَاطَانِ، الْقِيرَاطُ أَعْظَمُ مِنْ أُحُدٍ»**، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: **«أَبَا هُرَيْرَةَ انْظُرْ مَا تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»**، فَقَامَ إِلَيْهِ أَبُو هُرَيْرَةَ، حَتَّى انْطَلَقَ بِهِ إِلَى عَائِشَةَ، فَقَالَ لَهَا: **«يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْشُدُكِ بِالله، أَسَمِعْتِ رَسُولَ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَصَلَّى عَلَيْهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ فَإِنْ شَهِدَ دَفْنَهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ" »**؟ فَقَالَتْ: **«اللهُمَّ نَعَمْ»**، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: **«إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَشْغَلُنِي عَنْ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَرْسُ الْوَدِيِّ، وَلَا صَفْقٌ بِالْأَسْوَاقِ إِنِّي إِنَّمَا كُنْتُ أَطْلُبُ مِنْ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَةً يُعَلِّمُنِيهَا وَأُكْلَةً يُطْعِمُنِيهَا»**، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: **«أَنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ كُنْتَ أَلْزَمَنَا لِرَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَعْلَمَنَا بِحَدِيثِهِ»**[(٢)]، وفي رواية: **«لَقَدْ فَرَّطْنَا فِي قَرَارِيطَ كَثِيرَةٍ»**[(٣)].

---

(١) رواه البخاري (١٢٢٣)، وأحمد في "المسند" (١٠٧٢٢)، وابن سعد في "الطبقات الكبرى" (٢/ ٢٧٧)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٦).

(٢) رواه أحمد في "المسند" (٤٤٥٣)، وصححه أحمد شاكر، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، وعبدالرزاق في "المصنف" (٦٢٧٠)، والحاكم في "المستدرك" (٦١٦٧)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وقال الذهبي: صحيح، وابن كثير في "البداية والنهاية" (٨/ ١٠٧)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٧)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦١٧)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٥٨)، وفي "أحكام الجنائز" للألباني ص٦٩.

(٣) رواه البخاري (١٣٢٤)، ومسلم (٩٤٥)، والترمذي (١٠٤٠)، وابن حبان في "صحيحه" (٣٠٧٩)، وأحمد في "المسند" =

واتە: (عبد الله ی کوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تێپەڕ بوو بەلای (ئەبو هوڕەیرە)دا فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك نوێژ لەسەر جەنازەیەك بکات خێری قیراتێکی هەیە، وە ئەوەی لەگەڵیدا بێت تا دفن دەکرێت خێری دوو قیراتی هەیە، کە هەر قیراتێك لە شاخی ئوحود گەورەترە، (ابن عمر) وتی: (ئەبو هوڕەیرە) سەیرکە بزانە چی دەگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، (ئەبو هوڕەیرە) هەستا دەستی گرت و بردی بۆ لای (عائیشە)ی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: دایکی ئیمانداران سوێندت دەدەم بە خوا ئەمەت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە؟ فەرموودەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: سوێند بە خوا بەڵێ، (ئەبو هوڕەیرە) وتی: من هیچ شتێك نەبوو سەرقاڵم بکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ، نە نەمام چاندن و نە کاسپی بازاڕ، ئەوەی من داوام دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وشەیەك بوو فێرم بکات، یاخود پاروە نانێکم بداتێ، پاشان (عبد الله ی کوڕی عومەر) وتی: (ئەبو هوڕەیرە) تۆ زیاتر لە هەموومان پەیوەست بوویت بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە لە هەمووشمان شارەزاتری بە فەرموودەکانی، پاشان وتی: چەندەها قیراتمان لەدەست چووە!

لە فەرموودەیەکدا کە دەیگێڕێتەوە (ابن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: «أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى نَفْسِهِ، قَالَ: فَقِيلَ لِابْنِ عُمَرَ: "هَلْ تُنْكِرُ شَيْئًا مِمَّا يَقُولُ" ؟ قَالَ: "لَا، وَلَكِنَّهُ اجْتَرَأَ وَجَبُنَّا"، قَالَ: "فَبَلَغَ ذَلِكَ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: فَمَا ذَنْبِي إِنْ كُنْتُ حَفِظْتُ وَنَسُوا" »[(١)].

واتە: (ئەبو هوڕەیرە) زۆری لەسەر خۆی زیاد کردووە، پاشان بە (ابن عمر)یان وت: دژایەتی ئەو شتانە دەکەیت کە ئەو دەیڵێت؟ وتی: نەخێر، بەڵکوو ئەو بەتوانا بوو، ئێمە ترساین، کە ئەمە گەیشتەوە بە (ئەبو هوڕەیرە) وتی: تاوانی من چییە کە من لەبەرم کردووە و ئەوان لەبیریان چووەتەوە؟

---

= (١٠٠٧٩)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٢٦٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٦٧٤٨)، و "الآداب" (٢٧٧)، والبغوي في "شرح السنة" (١٥٠٢)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٧)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٥٨).

(١) رواه أبو داود (١٢٦١)، قال شعيب الأرنؤوط (محقق سنن أبي داود): صحيح، وابن خزيمة في "صحيحه" (١١٢٠)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٤٨٨٧)، والهيثمي في "موارد الضمآن" ص١٦٢، وصححه الألباني في "صحيح أبي داود" (١١٤٦).

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: يَقُولُونَ إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الحَدِيثَ، وَاللهُ المَوْعِدُ، وَيَقُولُونَ: مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لاَ يُحَدِّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ؟ وَإِنَّ إِخْوَتِي مِنَ المُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَإِنَّ إِخْوَتِي مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَمْوَالِهِمْ، وَكُنْتُ امْرَأً مِسْكِينًا، أَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، فَأَحْضُرُ حِينَ يَغِيبُونَ، وَأَعِي حِينَ يَنْسَوْنَ، وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا: «**لَنْ يَبْسُطَ أَحَدٌ مِنْكُمْ ثَوْبَهُ حَتَّى أَقْضِيَ مَقَالَتِي هَذِهِ، ثُمَّ يَجْمَعَهُ إِلَى صَدْرِهِ فَيَنْسَى مِنْ مَقَالَتِي شَيْئًا أَبَدًا**» فَبَسَطْتُ نَمِرَةً لَيْسَ عَلَيَّ ثَوْبٌ غَيْرُهَا، حَتَّى قَضَى النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَالَتَهُ، ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالحَقِّ، مَا نَسِيتُ مِنْ مَقَالَتِهِ تِلْكَ إِلَى يَوْمِي هَذَا، وَاللهِ لَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ، مَا حَدَّثْتُكُمْ شَيْئًا أَبَدًا: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾﴾ [البَقَرَة: ١٥٩ - ١٦٠][(١)].

**واتە: دەڵێن (ئەبو هورەیرە) فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە، کۆبوونەوە و لێپرسینەوەمان لای خوای گەورەیە، وە دەڵێن: کۆچەرییەکان و مەدینەییەکان بۆ وەکوو ئەو فەرموودە ناگێڕنەوە؟ برا کۆچەرییەکانم سەرقاڵی کاسپی بازاڕ بوون، وە برا مەدینەییەکانیشم سەرقاڵی ماڵ و باخیان بوون، منیش کەسێکی هەژار بووم، زۆری کاتەکان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم بۆ پڕبوونی سکم، لەبەرئەوە من ئامادە بووم کاتێك ئەوان لەوێ نەبوون، وە من لەبیرم دەما کاتێك ئەوان لەبیریان دەچووەوە، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێکتان جلەکەی ڕا بخات تا لەم قسانەم دەبمەوە و پاشان هەموو جلەکەی کۆ بکاتەوە و بیخاتە سەر سنگی، هیچ لە قسەکانی منی بیر ناچێتەوە هەتا هەتایە، منیش ئەو جلانەم ڕاخست کە بەس ئەوانەم لەبەردا بوو، تاوەکوو پێغەمبەر ﷺ لە قسەکانی لێبووەوە و پاشان هەموویم کۆکردەوە سەر سنگم، سوێند بەوەی بە حەق ئەوی**

---

(١) رواه البخاري (٢٣٥٠)، ومسلم (٢٤٩٣)، والترمذي (٣٨٣٤)، وابن حبان في "صحيحه" (٧١٥٣)، وأحمد في "المسند" (٧٧٠٥)، والبزار في "مسنده" (٩٦٩٣)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٢٤٨)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (١٦٥٩)، والبغوي في "شرح السنة" (٣٧٢٣).

ناردووە، هیچ شتێکم لەو قسانەی لەبیر نەچووەتەوە تا ئێستا، وە سوێند بە خوا لەبەر دوو ئایەتی قورئان نەبووایە؛ هیچ لە فەرموودەکانم بۆ نەدەگێڕانەوە هەتا هەتایە، ئەویش دوو ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)یە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ئەوانەی ئایەتەکانی خوا دەشارنەوە کە ناردوومانەتە خوارەوە، ڕوونکردنەوە و هۆکاری هیدایەتە لەپاش ئەوەی بۆ خەڵکیمان ئاشکرا کردووە لە قورئاندا، ئەوانە خوا نەفرەتیان لێ دەکات، وە نەفرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن، ئەگەر کەسانێك تەوبە بکەن و خۆیان چاك بکەن و دەست بکەن بە ڕوونکردنەوە بۆ خەڵکی؛ ئەوا تەوبەیان لێ وەردەگرم، وە من لێخۆشبوو و بەبەزەییم.

وَعَنْ عَاصِمُ بْنُ كُلَيْبٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: وَكَانَ يَبْتَدِئُ حَدِيثَهُ بِأَنْ يَقُولَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبُو الْقَاسِمِ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[(١)].

واتە: (عاصم) دەڵێت: باوکم دەیوت: (ئەبو هورەیرە) سەرەتای فەرموودە گێڕانەوەی بەو فەرموودەیە دەکردەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەوەی درۆ بە دەمی منەوە بکات بە ئەنقەست؛ با شوێنێك لە ئاگردا بۆ خۆی دابنێت.

... سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: «مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ»[(٢)].

واتە: (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه دەیوت: هیچ کەسێك لە هاوەڵان هێندەی من فەرموودەی لا نییە، جگە لە (عبد الله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص) نەبێت، چونکە ئەو فەرموودەکانی دەنووسییەوە،

---

(١) رواه أحمد في "المسند" (٩٣٥٠)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث متواتر، وهذا إسناد قوي، رجاله ثقات رجال الصحيح غير كليب، وهو ابن شهاب بن المجنون الجرمي، روى له أصحاب السنن، وهو قوي الحديث، ورواه اسحاق بن راهويه في "مسنده" (٢٦٤) عن المغيرة بن سلمة، عن عبد الواحد بن زياد، بهذا الإسناد، والدارمي في "السنن" (٦١٣) من طريق صالح بن عمر، عن عاصم بن كليب، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٥)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦٠٣)، وابن حجر في "الإصابة" (٧/ ٣٥٩)، وابن كثير في "البداية والنهاية" (١١/ ٣٧١)، وفي كتاب "أبو هريره راوية الإسلام" ص١١١.

(٢) رواه البخاري (١١٣)، والدارمي في "السنن" (٥٠٠)، والطحاوي في "شرح معاني الآثار" (٧١٣٦)، والبيهقي في "المدخل" (٧٤٨).

من نەم دەنووسییەوە (لەبەرئەوەی خوێندەواری نەبوو).

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: «بَلَغَ عُمَرَ حَدِيثِي، فَأَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ: كُنْتَ مَعَنَا يَوْمَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِ فُلَانٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، وَقَدْ عَلِمْتُ لِمَ سَأَلْتَنِي عَنْ ذَلِكَ. قَالَ: وَلِمَ سَأَلْتُكَ؟ قُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَئِذٍ: " مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ ". قَالَ: إِمَّا لَا فَاذْهَبْ فَحَدِّثْ»[(١)]، وفي رواية: «حدث الآن عن النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ما شئت»[(٢)].

واته: (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه دەڵێت: ئەو فەرموودانەی کە دەمگێڕایەوە گەیشتە (عومەری کوڕی خەتتاب) رضي الله عنه، ناردی بەدوامدا وتی: ئەو ڕۆژە لەگەڵمان بوویت کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە ماڵی فلان کەس؟ وتم: بەڵێ، وە دەشزانم بۆچی پرسیارم لێ دەکەیت، وتی: بۆ پرسیارت لێ دەکەم، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە فەرمووی: ئەوەی درۆ بە دەمی منەوە بکات بەبێ پاساو، با شوێنێك لە دۆزەخ بۆ خۆی دابنێت، پاش ئەمە ئیمامی (عومەر) رضي الله عنه وتی: کەواتە بڕۆ فەرموودە بگێڕەرەوە، لە ڕیوایەتێکدا پێی فەرموو: ئێستا بە ویستی خۆت چی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕیتەوە بیگێڕەرەوە.

جَاءَ رَجُلٌ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ فَقَالَ: «يَا أَبَا مُحَمَّدٍ أَرَأَيْتَ هَذَا الْيَمَانِيَّ- يَعْنِي أَبَا هُرَيْرَةَ- هُوَ أَعْلَمُ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ مِنْكُمْ، مِنْهُ أَشْيَاءُ لَا نَسْمَعُهَا مِنْكُمْ، أَمْ يَقُولُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عليه وآله وَسَلَّمَ مَا لَمْ يَقُلْ؟»[(٣)]، وفي رواية: «فَقَالَ طَلْحَةُ: قَدْ سَمِعْنَا كَمَا سَمِعَ، وَلَكِنَّهُ حَفِظَ

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٦٠٣)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٥)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٤٥)، و "الإصابة" لابن حجر (١/ ٦٩).

(٢) رواه ابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٤٤).

(٣) رواه البخاري في "التأريخ الكبير" (٦/ ١٣٣)، والترمذي (٣٨٣٧)، وأبو يعلى في "مسنده" (٦٣٦)، وقال محققه: رجاله ثقات، والحاكم في "المستدرك" (٦١٧٢)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وقال الذهبي: على شرط مسلم، والبزار في "المسند" (٩٣٢)، وضياء الدين في "المختارة" (٨١٥)، والذهبي في "تأريخ الإسلام" (٤/ ٣٥٣)، و "سير أعلام النبلاء" (٣/ ٢٩)، وقال ابن الأثير في "جامع الأصول" (٦٦٤٣): وهو حديث حسن، وقد حسنه الترمذي والحافظ في "الفتح" وغيرهما، وابن كثير في "البداية والنهاية" (٨/ ١١٧)، وفي "أسمى المطالب" للصلابي (١/ ٦٢١)، =

وَنَسِينَا»[(١)].

واتە: پیاوێك هات بۆ لای (طلحةی کوڕی عبید الله) ﷺ، وتی: باوکی (محمد) ئەبینی ئەو یەمەنییە، واتە (ئەبو هورەیرە) شارەزاتر بێت لە تۆ لە فەرمووددا، هەندێك شتی لێ دەبیستین لە تۆمان نەبیستووە، وتی: ئەوەی ئەو بیستوویەتی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئێمە نەمانبیستووە، گومانتان نەبێت، ئێستا هۆکارەکەیتان پێ دەڵێم، ئێمە خاوەن ماڵ و منداڵ بووین و خاوەن کار و ماڵات بووین، ئێمە کۆتایی ڕۆژ دەچووینە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەو هەژار بوو، میوانی دەرگای پێغەمبەر ﷺ بوو، دەستی لەگەڵ دەستیدا بوو، گومانمان نییە لەوەی ئەوەی ئەو بیستوویەتی ئێمە نەمانبیستووە، وە کەسێکیش خێری تێدا نییە شتێك لە پێغەمبەرەوە بگێڕێتەوە کە نەیوتبێت، وە ئێمەش بیستوومانە وەکوو چۆن ئەو بیستوویەتی، بەڵام لەبیرمان چووەتەوە و ئەو لەبەریەتی.

فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ مَرْوَانُ مُغْضَباً، وَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، إِنَّ النَّاسَ قَدْ قَالُوا: أَكْثَرَ الحَدِيْثَ عَنْ رَسُوْلِ اللهِ، وَإِنَّمَا قَدِمَ قَبْلَ وَفَاتِهِ بِيَسِيْرٍ، فَقَالَ: «قَدِمْتُ وَاللهِ وَرَسُوْلُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخَيْبَرَ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ زِدْتُ عَلَى الثَّلاَثِيْنَ سَنَةً سَنَوَاتٍ، وَأَقَمْتُ مَعَهُ حَتَّى تُوُفِّيَ، أَدُوْرُ مَعَهُ فِي بُيُوْتِ نِسَائِهِ، وَأَخْدُمُهُ، وَأَغْزُو، وَأَحُجُّ مَعَهُ، وَأُصَلِّي خَلْفَهُ، فَكُنْتُ وَاللهِ أَعْلَمَ النَّاسِ بِحَدِيْثِهِ»[(٢)].

واتە: (مەروانی کوڕی حەکەم) ئەمیری مەدینە ڕۆژێك بە (ئەبو هورەیرە)ی وت: خەڵکی دەڵێن: فەرموودە زۆر بەناوی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕیتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ماوەیەکی کەم پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ گەیشتوویتەتە مەدینە، وتی: سوێند بە خوا کاتێك گەیشتمە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو، ئەوکات تەمەنم لە سەروو سی ساڵەوە بوو، لەگەڵیدا بووم تا وەفاتی کرد، لەگەڵیا دەگەڕام بەسەر ماڵی خێزانەکانی، خزمەتم دەکرد، وە جیهادم لەگەڵدا کردووە و حەج و نوێژم کردووە بەدوایەوە، وە سوێند بە خوا شارەزاترین کەسم بە فەرموودەکانی.

= وقال ابن حجر في "فتح الباري" (٧/ ٧٥): إسناده حسن.

(١) "فتح الباري" لابن حجر (٧/ ٧٦)، "الإصابة في تميز الصحابة" لابن حجر (٧/ ٣٦٠)، "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٥٦)، وفي "مشارق الأنوار الوهاجة ومطالع الأسرار البهاجة في شرح سنن الإمام ابن ماجه" لمحمد بن علي بن آدم (١/ ٤٦).

(٢) "الطبقات الكبرى" لابن سعد (١/ ٣٥٩)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٥٥)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٦)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٦٠٥)، و "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٧/ ٣٥٩).

... ثَنَا حَمَّادُ بنُ زَيْدٍ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بنُ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيُّ، حَدَّثَنِي أَبُو الزُّعَيْزِعَةِ كَاتِبُ مَرْوَانَ: أَنَّ مَرْوَانَ أَرْسَلَ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، فَجَعَلَ يَسْأَلُهُ، وَأَجْلَسَنِي خَلْفَ السَّرِيْرِ، وَأَنَا أَكْتُبُ، حَتَّى إِذَا كَانَ رَأْسُ الحَوْلِ، دَعَا بِهِ، فَأَقْعَدَهُ مِنْ وَرَاءِ الحِجَابِ، فَجَعَلَ يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ الكِتَابِ، فَمَا زَادَ وَلاَ نَقَصَ، وَلاَ قَدَّمَ وَلاَ أَخَّرَ»[(١)].

واتە: بۆ تاقیکردنەوەی (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه، ڕۆژێك (مەروانی کوڕی حەکەم) ئەمیری مەدینە، کاتبەکەی دەنێرێت بەدوایدا، وە کاتبەکەی لەپشت پەردەوە دادەنێ و پرسیار لە (ئەبو هورەیرە) دەکات، ئەویش دەڵێت: من دەمنووسی، ساڵێکی تر ئەم کاتە بانگی (ئەبو هورەیرە)ی کردەوە، کاتبەکەی لەپشت پەردەوە دانا و هەمان پرسیارەکانی ساڵی ڕابوردووی لێکردەوە، لە وەڵامدا نە لێی زیاد کرد و نە لێی کەم کرد و نە پێشوپاشی کرد.

ئیمامی (الذهبي) رحمه الله لەپاش ئەم گێڕانەوەیە دەڵێت: «قُلْتُ: هَكَذَا فَلْيَكُنِ الحِفْظُ»[(٢)].

واتە: دەبێت بەو جۆرە بێت لەبەرکردن.

وَعَنْ مُحَمَّدِ بنِ عُمَارَةَ بنِ عَمْرِو بنِ حَزْمٍ: «أَنَّهُ قَعَدَ فِي مَجْلِسٍ فِيْهِ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَفِيْهِ مَشْيَخَةٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُوْلِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِضْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً، فَجَعَلَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُهُمْ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالحَدِيْثِ، فَلاَ يَعْرِفُهُ بَعْضُهُمْ، ثُمَّ يَتَرَاجَعُوْنَ فِيْهِ، فَيَعْرِفُهُ بَعْضُهُمْ، ثُمَّ يُحَدِّثُهُمْ بِالحَدِيْثِ، فَلاَ يَعْرِفُهُ بَعْضُهُمْ، ثُمَّ يَعْرِفُهُ، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ مِرَاراً، قَالَ: فَعَرَفْتُ يَوْمَئِذٍ أَنَّهُ أَحْفَظُ النَّاسِ عَنْ رَسُوْلِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[(٣)].

---

(١) رواه الحاكم في "المستدرك" (٦١٦٤)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، ووافقه الذهبي، وفي "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٥٩٨)، و "الإصابة" لإبن حجر (٤/ ٢٠٥)، و "البداية والنهاية" لإبن كثير (٨/ ١٠٦)، و "مختصر تأريخ دمشق" (٢٩/ ١٩١).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٥٩٨).

(٣) رواه البخاري في "التأريخ الكبير" (١/ ١٨٧)، والحاكم في "المستدرك" (٦١٧١)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٣٩)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦١٧)، وابن حجر في "فتح الباري" (١/ ٢١٤)، وفي "كوثر المعاني الدراري" للشنقيطي (٤/ ٦٦).

قَالَ أَبو صَالِح: «أَبو هُرَيْرَة لَمْ يَكُنْ بِأَفْضَلِهِمْ ولكِنَّهُ كانَ رَجُلاً حَافِظًا»[١].

**واته: (محمدی کوڕی عمارة الأنصاري) دەڵێت: دانیشتم لە کۆڕی هاوەڵاندا، کە ژمارەیان دە بۆ دوانزە کەس بوون، (ئەبو هورەیرە) فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە، هەندێکیان نەیاندەزانی، پاشان پێداچوونەوەیان بەسەریدا دەکرد، هەندێکیان دەیانزانی، پاشان (ئەبو هورەیرە) فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە، هەندێکیان نەیاندەزانی و پاشان بیریان دەکەوتەوە و دەیانزانی، چەندەها جار ئەمەی دەکرد، دەڵێت: ئەوکاتە زانیم (ئەبو هورەیرە) لە لەبەرکردنی فەرموودەکاندا باشترین کەسە کە لە پێغەمبەرەوە لەبەری کردبێت.**

**(ئەبو ساڵح) دەڵێت: (ئەبو هورەیرە) لە پلەی هاوەڵاندا باشترین کەسیان نەبوو، بەڵام پیاوێکی زۆر زیرەك بوو لە لەبەرکردندا.**

وَعَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: «أَنَّهُ كَانَ يَقُومُ كُلَّ خَمِيسٍ فَيُحَدِّثُهُمْ»[٢].

**واته: (ابن سيرين) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: (ئەبو هورەیرە) هەموو ڕۆژێکی پێنجشەممە هەڵدەستا فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوە.**

**وە هەندێك جار بۆ دڵنیایی دەیوت:** «شَهِدَ عَلَى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِي هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ»[٣].

**واتە: ئەم فەرموودەیە گۆشت و خوێنی (ئەبو هورەیرە) شاهێدی لەسەر دەدات.**

**وە زۆرجاریش لە پێشەکی فەرموودەکاندا دەیوت: «أَوْصَانِي خَلِيلِي أَبُو الْقَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[٤]، «حَدَّثَنِي حِبِّي أَبُو الْقَاسِمِ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[٥]، «حَدَّثَنِي الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ خَلِيلِي أَبُو الْقَاسِمِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»[٦]، «أَوْصَانِي خَلِيلِي»[٧].**

---

(١) "التأريخ الكبير" للبخاري (١/ ٤٣٨)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٣٩)، و "التأريخ" لأبي زرعة الدمشقي ص٥٤١.

(٢) "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (٢/ ٥٧)، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب (١/ ٤٢٢).

(٣) رواه مسلم (٢٨٩٦)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١٨٣٨٥)، والبغوي في "شرح السنة" (٢٧٥٤)، وابن جعد في "مسنده" (٢٦٧٣).

(٤) "مسند الإمام أحمد" (١٧٩٨٢).

(٥) "مسند الإمام أحمد" (٧٨٧١).

(٦) "مسند الإمام أحمد" (١٠٤٥٥).

(٧) "مسند الإمام أحمد" (٧١٨٠).

وە هەندێك جاریش قوڕگی پڕ دەبوو لە گریان و لە كۆڕەكە هەڵدەستا[١].

(همام بن منبه) كە لەدایكبووی ساڵی (٤٠)ی كۆچییە و لە ساڵی (١٣١)ی كۆچی وەفاتی كردووە، لە گەورە تابیعییەكانە و گەیشتووە بە (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه و فەرموودەیەكی زۆری لێ وەرگرتووە و نووسیویەتییەوە و ناوی بردووە بە (الصَّحِيفَةُ الصَّحِيحَةُ) و نووسراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (صَحِيْفَةُ هَمَّام بنُ مُنَبِّه)[٢].

(ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه لە هەڵبژێردراوەكانی خەلیفە (عومەری كوڕی خەتتاب) رضي الله عنه بوو بۆ ئەمیرایەتی بەحرەین لە ساڵی (٢١ بۆ ٢٣)ی كۆچی[٣]، وە پاش ئەو ساڵە خەلیفە داوای لێكرد ببێتەوە بە ئەمیری بەحرەین، ئەویش نەیكرد و وتی: لە پێنج شت ئەترسم كە بەسەرمدا بێت: «أَخَافُ أَنْ أَقُولَ بِغَيْرِ عِلْمٍ، وَأَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ، وَأَنْ يُضْرَبَ ظَهْرِي، وَأَنْ يُشْتَمَ عِرْضِي، وَأَنْ يُؤْخَذَ مَالِي بِالضَّرْبِ»[٤].

واتە: ئەترسم بەبێ زانست قسە بكەم، وە حوكم بكەم بەبێ هێمنی، وە لە پشتم بدەن و ماڵم لێ بسەننەوە، وە قسەم پێ بوترێت.

وە لە سەردەمی (مەعاویە)دا رضي الله عنه بەردەوام جێگرەوەی (مەروانی كوڕی حەكەم) بوو، پێشنوێژی مەدینە بوو لە ساڵەكانی (٤٢)ی كۆچی تاوەكوو (٥٨)ی كۆچی[٥].

وە لە ساڵی (٥٩)ی كۆچیدا وەفاتی كرد[٦].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٤٧/ ٤٤٠).

(٢) بڕوانە "أقدم تدوين في الحديث النبوي: صحيفة همام" ص٢٠، و "أبو هريرة راوية الإسلام" لدكتور محمد عجاج خطيب ص١١٦.

(٣) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤٤١)، و "طبقات ابن سعد" (٤/ ٢/ ٥٩).

(٤) رواه الحاكم في "المستدرك" (٣٣٢٧) وقال: هَذَا حَدِيثٌ بِإِسْنَادٍ صَحِيحٍ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، ووافقه الذهبي، ورواه أبو نعيم في "الحلية" (١/ ٣٨٠)، وابن كثير في "البداية والنهاية" (٨/ ١١٩)، وابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٦٧/ ٣٧١)، وابن الأثير في "أسد الغابة" (٧/ ٢٨)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٢/ ٦١٢)، وابن حجر في "الإصابة" (٨/ ٣٣).

(٥) "تأريخ الطبري" ص٢٢٨.

(٦) "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢/ ٣٣٩)، و "طبقات ابن سعد" (٤/ ٢٠)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤٤٩).

كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَتَرَحَّمُ عَلَيْهِ فِي جِنَازَتِهِ وَيَقُولُ: «كَانَ يَحْفَظُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حَدِيثَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ »[(١)].

**واتە: (عبداللە ى كوڕی عومەر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا لەپێش جەنازەكەیەوە دەڕۆیشت و دووعای ڕەحمەت و بەزەیی خوای بۆ دەكرد و دەیوت: فەرموودەكانی پێغەمبەری ﷺ بۆ موسوڵمانان دەپاراست.**

**لەدوای خۆی، سێ كوڕ و یەك كچی هەبوو، كچەكەی دا بە گەورە پیاوانی تابعین (سعید بن المسیب) رَحِمَهُ اللَّهُ[(٢)]، وە لە سەردەمی (مەعاویە)دا رضي الله عنه وەفاتی كرد كە تەمەنی حەفتاوهەشت ساڵ بوو، چل و حەوت ساڵ مایەوە[(٣)]، لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ بە بڵاوكردنەوەی فەرموودەكانی تەمەنی بردە سەر.**

قَالَ الشَّافِعِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ: «أَبُو هُرَيْرَةَ أَحْفَظُ مَنْ رَوَى الْحَدِيثَ فِي دَهْرِهِ»[(٤)].

**واتە: (ئەبو هوڕەیرە) لە سەردەمی خۆیدا شارەزاترین كەس بووە بەسەر فەرموودەدا.**

وَقَالَ الْبُخَارِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ: «رَوَى عَنْهُ نَحْوَ الثمانمائة من أهلِ العِلْمِ، وَكَانَ أَحْفَظُ مَنْ روى الحديث في عَصرهِ»[(٥)].

**واتە: ئیمامی (بوخاری) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: زیاد لە هەشت سەد پیاوانی خاوەن زانست فەرموودەیان لێ وەرگرتووە، لەخۆگرترین كەس بووە لە فەرموودەدا.**

---

(١) "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٢١٤)، و "طبقات ابن سعد" (٤/ ٣٤٠)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٦٠٤).

(٢) "الحلية" للأبي نعيم (١/ ٣٨٠)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١١)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٤/ ٨٤).

(٣) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/٥٧٨)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٠٧).

(٤) "معرفة السنن والآثار" للبيهقي (١٧٣٩)، و "الرسالة" ص٢٨١ و "شرح النووي على مسلم" (١/٦٨)، و "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٢١٤)، و "شرح الزرقاني على الموطأ" (١/ ٨٢)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٤)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٦٧/ ٣٤١)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٢/ ٢٧٠)، و "تذكرة الحفاظ" للذهبي (١/ ٣٠)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٥٩٩)، و "الإصابة" لابن حجر (١/ ٧٢).

(٥) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (١٢/ ٢٦٥)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١١)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٣٤/ ٣٧٧)، و "الإصابة" لابن حجر (٧/ ٣٥٣)، و "عشرون حديثا من صحيح البخاري" لعبدالمحسن العباد ص٢٤٠، و "كوثَر المَعَاني الدَّرَارِي في كَشْفِ خَبَايا صَحِيحْ البُخَاري" للشنقيطي (١/ ٤٤٥)، و "مشارق الأنوار الوهاجة" لمحمد بن علي بن آدم (١/ ٣٨).

وَقَالَ الإِمَامُ الْذَّهَبِيُّ رحمه الله: «وَأَبُو هُرَيْرَةَ إِلَيْهِ الْمُنْتَهَى فِي حَفِظِ مَا سَمِعَهُ مِنَ الرَّسُوْلِ عَلَيْهِ السَّلاَمُ وَأَدَائِهِ بِحُرُوْفِهِ»(١).

وَقَالَ: «وَكَانَ مِنْ أَوْعِيَةِ الْعِلْمِ وَمِنْ كِبَارِ أَئِمَّةِ الْفَتْوَى مَعَ الْجَلاَلَةِ وَالْعِبَادَةِ وَالتَّوَاضُعِ»(٢).

واتە: ئیمامی (زەهەبی) رحمه الله دەڵێت: لەخۆگرترین کەس بووە لە لەبەرکردنی فەرموودە و گەیاندنی، کۆکەرەوەی زانست بووە و لە گەورە ئیمامەکانی فەتوا بووە، لەگەڵ پلەوپایە بەرزی و عیبادەتی زۆر و خۆبەکەمزانی.

وَقَالَ الإِمَامُ (الْسَّرْخَسِيّ) رحمه الله: «فَإِن أَبَا هُرَيْرَة مِمَّنْ لَا يشك أحد فِي عَدَالَتِهِ وَطول صُحبتِهِ مَعَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»(٣).

واتە: (ئەبو هورەیرە) کەسێك گومانی نییە لە دادپەروەریەتی و هاوەڵێیەتی تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وَقَالَ (ابْنُ عَبْد البَر) رحمه الله: «كَانَ أَحْفَظُ أَصْحَابَ رَسُولِ الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ يَحْضُرُ مَا لَا يَحْضُرُ سَائِرَ الْمُهَاجِرِيْنَ وَالْأَنْصَارَ»(٤).

واتە: لەخۆگرترین ڕێژەی ژمارەی فەرموودە بووە لەناو هاوەڵاندا، ئەوەی بەو دراوە لەو بوارەدا بە کۆچەری و پشتیوانەکان نەدراوە.

وَقَالَ (ابْنُ كَثِيْر) رحمه الله: «وَقَدْ كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، مِنَ الصِّدْقِ وَالْحِفْظِ وَالدِّيَانَةِ وَالْعِبَادَةِ وَالزَّهَادَةِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ عَلَى جَانِبٍ عَظِيمٍ»(٥).

واتە: (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه بەشێکی گەورەی هەیە لە ڕاستگۆیی و لەبەرکردنی فەرموودە و دینداری و عیبادەت و کاری خێریدا.

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٦١٩).

(٢) "تذكرة الحفاظ" للذهبي (١/ ٢٩).

(٣) "أصول السرخسي" (١/ ٣٤٠).

(٤) "الإستيعاب في معرفة الأصحاب" لابن عبد البر (٤/ ١٧٧١).

(٥) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٨).

وَقَالَ (ابْنُ تَيْمِيَّةَ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «وَأَبُو هُرَيْرَةَ كَانَ مِنْ أَحْفَظِ الْأُمَّةِ وَقَدْ دَعَا لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحِفْظِ»[(١)].

واتە: (ئەبو هورەیرە) باشترین کەسانی ئەم ئوممەتە بووە لە لەبەرکردنی فەرموودەدا، پێغەمبەر ﷺ لەم بوارەدا دووعای بۆ کردووە.

وَقَالَ (ابْنُ خُزَيْمَةَ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «إِنَّمَا يَتَكَلَّمُ فِي أَبِي هُرَيْرَةَ لِدَفْعِ أَخْبَارِهِ مَنْ قَدْ أَعْمَى اللهُ قُلُوبَهُمْ فَلَا يَفْهَمُونَ مَعَانِيَ الْأَخْبَارِ، إِمَّا مُعَطِّلٌ جَهْمِيٌّ يَسْمَعُ أَخْبَارَهُ الَّتِي يَرَوْنَهَا خِلَافَ مَذْهَبِهِمُ الَّذِي هُوَ كفْرٌ، فَيَشْتُمُونَ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَيَرْمُونَهُ بِمَا اللهُ تَعَالَى قَدْ نَزَّهَهُ عَنْهُ تَمْوِيهًا عَلَى الرِّعَاءِ وَالسَّفِلِ، أَنَّ أَخْبَارَهُ لَا تَثْبُتُ بِهَا الْحُجَّةُ، وَإِمَّا خَارِجِيٌّ يَرَى السَّيْفَ عَلَى أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَا يَرَى طَاعَةَ خَلِيفَةٍ، وَلَا إِمَامٍ إِذَا سَمِعَ أَخْبَارَ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خِلَافَ مَذْهَبِهِمُ الَّذِي هُوَ ضَلَالٌ، لَمْ يَجِدْ حِيلَةً فِي دَفْعِ أَخْبَارِهِ بِحُجَّةٍ وَبُرْهَانٍ كَانَ مَفْزَعُهُ الْوَقِيعَةَ فِي أَبِي هُرَيْرَةَ، أَوْ قَدَرِيٌّ اعْتَزَلَ الْإِسْلَامَ وَأَهْلَهُ وَكَفَّرَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الْأَقْدَارَ الْمَاضِيَةَ الَّتِي قَدَّرَهَا اللهُ تَعَالَى، وَقَضَاهَا قَبْلَ كَسْبِ الْعِبَادِ لَهَا إِذَا نَظَرَ إِلَى أَخْبَارِ أَبِي هُرَيْرَةَ الَّتِي قَدْ رَوَاهَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إِثْبَاتِ الْقَدَرِ لَمْ يَجِدْ بِحُجَّةٍ يُرِيدُ صِحَّةَ مَقَالَتِهِ الَّتِي هِيَ كُفْرٌ وَشِرْكٌ، كَانَتْ حُجَّتُهُ عِنْدَ نَفْسِهِ أَنَّ أَخْبَارَ أَبِي هُرَيْرَةَ لَا يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِهَا، أَوْ جَاهِلٌ يَتَعَاطَى الْفِقْهَ وَيَطْلُبُهُ مِنْ غَيْرِ مَظَانِّهِ إِذَا سَمِعَ أَخْبَارَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِيمَا يُخَالِفُ مَذْهَبَ مَنْ قَدِ اجْتَبَى مَذْهَبَهُ، وَأَخْبَارَهُ تَقْلِيدًا بِلَا حُجَّةٍ وَلَا بُرْهَانٍ كَلَّمَ فِي أَبِي هُرَيْرَةَ، وَدَفَعَ أَخْبَارَهُ الَّتِي تُخَالِفُ مَذْهَبَهُ، وَيَحْتَجُّ بِأَخْبَارِهِ عَلَى مُخَالَفَتِهِ إِذَا كَانَتْ أَخْبَارُهُ مُوَافِقَةً لِمَذْهَبِهِ، وَقَدْ أَنْكَرَ بَعْضُ هَذِهِ الْفِرَقِ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ أَخْبَارًا لَمْ يَفْهَمُوا مَعْنَاهَا»[(٢)].

واتە: کەسێك قسە بە (ئەبو هورەیرە) دەڵێت بۆ ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی؛ کە خوای

---

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٥٣٤).

(٢) "المستدرك على الصحيحين" للحاكم (٣/ ٥٨٦) برقم (٦١٧٦)، و "أبو هريرة راوية الإسلام" لمحمد عجاج خطيب ص٢٥٦، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب (١/ ٤٦٧)، و "عدالة الصحابة" للشربيني ص٩٨.

گەورە چاوەکانی کوێر کردووە لە مانای فەرموودەکان ناگات:

١. لەوانە ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە ناو و سیفاتەکانی خوا نییە و فەرموودەکانی (ئەبو هورەیرە) دژایەتی بیروڕاکانیان دەکات، بۆ چەواشەکردنی بێئاگاکان و ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی.

٢. یاخود خەوارجەکان کە باوەڕیان بە دەرچوونە لە موسوڵمانان و کوشتارگەری خەڵکییە، کاتێك دەبینن فەرموودەکانی (ئەبو هورەیرە) پێچەوانەی مەزهەبەکەیانە؛ هیچ بوارێك نابیننەوە لە ڕەتدانەوەی فەرموودەکان، بێجگە لە قسەوتن بە (ئەبو هورەیرە) رضي الله عنه نەبێت.

٣. یاخود قەدەرییەکان، کە گۆشەگیرن لە ئیسلام و موسوڵمانان، باوەڕیان بە قەزاوقەدەری خوایی نییە لەسەر بەندەکانی، ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە (ئەبو هورەیرە) ڕیوایەتی کردووە و دەبینن دژایەتییان دەکات؛ هیچ بوارێکیان بۆ نامێنێتەوە بێجگە لەوە نەبێت کە بڵێن (ئەبو هورەیرە) کەسێکە ڕیوایەتەکانی لێ وەرناگیرێت و بەڵگە نییە.

٤. یاخود نەزانێك لە بوارە فیقهییەکاندا، کە لەسەر ڕێڕەوی خۆی وەری نەگرتووە، کاتێك گوێبیستی فەرموودەکانی (ئەبو هورەیرە) دەبێت پێچەوانەی ڕای مەزهەبەکەیەتی و شوێنکەوتەی کوێرانەی بێ بەڵگەیە، ئەوکات قسە بە (ئەبو هورەیرە) دەڵێت و ڕێگەی بەرپەرچدانەوەی ئەو فەرموودانە دەگرێتە بەر کە دژایەتی مەزهەبەکەی دەکات، بەڵام ئەو فەرموودانەی کە لەگەڵ مەزهەبەکەیدا دەگونجێت؛ دەیکاتە بەڵگە، گەرچی دژایەتیشی دەکات، زۆرجاریش کۆمەڵێك لەم فیرەقانە بەرپەرچی هەندێك لە فەرموودەکانی (ئەبو هورەیرە) دەدەنەوە بەبێ تێگەیشتنی تەواو لێی.

# تێبینییەك لەسەر

## ژمارەی ئەو فەرموودانەی کە ( أبو هريرة ) ﷺ گواستوویەتییەوە بۆ موسوڵمانان

کۆی گشتی ئەو ژمارانەی کە هاوەڵە ناودارەکانی فەرموودە دەیگێڕنەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١. (أَبُوْ هُرَيْرَة) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ: بە چەندبارە بووەکانەوە دەگاتە (٥٣٧٤) پێنج هەزار و سێ سەد و حەفتا و چوار فەرموودە.

٢. (عَبْدِ الله بْنِ عُمَر) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا: (٢٦٣٠) دوو هەزار و شەش سەد و سی فەرموودە.

٣. (أَنَس بْن مَالِك) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ: (٢٢٨٦) دوو هەزار و دوو سەد و هەشتا و شەش فەرموودە.

٤. (عَائِشَةَ) رَضِيَٱللَّهُعَنْهَا: دایکی ئیمانداران (٢٢١٠) دوو هەزار و دوو سەد و دە فەرموودە.

٥. (عَبْدِ الله بْنِ عَبَّاس) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ: (١٦٦٠) هەزار و شەش سەد و شەست فەرموودە.

٦. (جَابِر بْنِ عَبْدِ الله) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا: (١٥٤٠) هەزار و پێنج سەد و چل فەرموودە.

٧. (أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ: (١١٧٠) هەزار و سەد و حەفتا فەرموودە[١].

ژمارەی فەرموودەکانی (أبو هريرة) ﷺ لە "مسند الإمام أحمد" دا رَحِمَهُٱللَّهُ بە دووبارەبووەکانەوە دەگاتە (٣٨٤٨) سێ هەزار و هەشت سەد و چل و هەشت فەرموودە، (٣٢٥) سێ سەد و بیست و پێنج فەرموودەی (متفق عليه)یە، واتە لە نێوان بوخاری و موسلیم دایە، لە بوخاریدا بە تەنها (٩٣) نەوەد و سێ فەرموودەیە، وە لە موسلیمدا (١٨٩) سەد و هەشتا و نۆ فەرموودەیە، پاشماوەکەی تری لە (سنن)ەکاندایە[٢].

---

(١) بۆ ئەم بابەتە گەڕانەوە بۆ "تدريب الراوي" للسوطي (٢/ ٦٧٥)، و "فتح المغيث" للسخاوي (٤/ ١٠٣)، و "شذرات الذهب في أخبار من ذهب" لابن عماد العَكري (١/ ٢٦١).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٤١٨)، و "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٤/ ١٣٨)، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب ص٤٢٩، و "عدالة الصحابة" للشربيني ص٨٠.

وە ژمارەی فەرموودەکانی (أبو هريرة) رضي الله عنه بەبێ دووبارە بووەوە لە "مسند الإمام أحمد" و "كتب الستة" واتە: (البخاري، مسلم، أبو داود، الترمذي، النسائي، ابن ماجه)دا دەگاتە (١٣٣٦) هەزار و سێ سەد و سی و شەش فەرموودە[١].

کە بۆخۆی ئەمە ژمارەیەکی زۆر کەمە بۆ توانای لەبەرکردن، بەتایبەت بۆ هاوەڵێك کە دووعای لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ کراوە و یەکلا بووبووەوە بۆ ئەم کارە.

لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەکان بە گشتی لە دیڕ و نیودیڕ پێکهاتوون، پێکهاتەی درێژ نین، کە ببێتە هۆکاری تێکەڵی و لەبیرچوونەوە و لێتێکچوون.

گەر ژمارەی فەرموودەکانی (أبو هريرة) رضي الله عنه کێشانە و پێوانە بکەین لەگەڵ زانایانی فەرموودەی دوای ئەو لە لەبەرکردنی فەرموودەدا؛ شتێکی ئەوتۆ نابێت کە کۆی زانایانی فەرموودە بە سەدەها هەزار فەرموودە و وتەی هاوەڵان و تابعییەکانیان لەبەر بووە، گەر ئەوە ڕەخنە بێت لە (أبو هريرة) ئەوا ڕەخنەشە لە کۆی زانایانی فەرموودە.

وەکوو ئیمامی (البخاري) رحمه الله دەڵێت: «أَحْفَظُ مِئَةَ أَلْفِ حَدِيْثِ صَحِيْحِ، وَاحفَظُ مِئَتَي أَلْفَ حَدِيثٍ غَيْرَ صَحِيحٍ»[٢].

واتە: سەد هەزار فەرموودەی (صحيح)م لەبەرە، لەگەڵ دووسەد هەزار کە (صحيح) نین.

مەبەستی پێ ژمارەی ڕێگای فەرموودەکان و قسەی هاوەڵان و تابعين و پێشووە ساڵحەکانە[٣].

وَقَالَ (ابْنُ حَجرْ) رحمه الله: «فَمَا لَمْ يُخَرِّجَاهُ مِنَ الطُّرُقِ لِلْمُتُونِ الَّتِي أَخْرَجَاهَا لَعَلَّهُ يَبْلُغُ هَذَا الْقَدر أَيْضًا وَ يَزِيدُ، وَمَا لَمْ يُخَرِّجَاهُ مِنَ الْمُتُونِ مِنَ الصَّحِيحِ الَّذِي لَمْ يَبْلُغْ شَرْطِهِمَا لَعَلَّهُ يَبْلُغُ هَذَا الْقَدر أَوْ يَقْرُبُ مِنْهُ، فَإِذَا انْضَافَ إِلَى ذَلِكَ مَا جَاءَ عَنِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ، تَمَّتِ الْعِدَّةَ الَّتِي ذَكَرَ الْبُخَارِيُّ أَنَّهُ يَحْفَظُهَا، بَلْ رُبَّمَا زَادَتْ عَلَى ذَلِكَ»[٤].

(١) "أبو هريرة في ضوء مروياته" ص٧٦، و "عدالة الصحابة" للشربيني ص٨٠.

(٢) "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٢٢٦)، و "التأريخ" للبغدادي (٢/ ٢٥)، و "المقنع في علوم الحديث" لابن الملقن (١/ ٦٢)، و "مقدمة ابن صلاح" ص٣٧، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١١)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للقضاعي (٢٤/ ٤٦١).

(٣) "النكت" للزركشي (١/ ١٧٨).

(٤) "النكت على كتاب ابن صلاح" لابن حجر (١/ ١٣٦)، و "فتح المغيث" للسخاوي (١/ ٥٠).

واتە: ئەوەی (تخريج) و پاڵفتە نەکراوە لـە دەقە (صحيح)ەکاندا کە نەگەیشتووەتە مەرجەکانیان بۆ پێبەخشینی پلـەی (صحيح)، لـەگەڵ وتەی هاوەڵان و تابعین و (صحيح)ەکانیاندا؛ دەگاتە ئەو ژمارەیەی کە بوخاری باسی کردووە، بەڵکوو زیاتریش.

ئیمامی (البخاري) رَحِمَهُ اللهُ دەڵێت: «صَنَّفْتُ كِتَابِي الصِّحَاحُ بِستَّ عَشْرَةَ سَنَةً، خَرَّجْتُهُ مِنْ سِتِّمَائَةِ أَلْفِ حَدِيثٍ، وَجَعَلْتُهُ حُجَّةً فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ اللهَّ عَزَّ وَجَلَّ»[(١)].

واتە: ئەم (الجامع الصحيح)ە، واتە (صحيح البخاري)یەم نووسییەوە بە درێژایی شانزە ساڵ، لـە هەڵبژاردەی شەش سەد هەزار فەرموودە، کردوومە بە بەڵگەی ڕزگاربوونم لـەنێوان خۆم و خوادا.

وە دەڵێت: «مَا أَدْخَلْتُ فِي كِتَابِي الْجَامِعِ إِلَّا مَا صَحَّ، وَتَرَكْتُ مِنَ الصِّحَاحِ خَشْيَةَ أَنْ يَطُولَ الْكِتَابُ»[(٢)].

واتە: فەرموودەیەك (صحيح) نەبێت نەمخستووەتە (صحيح)ەکەمەوە، وە زۆرێکیش لـە فەرموودە (صحيح)ەکانم وازلـێهێناوە لـە ترسی زۆربوون و دووورودرێژی.

وە دەیـوت: «صنفت كـتابي الْجَامِع فِي الْمَسْجِد الْحَرَام وَمَا أدخلت فِيهِ حَدِيثًا حَتَّى استخرت الله تَعَالَى وَصليت رَكْعَتَيْنِ وتيقنت صِحَّته»[(٣)]، و «مَا وضعت فِيهِ حَدِيثا حَتَّى اغْتَسَلت وَصليت

(١) "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (٢/ ١٤)، و "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (٢/ ١٨٥)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٩/ ٢٤٩)، و "شذرات الذهب في أخبار من ذهب" لابن عماد العَكري (٣/ ٢٥٣)، و "طبقات الحنابلة" (١/ ٢٧٦)، و "تهذيب الأسماء واللغات" (١/ ١/ ٧٤)، و "وفيات الأعيان" لابن خلكان الإربلي (٤/ ١٩٠)، و "تهذيب الكمال" للقضاعي (٣/ ١١٧٠)، و "طبقات الشافعية الكبرى" للسبكي (٢/ ٢٢١)، و "مقدمة فتح الباري" ص٤٨٩، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٢/ ٧٢).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٢/ ٤١٥)، و "فتح المغيث" للسخاوي (١/ ١٤٥)، و "موارد الظمآن" للهيثمي (١/ ١٤)، و "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٧)، و "ذخيرة العقبى في شرح المجتبى" لمحمد بن علي بن آدم بن موسى الإثيوبي الوَلَّوِي (٣/ ١٩٣)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٢٢٦)، و "شذرات الذهب في أخبار من ذهب" لابن عماد العَكري (٣/ ٢٥٤)، و "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (٢/ ٣٢٢)، و "طبقات الحنابلة" (١/ ٢٧٥)، و "تهذيب الكمال" للقضاعي (٢٤/ ٤٤٢)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٩/ ٤٩)، و "مقدمة ابن صلاح" ص٨٥، وفي "أسماء مَن روى عنهم البخاري" (٤ أ)، و "شروط الأئمة الخمسة" للحازمي ص٦٢، ٦٣.

(٣) "فتح الباري" لابن حجر (١/ ٤٨٩)، و "عمدة القاري" لبدر الدين العيني (١/ ٥)، و "إرشاد الساري لشرح صحيح =

رَكْعَتَيْنِ لكل حَدِيث قبل أَن أثْبته»[(١)].

واته: سەرەتای دانانی «أنه ابتدأ تصنيفه وترتيبه»[(٢)] لە مەککە دەستی پێ کرووە، هیچ فەرموودەیەکی نەکردووەتە ناوی بێجگە لەدوای دووعای (ئیستیخارە) و دوو ڕکات نوێژ و دڵنیابوونی تەواو لە پلەی (صحیح)ی فەرموودەکە نەبێت.

وە ئیمامی (مسلم) ﷺ دەڵێت: «صَنَّفْتُ هَذَا الْمُسْنَدَ الصَّحِيحَ مِنْ ثَلَاثِمِائَةِ أَلْفِ حَدِيثٍ مَسْمُوعَةٍ»[(٣)]، وَقَالَ: «لَيْسَ كُلُّ شَيْءٍ عِنْدِي صَحِيحٍ وَضَعْتُهُ هَا هُنَا إِنَّمَا وَضَعْتُ هَا هُنَا مَا أَجْمَعُوا عَلَيْهِ»[(٤)].

وَقَالَ (أَحْمَدُ بْنُ سَلَمَة) ﷺ: «كُنْتُ مَعَ مُسْلِمٍ فِي تَأْلِيفِ صَحِيْحِهِ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَة، وَهُوَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفَ حَدِيْث مسموعة»[(٥)].

---

= البخاري" للقسطلاني (١/ ٢٩)، و "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" للهروي (١/ ١٥)، و "التوضيح لشرح الجامع الصحيح" لابن الملقن (١/ ٨١)، و "كوثر المعاني الدراري" للشنقيطي (١/ ١٠٢)، و "تغليق التعليق" لابن حجر (٥/ ٤٢١)، و "روايات ونسخ الجامع الصحيح" لدكتور محمد بن عبد الكريم بن عبيد ص١٧ .

(١) "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" للهروي (١/ ١٥)، و "نيل الأوطار" للشوكاني (١/ ٢١)، و "التَّحبير لإيضَاح مَعَاني التَّيسير" للصنعاني (١/ ٩٨)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٩/ ٤٩)، و "عمدة القاري" لبدر الدين العيني (١/ ٢٢)، و "طبقات السبكي" (٢/ ٢٢١)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (١/ ٧٤)، و "جامع الأصول" لابن الأثير (١/ ١٨٦).

(٢) "تغليق التعليق" لابن حجر (٥/ ٤١٨).

(٣) "شرح النووي على مسلم" (١/ ١٥)، و "عون المعبود" للعظيم آبادي (١١/ ١٩٦)، و "تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي" للسيوطي (١/ ٤٠)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٢٤٧)، و "تاريخ بغداد" (١٣/ ١٠١)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٣٣٨)، و "جامع الأصول" لابن الأثير (١/ ١٨٧، ١٨٨)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢٠/ ١٨٦)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٤٠)، و "شذرات الذهب في أخبار من ذهب" لابن عماد العَكري (٣/ ٢٧٠)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٨/ ٩٢)، و "تذكرة الحفاظ" للذهبي (٢/ ٥٨٩)، و "سير الأعلام" للذهبي (١٢/ ٥٦٥)، و "طبقات الحفاظ" للسيوطي ص٢٦٥، و "ذخيرة العقبى في شرح المجتبى" لمحمد بن علي بن آدم بن موسى الإثيوبي الوَلَّوي (٣٨/ ٣٠٠).

(٤) "صحيح مسلم" (١/ ٣٠٤)، كتاب الصلاة، في الحديث رقم (٦٣).

(٥) "التنوير شرح الجامع الصغير" للصنعاني (١/ ١٦٣)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢٠/ ١٨٦)، و "تأريخ بغداد" (٣/ ١٠٠)، و "تذكرة الحفاظ" للذهبي (٢/ ٥٨٩)، و .

واتە: ئەم (صحيح)ەم لەکۆی سێ سەد هەزار فەرموودە هەڵبژاردووە، هەموو ئەو فەرموودانەی کە (صحيح)ن نەمکردووەتە ناو ئەم نووسراوەوە بێجگە لەوانە نەبێت کە کۆدەنگی زانایانی فەرموودەی لەسەرە، وە ئەم نووسینەش پانزە ساڵی پێ چووە و پێکهاتووە لە دوانزە هەزار فەرموودە بە دووبارەبووەکانەوە.

وە ئیمامی (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «هَذَا الكِتَابُ جَمَعْتُهُ وَانْتَقَيْتُهُ مِنْ أَكْثَر مِنْ سَبْعِمِائَةِ أَلْفٍ وَخَمْسِينَ أَلْفًا»[(١)].

واتە: ئەم (مسند)ەم لە حەوت سەد و پەنجا هەزار فەرموودە بژار کردووە.

قَالَ (أَبُو زُرْعَةَ) رَحِمَهُ اللَّهُ: «كَانَ أَحْمَدُ يَحْفَظُ أَلْفَ أَلْفِ حَدِيثٍ، فَقِيلَ لَهُ: مَا يُدْرِيكَ؟ قَالَ: ذَاكَرْتُهُ فَأَخَذْتُ عَلَيْهِ الْأَبْوَابَ»[(٢)].

واتە: ئیمامی (ئەبو زورعە) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ئیمام (ئەحمەد) هەزار هەزار فەرموودەی لەبەرە، پێیان وت: چۆن دەزانیت؟ وتی: پیاچوونەوەم کردووە و بە بابەت دام ڕشتووە.

ئیمامی (أحمد بن حنبل) رَحِمَهُ اللَّهُ وتی: «وَهَذَا الْفَتى يَعْنِي أَبَا زرْعَة يحفظ سِتّمِائَة ألف حَدِيث»[(٣)].

---

(١) "مقدمة المسند" ص٣٥، و "مصطلح الحديث" للعثيمين ص٥٥، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح (١/ ١٢٣)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١١/ ٣٢٩).

(٢) "مسند الإمام أحمد" (١/ ٤٢)، و "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" للهروي (١/ ٢٣)، و "كوثَر المَعَاني الدَّرَارِي في كَشْفِ خَبَايا صَحِيحْ البُخَاري" للشنقيطي (٦/ ٤٦٧)، و "تاريخ بغداد" للبغدادي (٤/ ٤١٩)، و "تاريخ دمشق" لابن عساكر (٥/ ٢٩٦)، و "المنتظم" لابن الجوزي (١١/ ٢٨٧)، و "البدرُ التمام شرح بلوغ المرام" للمغربي (١/ ٢١)، و "شرح علل الترمذي" لابن رجب الحنبلي (١/ ٤٧٩)، و "تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي" للسوطي (١/ ٤٠)، و "مناقب الإمام أحمد" لابن الجوزي ص٨٥، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (١٨/ ٦٧)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٦)، و "تهذيب التهذيب" (١/ ٧٤)، و "طبقات الحفاظ" للسيوطي ص١٩٠، و "ذخيرة العقبى في شرح المجتبى" لمحمد بن علي بن آدم بن موسى الإثيوبي الوَلَّوِي (١٢/ ٣٦٤).

(٣) "شرح علل الترمذي" لابن رجب الحنبلي (١/ ٤٩٢)، و "النكت على مقدمة ابن الصلاح" للزركشي (١/ ١٨٤)، و "السنة ومكانتها" للسباعي (١/ ٢٩٥)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢٠/ ١٢٧)، و "تاريخ بغداد" للبغدادي (١٠/ ٣٣٢)، و "صفة الصفوة" لابن الجوزي (٤/ ٨٨)، و "المنتظم" لابن الجوزي (٥/ ٤٧)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ٢٠١).

واته: (ئەبو زورعه) شەش سەد هەزار فەرموودەی لەبەرە.

«وَكَانَ أَحْمَدَ يُعَظِّمُ أَبَا زُرْعَةَ، وَإِذَا جَالَسَهُ تَرَكَ أَحْمَد نَوَافِلَهُ وَاشْتَغَلَّ عَنْهَا بِمَذَاكِرَةِ أَبِي زُرْعَة»[(١)].

واته: ئیمام (ئەحمەد) رحمه الله زۆر ڕێزی لە (ئەبو زورعەی ڕازی) دەگرت، هەرجارێك بهاتایه بۆ لای وازی لە نوێژە سوننەتەکان دەهێنا و سەرقاڵ دەبوو بە پیاچوونەوەی فەرموودە لەگەڵ (ئەبو زورعە)دا رحمه الله.

وَقَالَ (أَبُو زُرْعَةَ) رحمه الله: «مَا فِي بَيْتِي سَوَادٌ عَلَى بَيَاضٍ إِلَّا وَأَحْفَظُهُ»[(٢)].

واته: (ئەبو زورعە) رحمه الله دەڵێت: لە ماڵەکەمدا ڕەشایی نییە لەسەر سپی هەرهەموویم لەبەرە.

وَقَالَ الحَافِظُ (أَبُو أَحْمَدَ بنُ عَدِيٍّ) رحمه الله : سَمِعْتُ أَبِي يَقُوْلُ: كُنْتُ بِالرَّيِّ، وَأَنَا غُلاَمٌ فِي البَزَّازِيْنَ: «فَحَلَفَ رَجُلٌ بِطَلاَقِ امرَأَتِهِ: أَنَّ أَبَا زُرْعَةَ يَحْفَظُ مائَةَ أَلْفِ حَدِيْثٍ، فَذَهَبَ قَوْمٌ - أَنَا فِيهِم - إِلَى أَبِي زُرْعَةَ، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: مَا حَمَلَهُ عَلَى الحَلْفِ بِالطَّلاَقِ؟ قِيْلَ: قَدْ جَرَى الآنَ مِنْهُ ذَلِكَ، فَقَالَ أَبُو زُرْعَةَ: لِيُمْسِكِ امْرَأَتَهُ، فَإِنَّهَا لَمْ تَطْلُقْ عَلَيْهِ»، ثمَّ قَالَ أَبُو زرْعَة: «أحفظ مِائَتي ألف حَدِيث كَمَا يحفظ الْإِنْسَان [قل هُوَ الله أحد]»[(٣)].

واته: پیاوێك لە سەردەمی (ئەبو زورعە)دا تەڵاقی خوارد کە (ئەبو زورعە) رحمه الله سەد هەزار فەرموودەی لەبەرە، لەم بارەیەوە پرسیار کرا لە (ئەبو زورعە)، وتی: تەڵاقی نەکەوتووە و خێزانیەتی، پاشان وتی: دوو سەد هەزار فەرموودەم لەبەرە هەروەکوو چۆن کەسێك ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی لەبەرە.

---

(١) "شرح علل الترمذي" لابن رجب الحنبلي (١/ ٤٩٢).

(٢) "الجامع لأخلاق الراوي" للبغدادي (٢/ ١٧٧)، و "علوم الحديث ومصطلحه" لدكتور صبحي إبراهيم الصالح (١/ ٧٨).

(٣) "شرح علل الترمذي" لابن رجب الحنبلي (١/ ٤٩٢)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤١)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢٠/ ١٢٧)، و "الكامل في ضعفاء الرجال" لابن عدي (١/ ٢٢٨)، و "تأريخ بغداد" للبغدادي (١٢/ ٣٣)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٣٨/ ٢٠)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٣/ ٦٩)، و "النكت على مقدمة ابن الصلاح" للزركشي (١/ ١٨٤)، و "طبقات الشافعية الكبرى" للسبكي (١/ ٦٦).

وَقَالَ (إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْه) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**أَعْرِفُ مَكَانَ مِائَةِ أَلْفِ حَدِيثٍ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهَا**»(١).

**واتە: (ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی) هاوەڵی ئیمام (ئەحمەد) دەڵێت: شوێنی سەد هەزار فەرموودە دەزانم بە لەبەرکردن وەکوو لەبەرچاومدا ببینم.**

وَقَالَ (أَبُو دَاود) رَحِمَهُ اللَّهُ: «**كَتَبْتُ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسَمِائَةِ أَلْفِ حَدِيثٍ، انْتَخَبْتُ مِنْهَا مَا تَضَمَّنَهُ هَذَا الْكِتَابُ، يَعْنِي كِتَابَ "السُّنَنِ"**»(٢).

وَقَالَ: «**أقمت بطرطوس عشرين سنة أكتب المسند، فكتبت أربعة آلاف حديث**»(٣).

**واتە: (ئەبو داود) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: پێنج سەد هەزار فەرموودەم لە پێغەمبەرەوە ﷺ نووسیوە و چوار هەزار فەرموودەم تیادا هەڵبژاردووە ، بە ماوەی بیست ساڵ لە شاری تەرتووسی سوریا، وە**

(١) "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤٣)، و "شرح أبي داود" للعيني (٤/ ١٩٩)، و "التوضيح لشرح الجامع الصحيح" لابن الملقن (٣/ ٦٥٧)، و "البدر المنير" لابن الملقن (١/ ٢٦٠)، و "المطالب العالية" لابن حجر (١/ ٤١٥)، و "الجامع لأخلاق الراوي" للخطيب البغدادي (٢/ ٢٥٤) برقم (١٧٧١)، و "النكت على مقدمة ابن صلاح" للزركشي (١/ ١٨٣)، و "الموسوعة الحديثية بين الواقع والمأمول" لزهير الناصر ص٩، و "علم الجرح والتعديل" لعبد المنعم ص٥٤، و "تأريخ بغداد" للبغدادي (٧/ ٣٦٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٨/ ١٣٨)، و "طبقات الحفاظ" للسيوطي ص١٩٢.

(٢) "كتاب الأربعين المرتبة على طبقات الأربعين" للمقدسي (١/ ٣١١)، و "الأربعون" للبكري (١/ ٦٢)، و "معالم السنن" للخطابي (٤/ ٣٦٥)، و "كشف المشكل من حديث الصحيحين" لابن الجوزي (١/ ٨٥)، و "جامع العلوم والحكم" لابن رجب الحنبلي (١/ ٦٢)، و "طرح التثريب" للعراقي (١/ ٥٨)، و "شرح أبي داود" للعيني (١/ ١٧)، و "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" للملا القاري (١/ ٢٥)، و "نيل الأوطار" للشوكاني (١/ ٢٤)، و "التَّنويرُ شَرْحُ الجَامِع الصَّغِيرِ" للصنعاني (١/ ١٦٤)، و "الإيجاز في شرح سنن أبي داود" للنووي ص٦٧، و "شرح الإلمام بأحاديث الأحكام" لابن دقيق العيد (١/ ٤٢)، و "جامع الأصول" لابن الأثير (١/ ١٩٠)، و "البدر المنير" لابن الملقن (١/ ٢٦٣)، و "الموضوعات" لابن الجوزي (١/ ١١)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ٤١)، و "المنتظم" لابن الجوزي (١٢/ ٢٦٩)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢٠/ ٣٦٠)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٦٤)، و "شذرات الذهب" لابن العماد العَكري (٣/ ٣١٤)، و "تأريخ بغداد" للبغدادي (١٠/ ٧٥)، و "طبقات الحنابلة" لابن أبي يعلى (١/ ١٦١)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٢٢/ ١٩٦)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٢/ ٢٢٦)، و "تهذيب الكمال في أسماء الرجال" للمزي (١/ ١٦٩)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (١٣/ ٢٠٩)، و "طبقات الشافعية الكبرى" للسبكي (٢/ ٢٩٥)، و "طبقات الحفاظ" للسيوطي ص٢٦٦.

(٣) "منهاج المحدثين" لعلي عبد الباسط مزيد ص٣٣٤، و "معالم السنن" للخطابي (٤/ ٣٦٥)، و "تهذيب الأسماء واللغات" للنووي (٢/ ٢٢٦).

نزیکەی «ظل یقرؤه على الناس حوالي أربعين سنة»[١] چل ساڵیش دانیشتووە وتوویەتییەوە.

ئەو ژمارانەی کە لەمەوپێش باس کران و فەرمووودەناسان لەبەریان بووە، دەبێتە شوێنی پرسیار و سەرسامی، کە ئایا ئەوەندە فەرمووودە هەیە؟! (مناظر أحسن الكيلاني) رحمه الله دەڵێت: «ولا يعرف كثير من المتعلمين فضلاً عن العامة أن الذي يُكَوِّن هذا العدد الضخم هو كثرة المتابعات والشواهد التي عني بها المحدثون، فحديث: "إنما الأعمال بالنيات" يروى من سبعمائة طريق فلو جردنا مجاميع الحديث من هذه المتابعات والشواهد لبقي عدد قليل من الأحاديث، وقد صرَّح الحاكم أبو عبد الله الذي يعتبر من المتسامحين المتوسعين أن الأحاديث التي في الدرجة الأولى لا تبلغ عشرة آلاف»[٢].

واتە: زۆری شارەزایان نازانن چ جای خەڵکی، کە ئەو ژمارە زۆرە پێکهاتەیە لە هاوشێوە و لێکچوو و دووبارەبووەکانی فەرمووودە، کە فەرمووودەناسان گرنگییان پێداوە، بۆ زیاتر پاڵپشت و بەهێزکردن و دڵنیابوون لەسەر ڕیوایەتەکان، بۆیە فەرمووودەی «إنما الأعمال بالنيات» لە حەوت سەد ڕێگاوە گێڕدراوەتەوە، ئەگەر کتێبەکانی فەرمووودە دابڕنین لەو زیادە و پاڵپشت و هاوشێوانە؛ وەکوو ئیمامی (الحاكم النيسابوري) دەڵێت: فەرمووودە پلە یەکەکان ناگەنە دە هەزار فەرمووودە.

ئیمامی (الحاكم النيسابوري) رحمه الله دەڵێت: «وَالْأَحَادِيثُ الْمَرْوِيَّةُ بِهَذِهِ الشَّرِيطَةِ لَا يَبْلُغُ عَدَدُهَا عَشْرَةُ آلَافِ حَدِيثٍ»[٣].

واتە: فەرمووودە پلە یەکەکان بەو مەرج و شەرتانە (کە پێشتر باسی کردووە) ناگەنە دە هەزار فەرمووودە.

---

(١) "منهاج المحدثين" لعلي عبد الباسط مزيد ص٣٣٤.

(٢) "تدوين الحديث" للكيلاني، و "القرآن والنبي" رد عبد الحليم محمود عن "تدوين الحديث" ص٣٣٧، و "كتابة السنة" لأحمد بن عمر بن هاشم ص٣٠، و "السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي" لعبد الحليم محمود ص٥٩.

(٣) "المدخل إلى كتاب الإكليل" للحاكم النيسابوري ص٣٣، و "شرح النووي على مسلم" (١/ ٢٧)، و "إكمال المعلم بفوائد مسلم" للقاضي عياض (١/ ٩٠)، و "النكت على مقدمة ابن صلاح" للزركشي (١/ ١٢٥)، و "المقنع في علوم الحديث" لابن الملقن (١/ ٦٨)، و "تدريب الراوي" للسيوطي (١/ ١٠٨)، و "توضيح الأفكار" للصنعاني (١/ ٨٩).

ئەمە لە کاتێکدایە کە ئیمامی (الحاكم) رَحِمَهُ اللَّهُ ناوداره بە ئاسانکار (المتساهل) لە مەرجەکانی فەرمووودەدا، دەبێت لای زانایانی (جرح وتعديل) ڕێژەکە چەند کەمتر بێت؟!

ئەمانە هەمووی نموونەی زیندوون لەپاش (ئەبو هورەیرە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، بۆ بڵاوبوونەوەی فەرمووده و لەبەرکردنی بەهێز لای کەسانی تایبەتی خۆی، کەواتە گومانەکانی سەر (ئەبو هورەیرە) گەر بە ڕاست دابنرێت؛ ئەوا گومان بۆ سەر سوپایەکی وەکوو زانایانی فەرمووده (المحدثين) کە چەند نموونەیەکمان باس کرد؛ دەبێت لەکوێی باوەڕپێکردندا بێت؟!

بەدەر لە بوونی ئەو نموونانەی لەبەرکارانی قورئان (حافظ) لە دونیادا، خۆ ئەگەر گومان بۆ لەبەرکارانی فەرمووده وەکوو (ئەبو هورەیرە) و هاوەڵانی دروست بکرێت؛ ئەوا هەمان گومان شوێنی ڕەچاوکردنە لەسەر لەبەرکارانی قورئان لە سەردەمی هاوەڵاندا، لەگەڵ پێویستیبوون بە فەرمووده بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی لە (قضاء ومحاكم) ڕێگە دینییەکان لە (إمامة وخطابة) تویژینەوە فیقهییەکان ... کە پێویستییەکی سەرەکییان بە هەردوو سەرچاوەکە هەبووە لە (قورئان و فەرمووده)، بۆیە هەموو ڕێکارێکی پێویست گیراوەتە بەر بۆ گەیاندنی قورئان بە هەموو ڕووەکانییەوە، لە خوێندنەوە و تەفسیر و ...، وە فەرموودەش بە هەمان شێوە، تا پێویستییەکانی دونیا و دینی ئەو خەڵکە پڕ بکاتەوە، هەروەکوو ئیمامی (البُخاري) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: «رَوَى عَنْهُ نَحْوٌ مِنْ ثَمَانِمِائَةِ رَجُلٍ أَوْ أَكْثَرُ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ، مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ»[1].

واتە: نزیکەی هەشت سەد پیاو یان زیاتر فەرموودەیان لە (ئەبو هورەیرە)وە وەرگرتووە، لە چینی هاوەڵان و تابعین و بێجگە لەوانیش.

جا دەشێت ئەم هەشت سەد کەسە ناودارانە لە خاوەن زانست و دین؛ بێئاگا بووبێتن لەو جۆرە تێگەیشتن و گومانانەی کە خراوەتە پاڵ (ئەبو هورەیرە) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ و کەسانی سەردەمی خۆی و نزیکی؟!



(١) "تهذيب التهذيب" لابن حجر (١٢/ ٢٦٥)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ٣٤٩)، و "البداية والنهاية" (٨/ ١١١)، و "التكميل" لابن كثير (٤/ ١٥)، و "عشرون حديثا من صحيح البخاري" لعبد المحسن العباد ص٢٤٠، و "السنة في مواجهة الأباطيل" لمحمد طاهر ص١٣٨، و "السنة قبل التدوين" لمحمد عجاج خطيب (١/ ٤٢٩).

# هاوەڵی بەڕێز (مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَان) رَضِيَ اللهُ عَنْهُ

**ناوی:** (معاوية ی کوڕی أبو سفيان کوڕی صخر کوڕی حرب بن أمية کوڕی عبد شمس کوڕی عبد مناف کوڕی قصي کوڕی کلاب)ە، نازناوی (أبو عبد الرحمن القرشي الأموي المكي)یە[١]، لەدایکبوونی بە پێنج ساڵ پێش هاتنی وەحی بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەم مێژووە زیاتر ناودارە بۆ لەدایکبوونی[٢].

پیاوێکی بالآبەرزی سپی جوانی بە هەیبەت بووە، هەر لە منداڵییەوە باوك و دایکی گەورەییەتییەکیان تێدا بینیوە، بۆیە: «نَظَرَ أَبُو سُفْيَانَ يَوْمًا إِلَى مُعَاوِيَةَ وَهُوَ غُلَامٌ فَقَالَ لِهِنْدَ: إِنَّ ابْنِي هَذَا لَعَظِيمُ الرَّأْسِ، وَإِنَّهُ لَخَلِيقٌ أَنْ يَسُودَ قَوْمَهُ، فَقَالَتْ هِنْدُ: قَوْمَهُ فَقَطْ، ثَكِلْتُهُ إِنْ لَمْ يَسُدِ الْعَرَبَ قَاطِبَةً»[٣].

واتە: (ئەبو سوفیان) رضي الله عنه ڕۆژێك سەیری (معاوية)ی کوڕی دەکات و بە (هند)ی خێزانی دەڵێت: ئەم کوڕەی من پێوەی دیارە پیاوێکی کامڵ دەردەچێت و سەرکردەیەك دەردەچێت بۆ قەومەکەی خۆی، (هیند)ی دایکی (معاوية) وتی: تەنها قەومەکەی خۆی و بەس؟! تیاچێت ئەگەر نەبێت بە سەرکردەی هەموو عەرەب.

وە (ئەبانی کوڕی عوسمانی کوڕی عەفان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەیگێڕێتەوە کە: «وَعَنْ أَبَانَ بنِ عُثْمَانَ: كَانَ مُعَاوِيَةُ وَهُوَ غُلاَمٌ يَمْشِي مَعَ أُمِّهِ هِنْدٍ، فَعَثَرَ، فَقَالَتْ: قُمْ، لاَ رَفَعَكَ اللهُ. وَأَعْرَابِيٌّ يَنْظُرُ، فَقَالَ: لِمَ تَقُوْلِيْنَ لَهُ؟ فَوَاللهِ إِنِّيْ لأَظُنُّهُ سَيَسُوْدُ قَوْمَهُ. قَالَتْ: لاَ رَفَعَهُ إِنْ لَمْ يَسُدْ إِلاَّ قَوْمَهُ»[٤].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٣/ ١٢٠).

(٢) "الإصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٦/ ١٥١).

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١١٨)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ٦٦)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٥٧).

(٤) رواه ابن عساكر في "تأريخ دمشق" (٥٩/ ٦٥)، والبغوي في "معجم الصحابة" (٢١٨٣)، والذهبي في "سير أعلام النبلاء" (٣/ ١٢١)، وابن حجر في "الإصابة" (٦/ ١٢٠).

واتە: لەسەروو ئەوەوە کە بێدەنگ بین لە ئاستی هاوەڵاندا؛ بەڵام باوەڕیشمان وابێت کە هەریەکە لەو دوو کۆمەڵە خاوەن ئیجتیهاد و لێکدانەوەیەك بوون وەکوو زانایان، دەشێت تیایاندا تاوانبار یان هەڵە یاخود کەمتەرخەم بووبێت لە ئیجتیهادیاندا، بە هۆکاری جۆرێك لە ویستەکانیان، بەڵام گەر تاوانێکی کەم لە چاکەیەکی زۆردا بوو؛ ئەوا هۆکاری لێخۆشبوون و سڕینەوەیە.

## ( معاوية ) ﷺ لە سەردەمی ( حسن بن علي بن أبي طالب ) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

کاتێك خەلیفەی چوارەم (علي بن أبي طالب) ﷺ لەلایەن (عبد الرحمن بن ملجم) شەهید کرا، لە ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا[١]، لەسەر وادەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: «"أَلَا أُحَدِّثُكُمَا بِأَشْقَى النَّاسِ رَجُلَيْنِ؟" فَقُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: "أُحَيْمِرُ ثَمُودَ الَّذِي عَقَرَ النَّاقَةَ، وَالَّذِي يَضْرِبُكَ يَا عَلِيُّ عَلَى هَذِهِ - يَعْنِي قَرْنَهُ - حَتَّى تُبَلَّ مِنْهُ هَذِهِ"»[٢].

واتە: خراپترین کەس دوو کەسن، ئەو کەسەی کە حوشترەکەی (صالح)ی سەربڕی، وە ئەو کەسەی ئەی (عەلی) لێرەت (سەرت) دەدات تا ئێرەت (ڕیشت) تەڕ و خوێناوی دەبێت.

ئیمامی (عەلی) ﷺ پێش ئەوەی وەفات بکات داوایان لێکرد کە کەسێك لە شوێنی خۆی دابنێت، ئەویش وتی: «لَا، وَلَكِنِ أَتْرُكُكُمْ إِلَى مَا تَرَكَكُمْ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " قَالُوا: فَمَا تَقُولُ لِرَبِّكَ إِذَا أَتَيْتَهُ؟ - وَقَالَ وَكِيعٌ مَرَّةً: إِذَا لَقِيتَهُ؟ - قَالَ: " أَقُولُ: اللهُمَّ تَرَكْتَنِي فِيهِمْ مَا بَدَا لَكَ، ثُمَّ قَبَضْتَنِي إِلَيْكَ وَأَنْتَ فِيهِمْ، فَإِنْ شِئْتَ أَصْلَحْتَهُمْ وَإِنْ شِئْتَ أَفْسَدْتَهُمْ»[٣].

---

(١) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٢/ ٥٣٧)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٨).

(٢) رواه النسائي في "الكبرى" (٨٤٨٥)، وأحمد في "المسند" (١٨٣٢١)، وقال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، وفي "فضائل الصحابة" (١١٧٢)، ورواه الحاكم في "المستدرك" (٤٦٧٩) وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، ووافقه الذهبي، ورواه الطبراني في "الكبير" (٧٣١١)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٨١١)، والدولابي في "الكنى والأسماء" (٢٠٦٢)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٧٤٣)، و "صحيح الجامع الصغير" (٢٥٨٩).

(٣) رواه أحمد في "المسند" (١٠٧٨)، وقال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره، وأبو يعلى في "مسنده" (٥٩٠)، وابن أبي شيبة في "المصنف" (٣٧٠٩٨)، والبيهقي في "القضاء والقدر" (٤٧٤)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢/ ٥٥٢)، اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (١٢٠٩)، وأبو بكر بن الخلال في "السنة" (٣٣٢)، والضياء في "المختارة" (٥٩٥).

واتە: نەخێر، بەڵکوو بەجێتان دەهێڵم بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێی هێشتین، وتیان: ئەی چی دەڵێیت بە خوای خۆت کە دەیگەیتێ؟ وتی: دەڵێم: خوایە چەندە ویستت منت هێشتەوە تیایاندا، پاشان منت بردەوە لای خۆت، گەر ویستت لێیبێت پاش من چاکیان دەکەیت، وە گەر ویستت لێبێت تێکیان دەدەیت.

پاش وەفاتی ئیمامی (عەلی) ﷺ، (حسن)ی کوڕیان هەڵبژارد و یەکەم کەس (قیس بن سعد) پەیمانی پێدا[١].

وە (حسن کوڕی عەلی)ش ﷺ مەرجی دانا لەسەر خەڵکی (عێراق) لە کاتی پەیمانپێداندا، وتی: «وَاللهِ لَا أُبَايِعُكُمْ إِلَّا عَلَى مَا أَقُولُ لَكُمْ»، قَالُوا: مَا هِيَ؟ قَالَ: «تُسَالِمُونَ مَنْ سَالَمْتُ، وَتُحَارِبُونَ مَنْ حَارَبْتُ»[٢].

واتە: سوێند بە خوا پەیمانتان لێ وەرناگرم تاوەکوو ئەوەی کە پێتان دەڵێم جێبەجێ نەبێت، وتیان: چییە؟ وتی: لەگەڵ هەرکەسێك ڕێککەوتم دەبێت ڕێکبکەون، وە لەگەڵ هەرکەسێك شەڕم کرد دەبێت شەڕ بکەن.

بەم شێوەیە (حسن بن علي بن أبي طالب) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا بووە خەلیفەیەکی شەرعی بەسەر حیجاز و عێراق و یەمەنەوە.

ئەم خەلیفایەتییەی ئیمامی (حسن) شەش مانگ بەردەوام بوو، پاشان دابەزی بۆ (معاوية) ﷺ بۆ کۆتاییهاتن بە خوێنڕشتنی نێوان موسوڵمانان، بەم شەش مانگە ئەو سی ساڵەی وادەی پێغەمبەر ﷺ پڕ بووەوە کە فەرمووی: «الْخِلَافَةُ بَعْدِي فِي أُمَّتِي ثَلَاثُونَ سَنَةً»[٣].

واتە: خەلافەت لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی لەپاش من سی ساڵ دەخایەنێت.

---

(١) "تأريخ الطبري" (٦/ ٧٧).

(٢) رواه الحاكم في "المستدرك" (٣/ ١٩٠) برقم (٤٨٠٥)، وابن سعد في "الطبقات" (١/ ٢٨٦)، وفي "تأريخ الطبري" (٢/ ٧٧)، و "الكامل في التأريخ" لابن الأثير (٢/ ٧٥١)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٣/ ٢٦٣)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٤/ ٣٤٠).

(٣) رواه مسلم (١٨٢١)، والترمذي (٢٢٢٦)، وابن حبان في "صحيحه" (٦٩٤٣)، والبزار في "المسند" (٣٨٢٨)، والطبراني في "الكبير" (٦٤٤٢)، والبيهقي في "الاعتقاد" ص٣٣٣، وابن بطة في "الإبانة" (٨/ ٢٠٥)، والآجري في "الشريعة" (٤/ ١٧٥٩)، وابن عبد البر في "الجامع" (٢٣١٣).

قَالَ (ابن كثير) رحمه الله: «إِنَّمَا كَمَلَتِ الثَّلَاثُونَ بِخِلَافَةِ الْحَسَنِ بن علي، فَإِنَّهُ نَزَلَ عَنِ الْخِلَافَةِ لِمُعَاوِيَةَ فِي رَبِيعٍ الْأَوَّلِ مِنْ سَنَةِ إِحْدَى وَأَرْبَعِينَ، وَذَلِكَ كَمَالُ ثَلَاثِينَ سَنَةً مِنْ مَوْتِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنَّهُ تُوُفِّيَ فِي رَبِيعٍ الْأَوَّلِ سَنَةَ إِحْدَى عَشْرَةَ مِنَ الْهِجْرَةِ، وَهَذَا مِنْ دَلَائِلِ النُّبُوَّةِ صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا»[(١)].

واتە: ئەو سی ساڵە تەواو دەبێت بەو شەش مانگەی ئیمامی (حسن)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە مانگی (ربيع الأول)ی ساڵی (١١)ی کۆچی وەفاتی کرد، وە (حسن)یش لە مانگی (ربيع الأول)ی ساڵی (٤١)ی کۆچی خەلافەتی بەخشی بە (معاوية) رضي الله عنه، ئەوە تەواوی سی ساڵەکەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەکوو موعجیزەیەکی پێغەمبەرایەتی هەواڵی داوە.

بەم شێوەیە (حسن بن علي بن أبي طالب) رضي الله عنهما پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدینە، هەروەك ئەم زانایانە ئاماژەیان پێداوە:

- أبو بكر العربي لە "أحكام القرآن" (٤/ ١٧٢).
- القاضي عياض لە "شرح النووي على مسلم" (١٢/ ١٠٢).
- المناوي لە "فيض القدير" (٢/ ٤٠٩).
- ابن حجر الهيثمي لە "الصواعق المحرقة" (٢/ ٣٩٧).
- ابن أبي العز الحنفي لە "شرح العقيدة الطحاوية" ص٥٤٥.

بەو دابەزینەی ئیمامی (حسن) موسوڵمانان بوون بە یەك و کۆتایی بە هەموو ناکۆکییەکان هات و ئەو ساڵە ناو نرا (عام الجماعة)[(٢)]، واتە ساڵی کۆدەنگی و یەکبوون.

---

(١) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٢٨).

(٢) "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٣/ ١٣٧)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ٥)، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٦/ ٢٤٦)، و "تاريخ خليفة بن خياط" ص٢٠٣، و "تأريخ ابن خلدون" (٢/ ٦٥٠)، و "تأريخ الخلفاء" للسيوطي ص١٤٩، و "الاستيعاب" لابن عبد البر (٣/ ١٤١٨)، و "تأريخ بغداد" للخطيب البغدادي (١/ ٥٧٤)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٢٨/ ٣٥)، و "الإصابة" لابن حجر (٦/ ١٢٠)، و "أسد الغابة" لابن الأثير (٥/ ٢٠١).

ئەگەرچی نارەزاییەك لەلایەن عێراقییەكانەوە هەبوو، بە ئیمامی (حسن)یان دەوت (یا مزلة المؤمنین)، واتە: ئەی زەلیلكەری ئیمانداران، ئەویش دەیوت: «كَانَتْ جَمَاجِمُ الْعَرَبِ بِيَدِي، يُسَالِمُونَ مَنْ سَالَمْتُ وَيُحَارِبُونَ مَنْ حَارَبْتُ، فَتَرَكْتُهَا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ»[١].

واتە: جومجومەی هەموو عەرەب لە دەستمدا بوو، لەگەڵ هەركەسێك رێكبكەوتمایە رێكدەكەوتن، وە لەگەڵ هەركەسێك شەڕم بكردایە شەڕیان دەكرد، لەبەر خوا وازم لێهێنا.

وە لە وتارەكەیدا فەرمووی: «وَإِنِّي مَا أُحِبُّ أَنَّ لِيَ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْقَالَ حَبَّةِ خَرْدَلٍ يُهَرَاقُ فِيهِ مِلْءُ مِحْجَمَةٍ مِنْ دَمٍ إِذْ عَلِمْتُ مَا يَنْفَعُنِي مِمَّا يَضُرُّنِي، وَإِنِّي لَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ فَالْحَقُوا بِطِيبَتِكُمْ»[٢].

واتە: من پێم خۆش نییە گەردیلەیەك بە هێندەی دەنكە گەنمێك لە خوێنی كەس برێژرێت، وە من شارەزام بەوەی كە سوود و زیانی بۆم هەیە، بڕۆن بەلای كاری خۆتانەوە.

وە فەرمووی: «أيها الناس، إني قد أصبحت غير محتمل على مسلم ضغينة، وإني ناظر لكم كنظري لنفسي، وأرى رأيًا فلا تردوا عليَّ رأيي، إن الذي تكرهون من الجماعة أفضل مما تحبون من الفرقة»[٣].

واتە: خەڵكینە من ڕقی هیچ كەسێكم لە دڵدا نییە، وەكوو خۆم سەیری ئێوە دەكەم، لەبەرئەوە بەرپەرچی ڕا و بۆچوونەكەم مەدەنەوە، ئەو پێناخۆشبوونەی هەتانە لە بوون بەیەكدا زۆر باشترە لەو پێناخۆشبوونەتان لە دووبەرەكایەتی.

---

(١) رواه اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٧٩٧)، وأبو نعيم في "الحلية" (٢/ ٣٦)، وفي "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٢٠٦)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (١/ ٣١٩)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٣/ ٢٨٠)، و "تهذيب الكمال" للمزي (٦/ ٢٥٠)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٢/ ٣٩٧)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٤/ ٣٤٣)، و "تهذيب التهذيب" لابن حجر (٢/ ٣٠٠).

(٢) رواه أحمد في "فضائل الصحابة" (١٣٦٤)، و اللالكائي في "شرح أصول اعتقاد" (٢٧٩٨)، و نعيم بن حماد في "الفتن" (٤٥٧).

(٣) "الأخبار الطوال" للدينوري ص٢١٧.

هەرچی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا مابوون هەموویان بەو ڕێککەوتنە ڕازی بوون، وەکوو ئیمامی (الأوزاعي) رحمه الله دەڵێت: «أَدْرَكْتُ خِلَافَةَ مُعَاوِيَةَ عِدَّةٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وسَلَّمَ مِنْهُمْ: سَعْدٌ، وَأُسَامَةُ، وَجَابِرٌ، وَابْنُ عُمَرَ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتَ، وَمَسْلَمَةُ بْنُ مَخْلَدٍ، وَأَبُو سَعِيدٍ، وَرَافِعُ بْنُ خُدَيْجٍ، وَأَبُو أُمَامَةَ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، وَرِجَالٌ أَكْثَرُ مِمَّنْ سَمَّيْتُ بِأَضْعَافٍ مُضَاعَفَةٍ، كَانُوا مَصَابِيحَ الْهُدَى، وَأَوْعِيَةَ الْعِلْمِ، حَضَرُوا مِنَ الْكِتَابِ تَنْزِيلَهُ، وَأَخَذُوا عَنْ رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وسَلَّمَ تَأْوِيلَهُ، وَمِنَ التَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِنْ شَاءَ اللهُّ، مِنْهُمْ: الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بن الأسود بن عبد غوث، وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، وَعَبْدُ اللهَّ بْنُ مُحَيْرِيزٍ فِي أَشْبَاهٍ لَهُمْ، لَمْ يَنْزَعُوا يَدًا عَنْ مُجَامَعَةٍ فِي أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وسَلَّمَ»[(١)].

واتە: هاوەڵانێکی زۆر لە سەردەمی دابەزینی (حسن) بۆ (معاوية) رضي الله عنهما و پەیمانپێدانی لە ژیاندا مابوون، هەر لە (سَعْدٌ، وَأُسَامَةُ، وَجَابِرٌ، وَابْنُ عُمَرَ، ...) وە زۆرتر لەوانیش، کە هەموویان چرای هیدایەت و توێشووی زانست بوون، وە لە شوێنکەوتووانیشدا وەکوو (الْمِسْوَرُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَن، وَسَعِيد، وَعُرْوَة، ...)، یەکێك لەمانە دەستی نەکێشاوەتەوە لەو پەیمانی ڕێککەوتنە.

وە (ابن حزم) رحمه الله دەڵێت: «فبويع الْحسن ثمَّ سلم الْأَمر إِلَى معاوية وَفِي بقايا الصَّحَابَة من هُوَ أفضل مِنْهُمَا بِلَا خلاف مِمَّن أنْفق قبل الْفَتْح وَقَاتل فكلهم أَوَّلهمْ عَن آخِرهم بَايع مُعَاوِيَة وَرَأى إِمَامَته وَهَذَا إِجْمَاع مُتَيَقن بعد إِجْمَاع على جَوَاز إِمَامَة»[(٢)].

واتە: کاتێك پەیمان درا بە (حسن) و کارەکەی ڕادەستی (معاوية) کرد، لەناو هاوەڵاندا زۆر لە هەردووکیان باشتر هەبوو تیایاندا بەبێ جیاوازی لەوانەی لەپێش گرتنەوەی مەککە کۆشش و بەخشینیان لەپێناوی خوادا کردووە، هەرهەموویان لە سەرەتایانەوە تا کۆتاییان پەیمانیان داوە بە (معاوية) و بە پێشەوایان داناوە، ئەم دابەزینەی (حسن ی کوڕی ئیمامی عەلی) ڕەتکردنەوەی شیعەکانە کە بە (معصوم)ی دادەنێن و قسەش بە (معاوية) دەڵێن، بۆیە گەر (حسن) رضي الله عنه ئیمامی (معاوية)ی بە چاك و شیاو نەزانیایە بۆ ئەم کارە ؛ ئەوا دانەدەبەزی بۆی لەلایەن ئیمامێکی

(١) "تأريخ أبي زرعة" ص١٩٠، و "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٤٢)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٥٨).
(٢) "الفصل في الملل والأهواء والنحل" لابن حزم (٤/ ١٢٧).

(معصوم)یانەوە کە کارەکانی هەڵەی تێدا نییە.

وە لەلایەکی تریشەوە پێغەمبەر ﷺ زەمی خەوارجەکانی کردووە، بەڵام بەو شێوەیە باسی ئەم دوو کۆمەڵەی موسوڵمانانی نەکرد، وە مانای ئەوەیە کە لەسەر ئیمان و دیندارین و کارەکەیان ئیجتیهادییە، وە وەسفی (حسن ی کوڕی عەلی) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ی کردووە دانی ناوە بە دابەزینی لەم کارەدا، ئەمانە بۆخۆی هەمووی ئاماژەیە کە لە چوارچێوەی دینیدا کاریان دەکرد.

قَالَ (ابن كثير) رَحِمَهُ اللَّهُ : «وَقَدْ أَخَذَ الْإِمَامُ الْحَبْرُ ابْنُ عَبَّاسٍ مِنْ عُمُومِ هَذِهِ الْآيَةِ الْكَرِيمَةِ وِلَايَةَ مُعَاوِيَةَ السَّلْطَنَةَ، وَأَنَّهُ سَيَمْلِكُ؛ لِأَنَّهُ كَانَ وَلِيَّ عُثْمَانَ، وَقَدْ قُتِلَ عُثْمَانُ مَظْلُومًا، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، ... وَقَدْ رَوَى ذَلِكَ الطَّبَرَانِيُّ فِي مُعْجَمِهِ ... عَنِ زَهْدَم الجَرْمِي قَالَ: كُنَّا فِي سَمَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي مُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا لَيْسَ بِسِرٍّ وَلَا عَلَانِيَةٍ؛ إِنَّهُ لَمَّا كَانَ مِنْ أَمْرِ هَذَا الرَّجُلِ مَا كَانَ -يَعْنِي عُثْمَانَ -قُلْتُ لِعَلِيٍّ: اعْتَزِلْ فَلَوْ كُنْتَ فِي جُحْرٍ طُلِبْتَ حَتَّى تُسْتَخْرَجَ، فَعَصَانِي، وَايْمُ اللهِ لَيَتَأَمَّرَنَّ عَلَيْكُمْ مُعَاوِيَةُ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾﴾ [الإسراء: ٣٣]»[١].

واتە: زانا و پێشەوای ئەم ئومەتە (ابن عباس) لە ئایەتی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴾ ئاماژەی بە دەسەڵاتی (معاوية) کرد ئەو کاتە، لەبەرئەوەی خاوەنی خوێنی خەلیفە (عثمان بن عفان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بووە، ئەویش بە ستەم کوژراوە، وەکوو (الطبراني) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: شەوێك لەلای (ابن عباس) بووین، وتی: من قسەیەکتان بۆ دەکەم، نە شاراوەیە و نە ئاشکرا، کاتێك (عثمان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ئەوەی بەسەرهات بە (علي بن أبي طالب)م وت: دوورکەوەرەوە لە خەلیفایەتی، گەر لە کونێکیشدا بیت دەرت دەهێنن و بەزۆر دەتکەنە خەلیفە، سوێندبە خوا (معاوية) باڵادەست دەبێت بەسەرتاندا، لەبەر ئەوەی خوا دەفەرموێت: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ﴾، واتە: ئەوەی بە ستەم بکوژرێت ئەوا لێپرسراوەکەی باڵادەستە و زیادەڕەوی

(١) "تفسير القرآن العظيم" (٥/ ٧٣) في تفسير سورة [الإسراء: آية: ٣٣].

مەکەن لە کوشتندا.

مەبەستی (ابن عباس) ئەوە بوو کە مادام ئێوە بکوژەکانی ناکوژنەوە، "لەبەر ئەوەی ئیمامی (عەلی) ﷺ دەیوت: با دواکەویت تا وولات هێور دەبێتەوە"، ئەوا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا﴾، واتە: وەلی ئەمرەکەی بالادەست دەکەین، ئەویش (معاوية)یە سەردەکەوێت و دەسەلات دەگرێتە دەست، ئەوەبوو تەفسیرەکەی (ابن عباس) هاتە دی و ئیمامی (معاوية) ﷺ بە حەقەکەی کە نەسەندرایەوە بالادەست بوو، بە لێکدانەوەی وشەی ﴿سُلْطَٰنًا﴾ لە ئایەتەکەدا.

وە لە دادوەری خۆیشی ئەم ڕاستییەشی دان پیا دەنا، وەك لە وتارێکیدا (معاوية) ﷺ وتی: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، وَاللَّهِ مَا أَنَا بِخَيْرِكُمْ، وَإِنَّ بَيْنَكُمْ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو، وَغَيْرُهُمَا مِنَ الْأَفَاضِلِ، وَلَكِنْ عَسَى أَنْ أَكُونَ أَنْفَعَكُمْ لَكُمْ وِلَايَةً وَأَنْكَاكُمْ فِي عَدُوِّكُمْ وَأَدَرَّكُمْ حَلْبًا»[(١)].

واتە: خەڵکینە، من باشترین کەستان نیم، بەڵکوو لە من باشترتان تێدایە، وەکوو (عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو) و بێجگە لەو دوانەش لە چاکەکان، بەلام ڕەنگە من باشتر بم بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کارە، وە باشترین کەستان بم بۆ لێدانی دوژمنتان و شارەزاترینتان بم لە کۆکردنەوەدا.

بۆیە (عبد الله ی کوڕی عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وەسفی (معاوية) دەکات بە سەرکەوتوویی لەم کارەدا بە وتەیەك کە دەڵێت: «قَدْ عَلِمْتُ بِمَ غَلَبَ مُعَاوِيَةُ النَّاسَ، كَانُوا إِذَا طَارُوا وَقَع، وَإِذَا وَقَعَ طَارُوا»[(٢)].

واتە: دەزانم (معاوية) بە چی بالادەست بوو بەسەر خەڵکدا، ئەگەر خەڵك بفڕیایە ئەو دەنیشتەوە، وە ئەگەر بنیشتایەتەوە خەڵك دەفڕی.

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٥٠٧)، وفي "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٤٣)، و "تأريخ دمشق لابن عساكر" (٥٩/ ١٦٣).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٤٥)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٨٧).

وَعَن قبيصة بن جابر قَالَ: «صَحِبْتُ مُعَاوِيَة، فَمَا رَأَيْتُ رَجُلًا أَثْقَلَ حِلْمًا، وَلَا أَبْطَأَ جَهْلًا، وَلَا أَبْعَدَ أناةً مِنْهُ»[١].

واته: هاوەڵی (معاوية)م کردووە، نەمبینیوە هیچ پیاوێك لەو قورستر و زیاتر لەسەرخۆ بێت و کەمترین نەزانین و هەڵەی هەبێت و خاوەنی دوورترین هێمنی بێت.

وە خۆیشی دەڵێت: «إِنِّي لَأَسْتَحْيِي أَنْ يَكُونَ جُرْمُ رَجُلٍ أَعْظَمَ مِنْ حِلْمِي»[٢].

واته: من شەرم دەکەم هەڵەی کەسێك لە لەسەرخۆیی و خۆڕاگری من زیاتر بێت.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاس رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا: «مَا رَأَيْتُ رَجُلًا كَانَ أَخْلَقَ لِلْمُلْكِ مِنْ مُعَاوِيَةَ»[٣].

واته: کەسم نەبینیوە لە (معاوية) شایستەتر بێت بە دەسەڵات.

## جیهاد و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەسەر دەستی ( معاوية ) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ

دوای ئارامبوونەوەی جیهانی ئیسلامی و باڵادەستی (معاوية) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ بەسەر حیجاز و یەمەن و عێراق و میسرِ و شامدا، کردنەوە (فتوحات)ەکانی (معاوية) رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ بە جیهانی ئەو سەردەمەدا بڵاوبووەوە و شکۆ و هێزی دەوڵەتی ئیسلامی لە برەودان و بڵاوبوونەوەدا بوو، بۆیە لە سەردەمی (معاوية)دا رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ ئەم شوێنانە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانان و ئیسلامیان تێدا بڵاوبووەوە:

١. قسطنطينية وقبرص و دروستکردنی ئوستوولی دەریایی.

٢. بەشی سەرووی ئەفریقیا و مەغریب و دروستکردنی قەیرەوان لە مەغریب، لە ڕۆژهەڵاتی

---

(١) رواه ابن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٥٠٩)، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ٣١٥)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٣/ ١٥٣)، و "تأريخ الخلفاء" للسيوطي ص١٤٩، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (١٩/ ١٨٣).

(٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٤٤٠)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٧٩).

(٣) "جامع معمر بن راشد" (٢٠٩٨٥)، و "الأمالي في آثار الصحابة" لعبدالرزاق (٩٧)، و "الآحاد والمثاني" لابن أبي عاصم (٥١٠)، و "السنة" لأبي بكر بن خلال (٦٧٧)، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٤٦)، و "التأريخ الكبير" للبخاري (٧/ ٣٢٧)، و "معجم الصحابة" للبغوي (٥/ ٣٧٣)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٧٥)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٣/ ١٥٣)، و تأريخ الإسلام (٤/ ٣١٣).

جیهانی ئیسلامی.

**٣.** خوراسان و سجستان.

**٤.** سندو (ما وراء النهر)[(١)].

وەكوو (أبي زرعة الدمشقي) رحمه الله دەڵێت: «لَمَّا قُتِلَ عُثْمَانُ، وَاخْتَلَفَ النَّاسُ، لَمْ تَكُنْ لِلنَّاسِ غَازِيَةٌ، وَلَا صَائِفَةٌ، حَتَّى اجْتَمَعَتِ الْأُمَّةُ عَلَى مُعَاوِيَةَ»[(٢)].

واتە: كاتێك خەلیفە (عثمان) رضي الله عنه شەهید كرا و جیاوازی كەوتە نێوان خەڵكەوە، هیچ (فتوحات) و جیهادێك نەما، تاوەكوو هەموو خەڵك كۆبوونەوە لەسەردەمی (معاوية) رضي الله عنه.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًاۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔاۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾ [النُّور: ٥٥].

(ابن تيمية) رحمه الله دەڵێت: «يُسْتَدَلُّ بِهِ عَلَى أَنَّ الْمُسْتَخْلَفِينَ مُؤْمِنُونَ عَمِلُوا الصَّالِحَاتِ؛ لِأَنَّ الْوَعْدَ لَهُمْ لَا لِغَيْرِهِمْ، وَيُسْتَدَلُّ بِهِ عَلَى أَنَّ هَؤُلَاءِ مَغْفُورٌ لَهُمْ، وَلَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ؛ لِأَنَّهُمْ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَتَنَاوَلَتْهُمُ الْآيَتَانِ: آيَةُ النُّورِ وَآيَةُ الْفَتْحِ، وَمِنَ الْمَعْلُومِ أَنَّ هَذِهِ النُّعُوتَ مُنْطَبِقَةٌ عَلَى الصَّحَابَةِ عَلَى زَمَنِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، فَإِنَّهُ إِذْ ذَاكَ حَصَلَ الِاسْتِخْلَافُ، وَتَمَكَّنَ الدِّينُ وَالْأَمْنُ بَعْدَ الْخَوْفِ، لَمَّا قَهَرُوا فَارِسَ وَالرُّومَ، وَفَتَحُوا الشَّامَ وَالْعِرَاقَ وَمِصْرَ وَخُرَاسَانَ وَإِفْرِيقِيَّةَ، وَلَمَّا قُتِلَ عُثْمَانُ وَحَصَلَتِ الْفِتْنَةُ لَمْ يَفْتَحُوا شَيْئًا مِنْ بِلَادِ الْكُفَّارِ، بَلْ طَمِعَ فِيهِمُ الْكُفَّارُ بِالشَّامِ وَخُرَاسَانَ، وَكَانَ بَعْضُهُمْ يَخَافُ بَعْضًا، وَحِينَئِذٍ فَقَدَ دَلَّ الْقُرْآنُ عَلَى إِيمَانِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُمْ فِي زَمَنِ الِاسْتِخْلَافِ وَالتَّمْكِينِ وَالْأَمْنِ، وَالَّذِينَ كَانُوا فِي زَمَنِ

---

(١) "معاوية بن أبي سفيان" لعلي الصلابي ص٣٨٣، ٤٤٤.

(٢) "تأريخ أبي زرعة الدمشقي" ص١٨٨، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٥٩)، و "مرويات خلافة معاوية" ص٣١٠، و "معاوية بن أبي سفيان" لعلي الصلابي ص٤٤٦.

الِاسْتِخْلَافِ وَالتَّمْكِينِ وَالْأَمْنِ، وَأَدْرَكُوا زَمَنَ الْفِتْنَةِ، كَعَلِيٍّ وَطَلْحَةَ وَالزُّبَيْرِ وَأَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ وَمُعَاوِيَةَ وَعَمْرِو بْنِ الْعَاصِ دَخَلُوا فِي الْآيَةِ؛ لِأَنَّهُمُ اسْتُخْلِفُوا وَمُكِّنُوا وَأَمِنُوا»[(١)].

واتە: ئەم ئایەتە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەو خەلیفانە کە ئیماندارن و کاری چاکیان کردووە و پاداشتیان هەیە و مایەی لێخۆشبوونیانە، ئەم وەسفانە ئاشکرایە کە جێبەجێ دەکرێت لەسەر هەرچوار خەلیفە ڕاشیدینەکە، کە لە سەردەمیاندا خەڵك و دەوڵەت بالآدەست و ئەمین و ئەمان بووە و سەرکەوتوون بەسەر زلهێزەکانی وەکوو ڕۆم و فارسەکان ... وە سەردەمی بالآدەستی (علي وطلحة والزبير وأبي موسى الأشعري ومعاوية وعمرو بن العاص) هەموویان دەچنە ژێر وادەی ئەم ئایەتەوە، لەبەرئەوەی بالآدەست بوون و خەڵکی و دەوڵەت لە ئەمینی و ئەمانەتدا بوون.

بەم شێوەیە (معاویة) ﷺ دەوڵەتی ئیسلامی برد بەڕێوە، وەکوو (السیوطي) ﷺ دەڵێت: «فأقام أميرًا عشرين سنة، وخليفة عشرين سنة»[(٢)].

واتە: بیست ساڵ ئەمیری شام بوو، وە بیست ساڵیش خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

وە لە ساڵی (٦٠)ی کۆچیدا نەخۆش کەوت و لە کۆتا وتاریدا فەرمووی: «أَيُّهَا النَّاس! إِنَّ مِنْ زَرْعٍ قَدِ اسْتَحْصَدَ، وَإِنِّي قَدْ وَلِيتُكُمْ وَلَنْ يليكم أَحَد بَعْدِي خَيْر مني، وَإِنَّمَا يليكم مَنْ هُوَ شَرٌّ مِنِّي، كَمَا كَانَ مَنْ وَلِيَكُمْ قَبْلِي خَيْرًا مِنِّي، وَيَا يَزِيدُ إِذَا دنا أَجْلِي فَوَلِّ غُسْلِي رَجُلًا لَبِيبًا، فَإِنَّ اللَّبِيبَ مِنَ اللَّهِ بِمَكَانٍ، فَلْيُنْعِمِ الْغُسْلَ وَلْيَجْهَرْ بِالتَّكْبِيرِ، ثُمَّ اعْمِدْ إِلَى مَنْدِيلٍ فِي الْخِزَانَةِ فِيهِ ثَوْبٌ مِنْ ثِيَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقُرَاضَةٌ مِنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ، فَاسْتَوْدِعِ القراضة أنفي وفمي، وأذني وعيني، واجعل ذلك الثوب مما يلي جلدي دون لفافي، وَيَا يَزِيدُ احْفَظْ وَصِيَّةَ اللَّهِ فِي الْوَالِدَيْنِ، فَإِذَا أَدْرَجْتُمُونِي فِي جَرِيدَتِي وَوَضَعْتُمُونِي فِي حُفْرَتِي فَخَلُّوا مُعَاوِيَةَ وَأَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ»[(٣)].

(١) "منهاج السنة النبوية" لابن تيمية (٢/ ٣٧،٣٨).
(٢) "تأريخ الخلفاء" للسيوطي ص١٤٩.
(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٥٠)، و"تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ٢١٧).

واتە: ئەی خەڵکینە، من لە کشتوکاڵێکم کە کاتی دروێنەیەتی، وە من بەجێتان دەهێڵم، وە کەسانێك لەدوا من نابێتە کاربەڕێوەبەرتان لە من خراپتر نەبێت، وەکوو چۆن کەسانی پێش من لە من باشتر بوون، وە گەر کاتی وەفاتم هات، با کەسێك بمشوات کە زۆر عاقڵ بێت، ئەو کەسانە لای خوا تایبەتمەندن، پاشان لە شوێنی هەڵگرتنی شتومەکەکاندا پارچەیەك لە جل و بەرگی پێغەمبەر ﷺ هەیە، وە چەند تاڵە موویك و نینۆکێکی، مووەکانی بخەنە چاو و لووت و دەم و گوێمەوە، وە جلەکانیشی بە لاشەمەوە بپێچن، وە گەر منتان خستە ناو کفنەکەوە و ناشتتانم لە گۆڕەکەدا؛ واز لە (معاوية) و خوای پەروەردگار بێنن کە (أرحم الراحمين)ە.

پاشان وەسیەتی کرد کە: «أَوْصَى بِنصْفِ مَالِهِ أَنْ يُرَدَّ إِلَى بَيْتِ الْمَالِ، كَأَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يُطَيَّبَ لَهُ؛ لِأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَاسَمَ عُمَّالَهُ»[١].

واتە: وەسیەتی بە نیوەی ماڵەکەی کرد کە بیگێڕنەوە بۆ ماڵی موسوڵمانان، لەسەر کاری ئیمامی (عومەر) ﵁ کە لەگەڵ ئەمیرەکانیدا دەیکرد.

وە لە کۆتایی تەمەنیدا زۆر سەرمای دەبوو، دەیوت: «تَبًّا لَكِ مِنْ دَارٍ، مَلَكْتُكِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، عِشْرِينَ أَمِيرًا، وَعِشْرِينَ خَلِيفَةً، ثُمَّ هَذَا حَالِي فِيكِ، وَمَصِيرِي مِنْكِ، تَبًّا لِلدُّنْيَا وَلِمُحِبِّيهَا»[٢].

واتە: هەی تیا بچیت چ دونیایەکی، چل ساڵە من تۆ دەبەم بەڕێوە، بیست ساڵ بە ئەمیرایەتی و بیست ساڵیش بە خەلیفایەتی، کەچی ئەمە حاڵی منە لە تۆدا و کۆتاییمە، تیاچێت دونیا و خۆشەویستانی.

وە دەیوت: «يَا لَيْتَنِي كُنْتُ رَجُلًا مِنْ قُرَيْشٍ بِذِي طَوًى، وَلَمْ أَلِ مِنْ هَذَا الْأَمْرِ شَيْئًا»[٣].

واتە: خۆزگایە کەسێك بوومایە لە قوڕەیشییەکان لە ناوچەی (ذي طوى) چواردەوری مەککە و ئەم بەرپرسیاریەتییەم نەگرتایەتە ئەستۆ.

کاتی سەرەمەرگی هات: «يَضَعُ خَدًّا عَلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ يُقَلِّبُ وَجْهَهُ، وَيَضَعُ الْخَدَّ الْآخَرَ، وَيَبْكِي وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ قُلْتَ فِي كِتَابِكَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن

---

(١) (٢) "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٤٥٥).

(٣) "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٤٥٦).

يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ [النساء: ٤٨]. اللَّهُمَّ فَاجْعَلْنِي مِمَّنْ تَشَاءُ أَنْ تَغْفِرَ لَهُ»[١].

واتە: ڕوومەتی دەخستە سەر زەوی و ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد و دەیوت: خوای گەورە خۆت فەرمووتە لەو کەسانە خۆش نابم کە هاوەڵم بۆ پەیدا دەکەن، وە لەوانیتر خۆش دەبم بە ویستی خۆم، خوای پەروەردگار بمخەرە ڕیزی ئەوانەی کە بە ویستی خۆت لێیان خۆش دەبیت.

وە دەیوت: «اللَّهُمَّ إِنِّي قَدْ أَحْبَبْتُ لِقَاءَكَ فَأَحْبِبْ لِقَائِي»[٢].

واتە: خوایە پێم خۆشە بگەم بە تۆ، تۆش پێتخۆشبێت پێت بگەم.

(ابن حجر) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: «مات معاوية في رجب سنة ستين على الصحيح»[٣].

واتە: لە (رَجَبْ)ی ساڵی (٦٠)ی کۆچیدا وەفاتی کرد.

وە تەمەنی: «وَهُوَ ابن ثمان وسبعين سنة»[٤].

واتە: لە حەفتاوهەشت ساڵیدا وەفاتی کرد.

وە ماوەی خەلیفایەتییەکەی لە مانگی (رَبِيعْ أَوَّلْ)ی ساڵی (٤١)ی کۆچی (حسن ی کوڕی علي) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا خەلیفایەتی پێبەخشی، وە لە ساڵی (٦٠)ی کۆچی وەفاتی کرد، وە بیست ساڵیش ئەمیری شام بوو.

کاتێك هەواڵ گەیشتە (عبد الله بن عباس) رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشتبوون بۆ نانخواردن، وتی ئەو سفرەیە لابەن و پاشان ماوەیەك بێدەنگ بوو، دوای ئەوە وتی: «جبل تزعزع ثم زال بجمعه في البحر. قال القاضي أبو يعلى بعد ما ذكر القصة: اللهم أنت أوسع لمعاوية كنفاً، وأحسن من تجاوز عنه وعنّا»[٥].

---

(١) "البداية والنهاية" لابن كثير (١١/ ٤٥٦).

(٢) "الكامل في التأريخ" لابن الأثير (٣/ ١١٩)، و "تأريخ ابن خلدون" (٣/ ٢٣)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ٢١٦).

(٣) "الاصابة في تمييز الصحابة" لابن حجر (٦/ ١٢٢). (٤) "تأريخ الطبري" (٥/ ٣٢٥).

(٥) "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ٢٣٦)، و "تأريخ ابن خلدون" (٣/ ٢١)، و "معاوية ابن أبي سفيان" لعلي الصلابي ص٥٠٧، و "أخبار الدولة العباسية" ص١٢٣.

واتە: شاخێك بوو جوڵا و بەجارێك هەمووی كەوتە دەریاوە، خوایە فراوانی و بەزەیی تۆ (معاوية) بگرێتەوە، وە بە باشترین شێوە لەو و لە ئێمەش خۆشبیت.

عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَنَامِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرَ جَالِسَاهُ عِنْدَهُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَجَلَسْتُ، فَبَيْنَمَا أَنَا جَالِسٌ إِذْ أُتِيَ بِعَلِيٍّ وَمُعَاوِيَةَ، فَأُدْخِلَا بَيْتًا وَأُجِيفَ الْبَابُ وَأَنَا أَنْظُرُ، فَمَا كَانَ بِأَسْرَعَ مِنْ أَنْ خَرَجَ عَلِيٌّ وَهُوَ يَقُولُ: قُضِيَ لِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ مَا كَانَ بِأَسْرَعَ مِنْ أَنْ خَرَجَ مُعَاوِيَةُ وَهُوَ يَقُولُ: غُفِرَ لِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ»[(١)].

(عومەری كوڕی عبد العزيز) ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە خەومدا، وە (ئەبو بەكر و عومەر)یش دانیشتبوون لە خزمەتیدا، سەلامم لە پێغەمبەری خوا كرد و دانیشتم، كاتێكم زانی لەبەرچاوی ئێمەدا ئیمامی (علي) و (معاوية)یان هێنا، بردنیانە ژوورێكەوە و دەرگایان لەسەر داخستن، من هەر سەیرم دەكرد، لەپڕ (عەلی كوڕی ئەبو تالیب) بە پەلە هاتە دەرەوە و دەیوت: سوێند بە خوای كەعبە هەقەكەی دا بە من خوای گەورە، پاش ئەو زۆر بە پەلە (معاوية) ﵁ هاتە دەرەوە و دەیوت: سوێند بە خوای كەعبە لێم خۆش بوو.

## دانانی (یزید)ی كوڕی لە شوێنی خۆی

ئەم بابەتە بووەتە خاڵی ڕەخنەی گەورە لە (معاوية) ﵁ و هەندێك ڕیوایەت و بابەت بووەتە هۆكاری زیاتر توندكردنی ئەم ڕەخنەیە و زیادەڕەویكردنە سەر (معاوية) ﵁[(٢)]، لەگەڵ ئەوەشدا زۆریان ناڕاست و هەڵبەستراون[(٣)].

قال (ابن كثير) ﵀: «وَقَدْ أَوْرَدَ ابْنُ عَسَاكِرَ أَحَادِيثَ فِي ذَمِّ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ كُلُّهَا مَوْضُوعَةٌ لَا يَصِحُّ شَيْءٌ مِنْهَا، وَأَجْوَدُ مَا وَرَدَ مَا ذَكَرْنَاهُ عَلَى ضَعْفِ أَسَانِيدِهِ وَانْقِطَاعِ بَعْضِهِ وَاللهُ أَعْلَمُ»[(٤)].

---

(١) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ١٣٩)، و "تأريخ دمشق" لابن عساكر (٥٩/ ١٤٠)، و "أسمى المطالب في سيرة أمير المؤمنين علي بن أبي طالب" لعلي الصلابي (٢/ ١٠٣٩)، و "معاوية ابن أبي سفيان" لعلي الصلابي ص١٥٩.

(٢) "الإسلام وأوضاعنا القانونية" لعبد القادر عودة ص١٥٩، و "الخلافة" لمحمد رشيد رضا ص٥٢.

(٣) "معاوية ابن أبي سفيان" لعلي الصلابي ص٤٩٩.

(٤) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ٢٥٤).

واتـە: (ابن عساكر) چی ڕیوایەتی هێناوە لەسەر خراپەی (یەزید) هەمووی هەڵبەستراو و ناڕاستە ... .

بەڵام ئەوەی شوێنی گومانی ڕاست و هەڵسەنگاندنی گونجاو بێت لەگەڵ کەسایەتی (معاوية) ﷺ و مێژووی خزمەتی بۆ ئیسلام و پێکهاتەی جیهانی ئیسلامی ئەو سەردەمە و بێدەنگبوونی ناودارانی هاوەڵانی وەکوو (ابن عمر وأنس ...) و کۆمەڵێك لە تابعین لەسەری ...، وە لەلایەکی تریشەوە هەڵسەنگاندنی زانایان و نووسەرانی ناودارانی کۆنی ئیسلام لەسەر ئەم بابەتە؛ باشترین جۆری تێگەیشتن و نزیکبوونەوەیە لە حەق و دوورەپەرێزییە لە زیادەڕەوی و کەمڕەوی تیایدا، بۆیە بە کورتی بۆچوونی ئەو زانایانە دەخەینە ڕوو:

١. قَالَ (ابن خلدون) ﷺ: «والّذي دعا معاوية لإيثار ابنه يزيد بالعهد دون من سواه إنّما هو مراعاة المصلحة في اجتماع النّاس واتّفاق أهوائهم باتّفاق أهل الحلّ والعقد عليه حينئذ من بني أميّة إذ بنو أميّة يومئذ لا يرضون سواهم وهم عصابة قريش وأهل الملّة أجمع وأهل الغلب منهم فآثره بذلك دون غيره ممّن يظنّ أنّه أولى بها وعدل عن الفاضل إلى المفضول حرصا على الاتّفاق واجتماع الأهواء الّذي شأنه أهمّ عند الشّارع، وإن كان لا يظنّ بمعاوية غير هذا فعدالته وصحبته مانعة من سوى ذلك وحضور أكابر الصّحابة لذلك وسكوتهم عنه دليل على انتفاء الرّيب فيه فليسوا ممّن يأخذهم في الحقّ هوادة وليس معاوية ممّن تأخذه العزّة في قبول الحقّ فإنّهم كلّهم أجلّ من ذلك وعدالتهم مانعة منه»[(١)].

وَقَالَ: «وأمّا من بعدهم من لدن معاوية فكانت العصبيّة قد أشرفت على غايتها من الملك والوازع الدّينيّ قد ضعف واحتيج إلى الوازع السّلطانيّ والعصبانيّ فلو عهد إلى غير من ترتضيه العصبيّة لردّت ذلك العهد وانتفض أمره سريعا وصارت الجماعة إلى الفرقة والاختلاف. سأل رجل عليّا رضي الله عنه: ما بال المسلمين اختلفوا عليك ولم يختلفوا على أبي بكر وعمر؟ فقال: «لأنّ أبا بكر وعمر كانا واليين على مثلي وأنا اليوم وال على مثلك»[(٢)].

---

(١) (٢) "تأريخ ابن خلدون" (١/ ٢٦٣، ٢٦٤).

واتە: ئەوەی کە بووە هۆکاری دانانی (یەزید) بەدەر لەوەی کە کۆدەنگی بۆ دروست بوو؛ خوێندنەوەی سوودمەندییەکانی نێوان خەڵکی بوو لە یەکدەنگی و کۆبوونەوەی (أهل الحل والعقد) بنەماڵەی ئەمەوییەکان بوو لەسەری، کە بنەماڵەی (بنو أمية) ڕازی نەدەبوون بێجگە لە خۆیان، کە پاشماوەی قورەیش بوون و خاوەنی دەسەڵات بوون، هەڵبژاردنی (یەزید) بەسەریاندا لانەدانە لە چاکتر بۆ چاك، بە مەبەستی پاراستنی یەکڕیزییان و درووستنەبوونی دووبەرەکایەتی، کە ئەمە جۆرێکە لە ڕەچاوکراوەکانی شەرع، وە لەوە زیاتر گومان بە (معاوية) ﵁ نابرێت، کە دادوەری و هاوەڵێتی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕێگرە لەوەی مەبەستی لەو زیاتر بووبێت، لەگەڵ ئامادەبوونی پیاوە گەورەکانی ناو هاوەڵان و بێدەنگبوونیان لەسەری، ئەوان و (معاوية)ش کەسانێك نەبوون کە لە ئاستی حەق نکوولّی بکەن و وەری نەگرن، وە ئەوانەش کە لەدوای (معاوية) ﵁ کارگێڕ بوون خۆویستی و دەسەڵات زاڵ بووە بەسەریاندا، لەگەڵ کزبوونی لایەنە دینییەکەیانە، بۆیە ئەگەر کەسێکی بێجگە لە خۆیان هەڵبژێردرایە؛ دەبووە هۆکاری جیاوازی و دووبەرەکایەتی.

وەکوو لە خەلیفە (علي بن أبي طالب)یان ﵁ پرسی: بۆچی خەڵکی لەگەڵ تۆدا جیاوازن، بەڵام لەگەڵ (أبو بكر وعمر)دا ﵄ جیاواز نەبوون؟ ئەویش وتی: لەبەرئەوەی ئەوان خەلیفە بوون بەسەر هاوشێوەی منەوە، بەڵام ئەمڕۆ من خەلیفەم بەسەر هاوشێوەی تۆوە.

وَقَالَ (ابن كثير) ﵀: «وَسِيَّمَا أَوْلَادِ الْمُلُوكِ وَمَعْرِفَتِهِمْ بِالْحُرُوبِ وَتَرْتِيبِ الْمُلْكِ وَالْقِيَامِ بِأُبَّهَتِهِ، وَكَانَ يَظُنُّ أَنَّهُ لَا يَقُومُ أَحَدٌ مِنْ أَبْنَاءِ الصَّحَابَةِ فِي الْمُلْكِ مَقَامَهُ، وَلِهَذَا قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ فِيمَا خَاطَبَهُ بِهِ: إِنِّي خِفْتُ أَنْ أَذَرَ الرَّعِيَّةَ مِنْ بَعْدِي كَالْغَنَمِ الْمَطِيرَةِ لَيْسَ لَهَا رَاعٍ»[1]، وفي رواية الطبري: «إني أرهب أن أدع أمة مُحَمَّد بعدي كالضأن لا راعى لها»[2].

واتە: گومان وابوو کەسێك وەکوو ئەو لە نەوەکانی هاوەڵان هەڵنەستێت بەو کارە، وەکوو (معاوية) ﵁ بە (عبد الله بن عمر)ی وت: من دەترسم خەڵکی لەدوای من وەکوو ڕانە مەڕێکی بێ شوانی لێبێت.

---

(١) "البداية والنهاية" لابن كثير (٨/ ٨٧).

(٢) "تأريخ الطبري" (٥/ ٣٠٤).

قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «فَالْوَاجِبُ فِي كُلِّ وِلَايَةٍ الْأَصْلَحُ بِحَسَبِهَا، فَإِذَا تَعَيَّنَ رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَعْظَمُ أَمَانَةً وَالْآخَرُ أَعْظَمُ قُوَّةً: قُدِّمَ أَنْفَعُهُمَا لِتِلْكَ الْوِلَايَةِ: وَأَقَلُّهُمَا ضرراً فيها: فيقدم فِي إِمَارَةِ الْحُرُوْبِ الرَّجُلُ الْقَوِيُّ الشُّجَاعُ -وَإِنْ كَانَ فِيهِ فُجُورٌ- عَلَى الرَّجُلِ الضَّعِيفِ الْعَاجِزِ، وَإِنْ كَانَ أَمِينًا؛ كَمَا سُئِلَ الْإِمَامُ أَحْمَدُ: عَنْ الرَّجُلَيْنِ يَكُونَانِ أَمِيرَيْنِ فِي الْغَزْوِ، وَأَحَدُهُمَا قَوِيٌّ فَاجِرٌ وَالْآخَرُ صَالِحٌ ضَعِيْفٌ، مَعَ أَيِّهِمَا يغزى؛ فَقَالَ: أَمَّا الْفَاجِرُ الْقَوِيُّ، فَقُوَّتُهُ لِلْمُسْلِمِينَ، وَفُجُورُهُ عَلَى نَفْسِهِ؛ وَأَمَّا الصَّالِحُ الضَّعِيفُ فَصَلَاحُهُ لِنَفْسِهِ وَضَعْفُهُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَيُغْزِي مَعَ الْقَوِيِّ الْفَاجِرِ»[(١)].

واته: لە هەموو کاتێکدا پێویستە باشترین هەڵبژاردن هەبێت بەگوێرەی خۆی، لە ئیمام (أحمد)یان پرسی: گەر دوو کەس هەبوون بۆ سەرکردەی شەڕ، یەکەمیان بەهێزێکی تاوانبار، ئەویتریان پیاو ساڵحێکی لاواز، لەگەڵ کامیان جیهاد بکەین، وتی: بەهێزە تاوانبارەکە، تاوانەکەی بۆ خۆیەتی و بەهێزییەکەی بۆ موسوڵمانانە، بەڵام ساڵح و لاوازەکە ساڵحییەکەی بۆ خۆیەتی و لاوازییەکەی بۆ موسوڵمانانە، بۆیە لەگەڵ بەهێزە تاوانبارەکە جیهاد دەکرێت.

بۆیە بۆ پەیماندان بە (یەزید) هاوەڵی بەڕێز (عبد الله بن عمر) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وتی: «إِنْ كَانَ خَيْرًا رَضِينَا، وَإِنْ كَانَ بَلاءً صَبَرْنَا»[(٢)].

واته: گەر خێر بێت پێی ڕازین، وە گەر شەڕ و بەڵا بێت ئارامی لەسەر دەگرین.

لەمەدا دیارە کە ڕەچاوکردنی سوودمەندی گشتی پارێزراوە.

قَالَ (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ: «افْتَرَقَ النَّاسُ فِي "يَزِيدَ" بْنِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ثَلَاثُ فِرَقٍ: طَرَفَانِ وَوَسَطٌ،فَأَحَدُ الطَّرَفَيْنِ قَالُوا: إنَّهُ كَانَ كَافِرًا مُنَافِقًا ... وَالطَّرَفُ الثَّانِي يَظُنُّونَ أَنَّهُ كَانَ رَجُلًا صَالِحًا وَإِمَامُ عَدْلٌ وَأَنَّهُ كَانَ مِنْ "الصَّحَابَةِ" الَّذِينَ وُلِدُوا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

(١) "السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية" لابن تيمية ص٢٢.

(٢) "مصنف ابن أبي شيبة" (٣٠٥٧٥) بسندٍ صحيح، وفي "السنن الواردة في الفتن" للداني (١٤٥)، و "تأريخ خليفة بن خياط" ص٢١٧، و "تأريخ أبي زرعة" ص٢٣٠، و "تأريخ الإسلام" للذهبي (٤/ ١٥٠)، و "تأريخ الخلفاء" للذهبي ص١٥٠، و "الطبقات الكبرى" لابن سعد (٤/١٣٨)، و "سير أعلام النبلاء" للذهبي (٤/ ٣١٥)، و "لسان الميزان" لابن حجر (٦/ ٢٩٤).

وَسَلَّمَ ... وَالْقَوْلُ الثَّالِثُ: أَنَّهُ كَانَ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ الْمُسْلِمِينَ لَهُ حَسَنَاتٌ وَسَيِّئَاتٌ وَلَمْ يُولَدْ إلَّا فِي خِلَافَةِ عُثْمَانَ ... وَلَكِنْ جَرَى بِسَبَبِهِ مَا جَرَى مِنْ مَصْرَعِ "الْحُسَيْنِ" وَفِعْلِ مَا فُعِلَ بِأَهْلِ الْحَرَّةِ وَلَمْ يَكُنْ صَاحِبًا وَلَا مِنْ أَوْلِيَاءِ اللهِّ الصَّالِحِينَ وَهَذَا قَوْلُ عَامَّةِ أَهْلِ الْعَقْلِ وَالْعِلْمِ وَالسُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ ... وَفِرْقَةٌ لَا تَسُبُّهُ وَلَا تُحِبُّهُ وَهَذَا هُوَ الْمَنْصُوصُ عَنْ الْإِمَامِ أَحْمَد ... قَالَ: لَا يُذْكَرُ عَنْهُ حَدِيثٌ ... وَقَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ المقدسي لَمَّا سُئِلَ عَنْ يَزِيدَ: فِيمَا بَلَغَنِي لَا يُسَبُّ وَلَا يُحَبُّ ... فَسَأَلَنِي. فِيمَا سَأَلَنِي: مَا تَقُولُونَ فِي يَزِيدَ؟ فَقُلْت: لَا نَسُبُّهُ وَلَا نُحِبُّهُ»[1].

واتە: ڕای خەڵكی لەسەر (یەزید) دەبێتە سێ بەشەوە:

**یەكەمیان:** دەڵێن: بێبڕواو دووڕوو بووە.

**دووەمیان:** گومان دەبەن پیاوێكی ساڵح و ئیمامێكی دادپەروەر بووە و لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەدایك بووە و هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە.

سێیەمیان: دەڵێن: پاشایەك بووە لە پاشاكانی موسوڵمانان، چاكە و خراپەی هەیە و لە سەردەمی خەلیفە (عثمان)دا رضي الله عنه لەدایك بووە، بە هۆكارییەوە چەند ڕووداوێك ڕووی داوە، وەكوو شەهیدبوونی (حسین) و بەسەرهاتی شاری مەدینە و مەككە، نە هاوەڵ و نە ئەولیای خوا بووە، ئەمە قسەی گشت خاوەن ژیری و زانست و پەیوەست بوویەكە بە سوننەت و كۆمەڵی موسوڵمانانەوە، ئەمە ڕای ئیمام (أحمد بن حنبل)ە رحمه الله.

پرسار لە (أبو محمد المقدسي) رحمه الله كرا دەربارەی (یەزید)، وتی: ئەوەی پێم گەیشتووە ئەوەیە كە قسەی پێناوترێت و خۆشیش ناویسترێت.

وە پرساریش لە (ابن تيمية) رحمه الله كراوە، وتوویەتی: قسەی پێ ناوترێت و خۆش ناویسترێت.

  

(١) "مجموع الفتاوى" لابن تيمية (٤/ ٤٨١ – ٤٨٧).

# هەڵە و پێچەوانەییەتییەکانی ڕەخنەگران لە هاوەڵان

پلەوپایەی هاوەڵان و کاملّییان لە دین و دونیادا وەکوو بوونی ڕۆژ وایە لە ئاسماندا، ئەمە بنەمایەکی جێگیرە و کۆدەنگی هەموو خەڵکانی سەردەمی خۆیانی لەسەرە، وەکوو یاسایەکی ئوسولّی دەڵێت: «الْيَقِينُ لَا يَزُولُ بِالشَّكِّ»[١].

واتە: دڵنیاییەکان بە گومان ناڕەوێنەوە.

وە یاسایەکی فیقهیش هەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا بَلَغَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ»[٢].

واتە: گەر ئاو گەیشتە هەردوو قولەپێ پیسی هەڵناگرێت.

کەواتە هەرچییەك دەربارەی هاوەڵان هەیە لە ئادەمیزادییان و ئیجتیهادیان و کاروکردەوەکانیان لە بازنەی بەریبوون و پاکی و دینداری و پێشخستنی ڕەزامەندی خوا دەرناچێت، لەگەڵ ئەمەشدا (معصوم) نین و قابیلی نەپێکاندن و هەڵە و لێتێکچوونن.

کەواتە گومان نییە لەسەر هەڵەتێگەیشتن و کەوتنە پێچەوانەییەتییەوە لە خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی کاری هاوەڵان، بەتایبەت ئەم بابەتە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دادوەری هاوەڵانەوە هەیە، ئەم خاڵانە باشترین ڕوونکردنەوەیە لەسەریان:

یەکەم: زۆری سەرچاوەکانیان لە گێڕانەوەی بەسەرهات و ڕیوایەتەکاندا؛ ئەوانەن کە سەرچاوە نین، وەك کتێبە مێژووییەکان، کە هەموو جۆرە بابەتێکی تێدا تۆمار کراوە بەبێ توێژینەوەی زانستی (تحقيق) لەسەریان، یاخود پەرتووکە ئەدەبی و شیعر و چیرۆکەکانە، وەکوو: (العقد الفريد، الأغاني، الشعراء، حياة الحيوان، ثمار القلوب، مقامات بديع الزمان، ...).

(١) "الأشباه والنظائر" لابن نجيم ص٤٧، و "الفقيه والمتفقه" للخطيب البغدادي (١/ ٥٢٧).

(٢) رواه ابن ماجه (٥١٧) عن ابن عمر، والدارمي في "سننه" (٧٥٨)، والدارقطني في "السنن" (١٧) واللفظ له، والحاكم في "المستدرك" (٤٦٣)، والطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٦٤٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع الصغير" (٤١٦)، وفي "الإرواء" (١٧٢).

یاخود سەرچاوەکانی فیرەقە گومڕاکانە، بەتایبەت ڕافیزە و موعتەزیلە و خەوارج و ...، یاخود نووسراوی (مستشرقين)ە بێبڕواکانن.

یاخود زۆری ڕیوایەتەکان لە پلەی (ضعيف) و (موضوع) دان.

بەڵام پشتگوێخستنی ئایەتە قورئانییەکان و ئەو هەموو فەرمووده (صحيح) و (حسن)انەی کە لەسەر تەزکییەی ئەوانن لە کتێبی (صحيح وجامع ومسانيد ...) یاخود لە (مصنفات)ە متمانەدارەکاندا هەیە، کە هەموویان سەرچاوەی ڕاستەوخۆی تەواون و ئاشناییەکی زۆر دەدەن بەدەستەوە لەو بوارەدا؛ پەراوێز کراون، لەگەڵ ئەوەشدا بەسە بۆ تێگەیشتنی گشتی بابەتەکە، وە بەدەستەوەدانی بنەمایەکی دروست کە بەس بێت لەو بابەتەدا، وە هەر ئەوەندەیش لەسەر تۆیە، نەك بۆ ڕێکخستنی چۆنییەتی و نیەت و وردەکارییەکان بۆیان، کە لەو سەردەمەشدا بەس خۆیان ئاشنا بوون پێی.

دووەم: هەر ئەوانەی کە ڕەخنە لە هاوەڵان دەگرن، بە فیرەق و کەسەکانەوە، دەکەونە وەسفکردن و بەقەدر و بەها ڕاگرتنی خراپەکانی بەرامبەریان، واتە بەرزەکان نزم دەکەنەوە و نزمەکان بەرز دەکەنەوە، کە ئەمەش پێچەوانەی عەقڵ و دەقەکان و (فطرة)ی ئادەمیزادە.

وەکوو خەوارجەکان، هەموو ئەو هاوەڵانەی کە لەگەڵ (عثمان وعلي ومعاوية)دا ﷺ بوون بە تاوانی کەوتنە ناو کوفر و هەڵوەشاندنەوەی ئیمان تۆمەتباریان دەکردن، لەگەڵ بێدەنگبوونیان لەو هەموو دووڕوو و بێبڕوایانەی ئەو سەردەمە و جیهادکردن لەگەڵیان، وەکوو تورك و فارس و بەربەر و ڕۆمەکان ... .

وە ڕافیزەکان هەموو هاوەڵانیان بە هەڵگەڕاوە لە دین تۆمەتبار دەکرد، بێجگە لە حەوت کەسیان نەبێت، کە ئەو حەوت کەسانەیان پلەوپایە نزمتر بوون لەچاو ئەوانەدا کە ڕەخنەیان لێ دەگرتن.

وەك هەڵوێستیان لە باس و بۆنە و حەقپێدانی تایبەت بە شەهیدبوونی (حسين) ﷺ، کە ئەمیر و کاربەدەست نەبوو، بەڵام بە ستەم شەهیدکردنی خەلیفەی گشت موسوڵمانان (عثمان بن عفان) ﷺ کە نەیهێشت خوێنی کەس بڕژێت لەسەر خەلیفایەتی و دەسەڵاتی؛ هەر باسی نییە، وە بگرە باسی شەهیدبوونی باوکیشی کە ئیمامی (علي)یە ﷺ بەو شێوەیە نییە، وە باسی (حسن)ی برا

گەورەشی ﷺ بەو شێوەیە نییە، کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ»، واتە: ئەم کوڕەی من گەورە و بەڕێزە، کە بەو شێوەیە باسی (حسين)ی نەکردووە، وە وەسفی کارەکەی (حسن)یشی کردووە، لەکاتێکدا بۆ ئیمامی (حسين) ﷺ تەنها باسی شەهیدبوونی کردووە.

یاخود قسەوتن بە خەلیفە ڕاشیدەکان و زانایانی ناو هاوەڵان، وە وەسفکردنی (أبو طالب) کە بە بێبڕوایی ڕۆیشت و خوای پەروەردگار ڕێگەی نەدا بە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات، وەکوو دەفەرمویت: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾﴾ [التوبة: ١١٣].

یاخود وەسفی (أبو لؤلؤة المجوسي) بکوژی خەلیفەی دووەم دەکەن، بەڵام قسە بە وەزیر و خەلیفە و هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ (عمر بن الخطاب) ﷺ دەڵێن.

یاخود وەسفی (محمد کوڕی أبو بکر الصديق) دەکەن، کە کەوتە ناو ئاژاوەکانی سەردەمی خەلیفەی سێهەم، بەڵام قسە بە باوکی دەڵێن کە (أبو بکر الصديق)ە ﷺ.

یاخود وەسفی (مالك بن نويرة) دەکەن کە گومانی لەسەرە، بەڵام قسە بە (خالد بن الوليد) ﷺ دەڵێن کە «سَيْفَ اللهِ الْمَسْلُولَ»ە [١].

یاخود موعتەزیلەکان، فەیلەسووفەکانی ڕۆمان و یۆنان بە گەورە و حەکیم و دانا و زانا و پێشەوای خۆیان دەزانن، کە هەموویان ئەستێرەپەرست و بێبڕوا بوون، قسەکانیان و تێڕوانینەکانیان بە یەکلاکەرەوە و بنەما و قابیلنەبوونی هەڵە تیایاندا دەزانن، بەڵام زانا و ناوداران و خەلیفە ڕاشیدەکانی هاوەڵان بە بێئاگا لە بوارە عەقڵییەکان و ووردبینی زانستەکان دەزانن، وە قورئان و فەرموودەکان بە گومان و شوێنی تێڕوانین و پێویست بە تەفسیر و تەئویلی خاترانە دەکات و یەقین و دڵنیابوون نادات بەدەستەوە.

وە ناودارانی گاوور و جوولەکە و بووزا و بتپەرستەکان و بێبڕواکان؛ بە دروستکەری شۆڕش و ڕزگاربوون و چاوڕۆشنی بۆ ئادەمیزاد سەیر دەکەن، بەڵام زانایان و ناودارانی موسوڵمانان لە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامی لەو بوارەدا هەژمار ناکرێن و هەر ناویشیان نییە.

---

(١) "معرفة الصحابة" لأبي نعيم (٢/ ٩٢٦).

سێیەم: نەخوێندنەوەی کردەوە گەورەکانی هاوەڵان، لە کۆچکردن و جیهاد و بەخشینی ماڵ و منداڵ و سەروەت و هەموو تەمەنیان لەپێناوی خوادا، لەگەڵ ئەو هەموو عیبادەت و خواپەرستی و زوهد و دونیا نەویستییەیان.

بەڵام خوێندنەوەی هەڵسوکەوتە سروشتییەکانی ئادەمیزادییان و ئەو کارانەی کە لە ئاستی کەسانی تایبەت و ڕووداوە کتوپڕ و نامۆکاندا ڕوویان داوە، یاخود وورووژاندنی بڕیار و ئیجتیهادە تایبەتییەکانیان، وە نەخوێندنەوەی ئەو هەموو لێپرسراوییە دینییە وردە و دونیاییە ئاڵۆزانە، وەکوو جۆری مامەڵەیان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان و هۆکارەکانی شەهیدبوونی خەلیفەی سێیەم و کێشە ناوخۆییەکانی دوای ئەو ڕووداوە و بەدواداهاتنی دووبەرەکایەتی و جیاوازییەکان، وە فراوانبوونی پانتایی دەوڵەتی ئیسلامی و هاتنەناوەوەی گەلانی تازە بۆ ئەم دینە، بە کۆمەڵێك پاشکۆی دینی و عادات و عورفی تایبەتی، هەژمارنەکردنی ئەمانە وەکوو لە کەشێکی ئارام و فراواندا بووبێتن.

چوارەم: یەکێکی تر لە هەڵەکانی ڕەخنەگران، تەفسیر و شیکردنەوە و بڕیاردانە لەسەر ڕیوایەت و گێڕانەوە پچڕپچڕ و جۆراوجۆرەکان، بە شێوەیەك کە ڕاستی و وردەکارییەکان تیایاندا ون دەبن، ئەمانە هەمووی دەبێتە شیکردنەوە و بڕیاری دوابەدوا و پاشوەختە، بەشێوەی بیستن.

کە بۆخۆی بینین خاوەنی تەواوی شیکردنەوە و بڕیاری دروستە لە بابەتەکاندا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ»[١]، واتە: هەواڵ وەکوو بینین نییە، دەبێت ئەو جیاوازییە خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

هەروەك زانایانی ئیسلام (ابن كثير والذهبي ...) ڕەحمەتی خوایان لێبێت نووسینە مێژووییەکانیان هەموو جۆرە ڕیوایەت و گێڕانەوەیەکی جۆراوجۆر و دژبەیەکیان تێدا تۆمار کردووە، کە پێویستی بە (تحقيق)ی زانستییە، بەڵام توانای بۆکردنی ئەو لێشاوە ڕیوایەتانە نییە.

---

(١) رواه ابن حبان في "صحيحه" (٦٢١٣)، وأحمد في "المسند" (١٨٤٢)، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، والحاكم في "المستدرك" (٣٢٥٠)، والبزار في "المسند" (٥٠٦٢)، والطبراني في "الأوسط" (٢٥)، والبيهقي في "الأسماء والصفات" (١٠٧٣)، والمروزي في "تعظيم قدر الصلاة" (٦٩٨/٢)، والضياء في "المختارة" (١٨٢٨)، وصححه الألباني في "الصحيحة" (١٠٠٨/٦)، و"صحيح الجامع الصغير" (٥٣٧٣).

بەڵام ئەم زانایانە لەگەڵ ئەو نووسینانەشدا بڕیاریان نەداوە لەسەریان، لەبەر هەستکردن بە هۆکار و شوێن و مەبەست و ئاستی ڕاست و دروستی ڕیوایەتەکان، وە خوێندنەوە بۆ بنەمای ناسینی کەسەکان و پێوانەی کارەکان بە ڕێژەی خۆی؛ ئەمانە هۆکاری هەڵوێست وەرنەگرتن و یەکلانەکەرەوە بووە لایان، یاخود بێدەنگی هەڵبژاردن لە بەرپرسیارییەتی دینی و دونیایی.

بەڵام ڕەخنەگران لەسەر بنەمای بیستن لە هەموو جۆرەکانی خەڵك و دەربڕینەکانیان هەڵوێستی یەکلاکەرەوە و بڕیاری دادگایی پێویست نەبوو بە پێداچوونەوە دەردەکەن و هەندێك دەنێرن بۆ بەهەشت و هەندێکیش بۆ دۆزەخ، تەنانەت هەموو ڕووداوە مێژووییەکانی دوای خۆیان دەخەنە ئەستۆیان.

پێنجەم: لە هەمووی هەڵەتر، نیەت و یەکلابوونەوەی پێشوەختە لەسەر کەس و ڕووداوەکانە، یاخود دوژمنکاریەتی بۆ خودی دینەکە، بەڵام بە لێدانی کەسەکان و ناشرینکردنیان، تاوەکوو باوەڕ و متمانە بە دینەکە لاواز بێت لەلای هەڵگرانی.

نووسینی ڕافیزەکان و فیرەقە عەقلانییەکانی وەکوو (موعتەزیلە و قەدەریە ...) و پاشکۆکانیان، لەسەر بنەمای ئەوان ئەم تاقمانەی دوایی دروست بوون لە قادری و بەهائییەکان و دروز و ئیبازییەکان ...، هەر لەسەر بنەماکانی ئەوان ئەوانەی تریش وەکوو ڕۆژهەڵاتناسەکان (مستشرقين) ڕەخنە دەگرن، کە خۆیان لە بنەڕەتدا ڕق و کینەی گاوور و جوولەکەیەتییە بە ئیسلامی دەڕێژن، یاخود کینەی داگیرکەرانی کۆن (الغزو الاستعماري) بەسەر وڵاتانی ئیسلامیدا، کە ئەمە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ لەدەستدانی پێوەرە زانستییەکان و بێلایەنییەتی و توێژینەوەی وورد و هەڵسەنگاندنی تەواوی پڕ لە لێپرسراوێتی کە دەبێتە سەرچاوە و شوێنی گواستنەوە و توێژینەوەی دوای خۆیان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ
وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ
وَللهِ الْحَمْدُ فِي الْأُولَى وَالْآخِرَةِ، وَلَهُ الْفَضْلُ وَالْمِنَّة



تَمَّ بِحَمْدِ اللهِ

# ناوەڕۆك

بـــابـەت | لاپـەڕە